ئاینەکانی سەردەم

(٢)

# ئەفسانەی دیموکراسی

فاضل قەرەداغی

بسم الله الرحمن الرحيم


* ناوی کتێب: ئەفسانەی دیموکراسی
* ناوی نووسەر: فاضل قەرەداغی
* تیراژ: (١٥٠٠) دانە
* ساڵی چاپ ١٩٩٩ز - ١٤١٩ك
* چاپی یەکەم
* لە بڵاوکراوەکانی نووسینگەی تەفسیر/ هەولێر
* چاپخانەی (زانکۆی سەلاحەدین)
* ژمارەی سپاردن (١٩٣)ی ساڵی ١٩٩٨ز

# چەند وتەیەکی دۆستان و نەیارانی دیموکراسیی

حوکمی دیموکراتی قەد نەبووەو قەدیش نابێت. جان جاك رۆسۆ

دیموکراسیی خراپترین شێوەی حکومەتە ئەگەر شێوەکانیتر بخەینە ئەولاوە. ونستون چێرچڵ

هیچ حکومەتێك پێداویستییەکانی دیموکراسیی بەجێ ناهێنێت چونکە فیکرە لەبارەی دیموکراسییەوە فیکرەیەکی نموونەییەو دەستکردی خەیاڵەو شتێکی واقعی نییە. ئۆرستن رەنی

دیموکراسیی وك بالۆنێکی گەورەی پڕ لە گاز یان هەوای گەرمە کە رەوانەی ئاسمان کراوە بە مەبەستی ئەوەی کە تەماشای ئاسمان بکەیت لەو کاتەی کە هەندێك کەس گیرفانەکانت بەتاڵ دەکەن. بێرنارد شۆ

لە ناو هەموو ئەو بەڵگانەی کە بۆ دیفاع کردن لە حوکمی دیموکراتی (...) لە وڵاتە نوێکاندا دەهێنرێنەوە هیچ بەڵگەیەك نازانم کە لە پێنج دەقیقەدا تەفرو تونا نەکرێت. هـ. ج. ویلز

# بەر لە دەست پێ کردن

دیموکراسیی یەکێکە لە ئایینە زەمینییەکانی سەردەم.. ئایینێکە گەورەترین رەواجی هەیەو رەواجی پێ دەدرێت... مۆدەیەکی سیاسیو فیکری ئەم رۆژەمانە.

بەڵام هەموو ئایینێکی زەمینی ئایینێکی پڕە لە ناڕێکی*. مەبەستی ئەم کتێبەشمان سەلماندنی ئەو راستییە ئاشکرایە نییە کەوا دیموکراسیی لە رۆژهەڵاتدا وجودی نییەو تەنیا ئیدیعایە... نەخێر! مەگەر جارو بار باس لە رۆژهەڵات بکەین.. مەبەستەکەمان لێرە ئاشکرا کردنی ئەو راستییە نەزانراوەیە (یان ئەوەی کەم کەس دەیزانن) کەوا لە رۆژئاوا.. سەرچاوەی دیموکراسیی، ئەو دیموکراسییە لە هەردوو رووی تیۆرو چەسپاندنەوە یەك پارچە ناڕێکیو کەلێنو ناتەواوییە.

رەخنەکانمان بە شێوەیەکی گشتی ئەمانەن:

١- لە رووی تیۆرەوە دیموکراسیی لەناو خودی خۆیدا ناڕێکە.

٢- چەند بنەماو بۆچوونێکی دیموکراسیی دەمانگەیەننە چەند ئەنجامێکی دژ بە دیموکراسیی خۆی.

٣- دیموکراسیی ئایینێکی عەمەلی نییە، یان با بڵێین: چەند حوکمەکە دوورتر بێت لە دیموکراسیی ئەوەندە حوکمەکە عەمەلی تر دەبێت.

---

* لەبەشی یەکەمی ئەم زنجیرەیەدا: (خەیاڵاتی مارکسییەت) بەشێکمان تەرخان کردبوو بۆ شیکردنەوەی میتۆدی جاهیلیو ئەوەی سەرەوەمان روونکردبووەوە.

٤- مەسەلەی حوکمیش لە راستیدا بریتییە لە مەسەلەی بەدەست هێنان‌و گەورە کردنی دەسەلاتە زیاتر لەوەی کە بەدیهێنانی دیموکراسیی‌و ئازادیی بێت.

٥- دیموکراسیی بە واتای (حوکمی گەل) وجودی نییەو ئەوەی کە هەیە حوکمی کەمایەتییە.

جگە لە مانەش مێژووی وڵاتە دیموکراتەکان مێژووی داگیر کردن‌و خوێن مژین‌و تاوانە.

دیموکراسیی ئەو ئایینە پڕ نارێکییەیە کە ئەمڕۆ کراوەتە ڕێخۆشکەرێك بۆ داگیر کردنی نوێی سیاسی‌و ئابووری‌و ڕۆشنبیری.. بۆ سڕاندنەوەی کەسایەتیمان.. دیموکراسیی هێمای کۆیلێتیمانە.

هەرچەند سەرچاوەی زۆرمان دەست نەکەوتووە بە تایبەتی سەرچاوە بە زمانی غەیری عەرەبی (ئەمەش شتێکی چاوەڕوان کراوە لە کوردستانی وێران کراو) بەلاّم چی راستی لە بارەی دیموکراسییەوە هەبێت لەم کتێبەدا کۆ کراونەتەوەو ئەو راستییانە بەسن بۆ مرۆڤی ژیر تا لەمە بەدوا بە چاوێکی ترەوە تەماشای دیموکراسیی بکات.

# بەشی یەکەم
# پێناسەو مێژوو و جۆرەکانی دیموکراسیی

## ١- پێناسەی دیموکراسیی

پێناسە باوەکە ئەوەیە کە: دیموکراسیی حوکمی گەلەو لە پێناوی گەلدایەو بە هۆی گەلەوەیە (حكم الشعب من أجل الشعب بواسطة الشعب). وشەکەش لە دوو وشەی یۆنانی Demos- گەل‌و Kratia- حوکم پێك هاتووە.

زۆربەی دیموکراسیی خوازان قەناعەتیان بەوەندە هەیەو ئەمە بە پێناسە دەزانن.. بەڵام با بپرسین: ئایا پێناسەی دیموکراسیی مەسەلەیەکی براوەیە؟.

لە راستیدا نە پێناسەیەکی تەواوی دیموکراسیی هەیەو نە واتاکەش لە مێژوودا یەك واتا بووە.

دیموکراسیی پێناسەیەکی وای نییە کە زۆر شامل بێت بۆیەو وشەکە واتایەکی روون نابەخشێت[1]، یان وەك (مەکئایڤەر) McIverی ئەمەریکی دەڵێت: تا ئەمڕۆ هێشتا تەفسیراتی هەڵەی وشەکە هەن‌و تا ئێستا واتاکەی روون نییە[2]، نووسەرێکی تریش

---

[1] پێیر شۆنو، لە، المثقفون والديمقراطية، ل١٣١.

[2] رۆبەرت مەکئایڤەر، تكوين الدولة، ل٢٤٧.

دەڵێت: کەم وشە لە فەرهەنگی سیاسی هاوچەرخدا هەیە کە وەکو دیموکراسیی مایەی سەرلێشێوانی مرۆڤ بێ[3].

بۆزیاتر ئاشنا بوون بە کێشەی پێناسە کردنی دیموکراسیی چەند نموونەیەك لە پێناسەکانو تەفسیرەکان دەهێنینەوە:

زوو لای یۆنانییە کۆنەکان (چەند سەدەیەك پێش زایین) جۆرەکانی حوکم سێ جۆر بوون کە یەکێکیان دیموکراسییەو کە واتای (سەروەریی گەل)ی هەبوو، ئەم واتایەش تا ساڵی (١٩١٨) (ساڵی تەواو بوونی جەنگی یەکەمی جیهانی) بەردەوام بوو لەوە بەدواوە چەند واتایەکی جیاوازی بۆ پەیدا بوو[4].

دیموکراسیی لەسەردەمی حوکمی سەرۆکی ئەمەریکی (جێفەرسۆن) Jefferson دا (کە لە ١٨٠١ تا ١٨٠٩ سەرۆك بووە) واتای حوکمی ئاژاوە چیو بێ نیزام (غەوغاء)ی دەگەیاندو کاتێك وشەکە بەکار دەهات واتایەکی دەبەخشی وەك واتای وشەی (رادیکالییەت)ی ئەمڕۆ[5]. رادیکالییەتیش وەك دەزانین هەر بۆ چوونێکە کە بیەوێت لە رەگەوە چارەسەری مەسەلەکان بکات.

ئەوساش ئەرستۆ (٣٨٤-٣٢٢ پێش زایین) ئەوەی وتبوو کەوا دیموکراسیی یەك جۆری نییە بەڵکو جۆرەکانی زۆرە[6]. ئەم جیاوازییەی نێوان جۆرەکانی دیموکراسییش تا ئەمڕۆ دەبینرێت.

هەندێك کات هەبوو (بۆ نموونە ئینگلتەرای سەدەی ١٩ی زایینی) کە تیایدا حکومەتی دیموکراتی واتای ئەوەی دەدا کە مافی دەنگدان لە هەڵبژاردنەکاندا فراوان

---

[3]- Charles Blitzer, Democracy, in; Encyclopedia International, vol. 5 p. 522.

[4] ئۆستن ڕەنی، سیاسة الحكم، ج١، ل٢٧٢.

[5] دێڤید کۆشمان کۆیل، النظام السیاسي في الولایات المتحدة، ل٦٧.

[6] رۆبۆللۆ دی ماتیی، لە، مستقبل الدیمقراطیة ومفاهیمها، ل١٧٦ ئەم قسەیەش لە کتێبی (سیاسەت)ی ئەرستۆدا، کتێبی چوارەم هاتووە.

بکرێت[7]، بەڵام لە لایەکی ترەوە کەسانێك هەن بەوە ناوەستنو واتایەکی فراوانتری دەدەنێ وەك (حوکمی زۆرینە – حكم الأغلبية) واتە نەك هەر ئەوەندە خەڵکی ماف دەنگدانیان هەبێت بەڵکو هەروا زۆرینەی خەڵك چییان بوێ بیکەن[8] ئەمە بە مەرجێك کە بنەمای حوکمی زۆرینە بۆ خۆی لە هەموو بنەماکانی تری دیموکراسیی زیاتر جێگەی موجادەلەو ناکۆکییە[9].

واتایەکی تر لە دیموکراسییخوازێکی تر ئەوەیە کە دەستنیشان کردنی کۆتایین ئامانجی کۆمەڵگە دەبێت بە پێی ئامانجەکانی ئەندامانی ئەو کۆمەڵگەیە بێت[10]، بە واتایەکی تر: رازی بوونی خەڵکی پێوانەی حوکمی دیموکراتییە (دوایی تریش هەبوونی ئازادیی موناقەشە کردن)[11].

پێناسەیەکی تر ئەوەیە کە دیموکراسیی هەر حوکمێکە کە جڵەوێ حوکم لە دەستی تاکە کەسێك یان کۆمەڵێك کەسدا نەبێتو خەڵکی تری لێ بێ بەش بکرێن (واتە ئستبداد نەکرێت)[12].

لە لایەکیشەوە یەکێك دەڵێت کەوا دیموکراسیی بەشێوەیەکی سەرەکی حوکمی گەل ناگەیەنێت بەڵکو نیزامێکی حقوقییە کە رێز لە بنەما هاوبەشەکانی بەرژەوەندی گشتی بگرێت[13]، یەکێکی تر کە (رەخنەگرە لە دیموکراسیی) دەڵێت زەحمەتە بتوانین

---

[7]- Harold J. Laski. Democracy. in: Encyclopeadia of the Social Sciences. vol. 5. p. 76.
[8]- Ibid.

[9] ئۆستن رەنی، سياسة الحكم، ج١، ل٢٦٧.

[10] ریچارد سکۆت، لە، مستقبل الديمقراطية ومفاهيمها، ل١٣٨.

[11] هەمان سەرچاوە ل١٤٢.

[12] دکتۆر محمد عزيز العبابي، لە سەرچاوەی سەرەوەدا، ل١٦٧. وشەی ئیستبداد despotism زۆر دووبارە دەبێتەوە لەم کتێبەدا با خوێنەر واتاکەی بزانێتو تێکەڵی نەکات لەگەڵ وشەی ستەمکاری یا زوڵم.

[13] پێتەر شۆنو، لە، المثقفون والديمقراطية، ل١٣٤.

لەسەر ئەساسی بەرژەوەندیی گشتی جیابکەینەوە نێوان دیموکراسییو جۆرەکانی تری حوکم[14].

لە لایەکی ترەوە (هارۆڵد لاسکی)ی بیریاری سۆشیالیستی بریتانی کرۆک (واتە: جەوهەر)ی دیموکراسیی دەبەستێتەوە بە (یەکسانی)و بناغەی گەشە کردنی دیموکراسیی لای ئەو بریتییە لە داولکاری یەکسانی[15]. بەڵام یەکێکی تر کرۆکەکەی بەوە دەبەستێتەوە کە بتوانرێت لە راوو بۆچوونە دژ بەیەکەکان بکۆڵرێتەوە[16].

لای (لاسکی)ش کرۆکی دیموکراسیی بە پێی کاتو شوێن گۆڕانی بەسەردا هاتووە چونکە ئەو شتەی کە لای چینێکی دەسەڵاتدار دیموکراسیی پێ بووترێت لای چینەکانی تر وەك (ئۆلیگارییەت= حوکمی کەمایەتی)یەکی تەسك تەماشا دەکرێت[17].

لای یەکێکی تریش بناغەی دیموکراسیی ئەوەیە کە سەرچاوەی دانانی یاسا دەبێت ئەو کەسانە نەبن کە پێویستە گوێڕایەڵیی ئەو یاسایانە بن[18].

لەبەر ((لاستیکێتیی)) وشەکە وڵاتە کۆمۆنیستەکانی جارانیش هەروەها بەکاریان دەهێناو خۆیان بە دیموکراتی دەزانی، (ستالین) بە دەستوورەکەی ساڵی (١٩٣٦)ی یەکێتیی سۆڤیەتیی دەووت کە دیموکراتی ترین دەستووری جیهانە[19].

بۆ ئەوەی زیاتر لە مەسەلەی پێناسەی دیموکراسیی دەرنەچینو باسی بنەماکانی دیموکراسیی لە گەڵیدا تێکەڵ نەکەین لێرەدا دەوەستینو دوایەمین بەڵگە دەهێنینەوە

---

[14] دکتۆر ملحم قربان، لە، مستقبل الديمقراطية ومفاهيمها، ل١٣٥ پێشتریش قسەکانی سەرەوە دەڵێتەوە لە بارەی نا روونیی وشەی دیموکراسییو هەبوونی ولتای زۆرو جیاواز لە بارەیەوە ل١١٩-١٢٠.

[15] H. Laski, Democracy, Op. Cit. p. 76.

[16] ئلیسل بێرنز، الديمقراطية، ل١٢٨-١٢٩.

[17] H. Laski, Democracy, Op. Cit. P. 76.

[18] سیریل جۆد، الحرية في القرن العشرين، ل١٨٠.

[19] Ch. Blitzer, Democracy, Op. Cit. p. 322.

ئەویش لێکۆڵینەوەیەکی دەزگایەکی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان لەساڵی (١٩٥٠). ئەم دەزگایە هەشتا پرسیاری نارد بۆ زانا هەرە گەورەکانی جیهان لە سیاسەتو کۆمەڵناسیی‌دا لە بارەی دیموکراسیی‌و ئەو مەسەلانەی کە پەیوەندییان پێوە هەیە. لە وەڵامی ئەم پرسیارانەش کە بۆ سەد زاناو پسپۆڕ نێردران دەرکەوت کەوا ئەوان لەسەر ئەوە رێکن کە پێناسەیەکی شامل بۆ دیموکراسیی یان حوکمی دیموکراتی نییە بەڵکو تەنانەت هەندێك لە تەفسیرەکانی دیموکراسیی بە تەواوی دژ بەیەکتر بوون[٢٠].

لە ناو گێژاوی ئەم پێناسەو تەفسیرانەی دیموکراسییدا ئەو تەفسیرانەی کە زۆرتر باون دوانن: یەکەمیان ئەوەیە کە دیموکراسیی شێوەیەکی حوکمە، دووەمیشیان ئەوەیە کە نەك هەر شێوەیەکی حوکمە بەڵکو هەروەرها شێوەو نیزامێکی ژیانە.... دوایی تریش لەم دوانە دەدوێین.

کەواتە دیموکراسیی وشەیەکی (لاستیکی)یە چۆنت ئارەزووە بیکشێنە، هەروەها وشەیەکی تەماوییە، واتە وەك وتمان دیموکراسیی تەنیا ناوێکە.. لەوەش زیاتر ناوێکی تەماوییە.. دواییش بەڵگەی زیاتر لەسەر ئەمە دەبینین.

---

[٢٠] دکتۆر ألبرت بدر، لە، مستقبل الدیمقراطیة ومفاهیمها، ل٢٤٩-٢٥٠.

## ٢- دیموکراسیی وەك ئاینێك

لەناو هەموو پێناسەکانی دیموکراسییدا تەنیا دوو پێناسە وەردەگرین کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کردبوون:

پێناسەی یەکەم ئەوەیە کە دیموکراسیی شێوەیەکی حکومەتەو لەسەر ئەساسی ئەوە بنیات نراوە کە خەڵکەکە خۆیان خۆیان حوکم بکەن‌و لەسەردەمە نوێکانیشدا بریتییە لەو حوکمەی کە لەسەر بناغەی دەزگای نوێنەرایەتی دامەزرابێت کە نوێنەرانی گەل بە ئازادیی هەڵبژێردرابن، بە پاڵ ئەمەش دەسەڵاتێکی بەجێهێنان (سلطة تنفيذية) هەبێت کە بەرپرسیارە بەرامبەر خەڵك.

پێناسەی دووەمیش ولتای دیموکراسیی فراوانتر دەکات و بەشێوەیەکی ژیانی دەزانێت، شێوەیەکی ژیانە لەسەر ئەوە بنیات نراوە کەوا تاکە کەسەکان یەکسان‌و مافێکی یەکسانیان هەیە لە ژیان‌و ئازادی.. ئازادیی بیرکردنەوەو را دەربرین‌و دەستکەوتنی گوزەرانێکی خۆش[21].

سەرەتا پێناسەی دووەم وەردەگرین‌و دەڵێین:

دیموکراسیی ئاینە ئەگەر بە شێوازێکی ژیانی بزانین چونکە ئاین بریتی نییە لە مزگەوت‌و کەنیسەو نوێژ کردن... بە تەنیا بەڵکو ئاین هەروەها نیزامێکی ژیانە. کێشەی ئێمەش نییە ئەگەر کەس دیموکراسیی یان سۆشیالیزم یان نەتەوایەتی... هتد بە ئاین نەزانێت چونکە ئێمە پابەندی پێناسەی هەڵەی کەس نابین لە بارەی ئاینەوە. ئەمانەی خوارەوەش قسەی هەندێك لەولەی کە باوڕیان وایە دیموکراسیی شێوەیەکی حوکم نییە بە تەنیا:

---

21- Encyclopaedia Britannica, vol. 7, p. 182 :هەروەها بڕوانە H. Laski, Op. Cit; p. 76.

هەروەها ئۆستن ڕەنی، سیاسة الحكم، ج١،ل٢٦١-٢٦٢.

* دیموکراسیی یەکێکە لە مەزهەبە فەلسەفییە سیاسیو کۆمەڵایەتییەکان، هەروەها نیزامێکی حوکمە[٢٢].

* دیموکراسیی وەك ڕێگایەکی ژیان ئاراستەیەکە بۆ پاراستنی مافەکانی هەموو کەسێك بەبێ جیاوازی لە ڕەنگ یان ڕەگەز...هتد[٢٣].

* لە مێژووی نوێدا خەڵکی خۆیان دوور خستەوە لە بەکار هێنانی وشەی دیموکراسیی، یەکەم پیاویش لە ئەمەریکادا کە ئەم وشەیەی بەکار هێنا (واڵت ویتمان)ی شاعیر بوو (١٨١٩-١٨٩٢) کە دەیووت دیموکراسیی تەنیا سیاسەتو هەڵبژاردن ناگرێتەوە بەڵکو دەبێت هەموو لایەنەکانی ژیانی خەڵکیو ژیانی تاکە کەسەکان بگرێتەوە[٢٤].

* لای فەیلەسووفی ئەمەریکیش جۆن دیووی (١٨٥٩-١٩٥٢) دیموکراسیی شێوەیەکە بۆ ژیان[٢٥].

* دیموکراسیی تەنیا نیزامێکی سیاسی نییە بەڵکو هەروەها فەلسەفەیەکە بۆ ژیانو بۆ جیهان[٢٦].

* دیموکراسیی لە فیکرەیەك زیاترە، دیموکراسیی شێوازێکە بۆ ژیان، ئەزموونێکی بوونە[٢٧].

---

[٢٢] دکتۆر عبدالحمید متولی، الوجیز في النظریات والأنظمة السیاسیة ومبادئها الدستوریة، ل١٥٩.

23. Encyclopaedia Britannica, vol. 7, p. 185.

[٢٤] سۆڵ ك. پادۆڤەر، معنی الدیمقراطیة، ل٤٥.

[٢٥] سەرچاوەی سەرەوە، ل٢٠، هەروەها جۆن دیووی، الدیمقراطیة والتربیة، ل٩٠.

[٢٦] ئێدوارد بێنیش (سەرۆکی چیکۆسلۆڤاکیا لە ١٩٣٥ تا ١٩٣٨و لە ١٩٤٦ تا ١٩٤٨)هذه هي الدیمقراطیة، ل٤٦.

[٢٧] پێتەر شۆنو، لە، المثقفون والدیمقراطیة، ل١٣٣.

* دیموکراسیی بەر لە هەموو شتێك هەڵوێستێکی مەبدەئییە، پێوانەیەکە بۆ بەهاکان، مەفهومێکی روونە بۆ مرۆڤ و جێگەکەی لە کۆمەڵگەدا، بڕوایەکە بە سروشتی مرۆڤ و ژمارەیەك بنەمایە بۆ رفتار کە لەم زەمانەدا بۆ بیرو کردار وەردەگێردرێن[28].

ئەمانەش کە ئەم قسانە دەڵێن بزانن یا نەزانن دیموکراسیی بە ئایین لە قەڵەم دەدەن، بەلام قسەی لەمانە زەقتر هەیە کە دیموکراسیی ئایینە:

* جیاکەرەوەی نێوان ئایین و ئایدیۆلۆجیا لابرا، ئایدیۆلۆجیا عەلمانییەکان (ئەمڕۆ) ئایینە راستەقینەکانی جیهانی نوێن[29].

* (بێرتراند ڕەسڵ) قسەیەکی هاوچەشنی وتووە: ئێستا (واتە ساڵی ١٩٤٦) جارێکی تر خۆمان لەبەردەم جەنگی ئایینەکان دەبینینەوە بەلام ئایین ئێستا پێی دەوترێت ئایدیۆلۆجیا[30].

* لەمانەش زەقتر ئەمەیە: دیموکراسیی ئێستا فەلسەفەیەکەو شێوازێکی ژیانەو ئایینە وشێوەیەکی حوکمە[31].

ئەمە ئەگەر پێناسە فراوانەکەی دیموکراسیی وەربگرین، ئەگەر پێناسەکەی تریش رەچاو بکەین، واتە (دیموکراسیی تەنیا شێوەیەکی حوکمە)، دیموکراسیی هەروەکو ئایینێك دەمێنێتەوە چونکە سەرچاوەی یاساو بڕیارەکان، ئەگەر شەریعەتی خودایی نەبێت ئەوا سەرچاوەیەکی بەشەرییە، لەو حاڵەتەش کە یاسادانەرەکە قەناعەتی بە سەرچاوەی بەشەرییەکە هەبێت بیرکردن و رەفتارەکەی دەچنە خانەی ئایینی بەشەری.. بەلام ئەگەر یاسادانەر دیموکراتی بێت بەو واتایەی بڕوای بەو سەرچاوە خوداییە هەبێت بەلام لەبەر هەر هۆیەك بێت سەرچاوە بەشەرییەکە لای ئەو سەرچاوەی

---

[28]- Ann Van Wynen Thomas. The Semantics of International Law. p. 16.

[29] پۆل کلافال، لە سەرچاوەی سەرەوەدا، ل٦٧و پەراوێز.

[30] بێرتراند ڕەسڵ، للفلسفة والسياسة، ل٢٥.

[31] جلورج بيردو، الديمقراطية، محاولة تركيبية، ل٧.

یاسا بێت (کە ئەمە لە شەرع دا بە کوفر نازانرێت بەڵکو بە گوناه) ئەوا کەمتر دەتوانین باسی ئەو جۆرە دیموکراسییە وەکو ئاین بکەین بەڵام لە هەمان کاتدا ناتوانین باسی دیموکراسیی خۆش بکەین چونە بەشی هەرە گەورەی دیموکراسیی (حوکمی گەل) لە دەست مرۆڤەوە دەچێتە دەر، بەهەر حاڵ ئەوانەی کە دیموکراسیی مەبەستیانە ئەوەشیان مەبەستە کە مرۆڤ سەرچاوەی یاسا دانان بێت.

***

بەم حیسابە دیموکراسیی یەکێکە لە ئایینەکانی سەردەم، کە دەڵێین سەردەم مەبەستمان ئەوە نییە (مۆدێرن)بێت بەڵکو وەك دوایی دەبینین یەکێك لە تایبەتییەکانی دیموکراسیی ئەوەیە کە رۆژ لە دوای رۆژ لە گیانی سەردەم دوور دەکەوێتەوە و ماوەیەکی زۆرە لە واقع دوورکەوتۆتەوە.. مەبەستی ئێمە لە وشەی (سەردەم) ئەوەیە کە لەم سەردەمەمدا کەسانێك هەن باوەڕیان پێیەتیو دیموکراسیی یەکێکە لەو ئایینانەی کە لەم سەردەمەدا دەژی.

# ٣- کورتەیەکی مێژووی دیموکراسیی

دیموکراسیی بە دوو سەردەمدا تێپەڕیوە، یەکەمیان سەردەمی یۆنانی کۆن (چەند سەدەیەك بەر لە مەسیح) بە تایبەتی لە (ئەثینا)دا، دووەمیشیان سەردەمی نوێ. لەم سەردەمە نوێیەشدا ژمارەیەك گۆڕانکاری بەسەر دیموکراسییدا هاتووە تا شێوەی ئەمڕۆی وەرگرتووە. ووشەی دیموکراسیی لە کتێبی مێژووی جەنگی (پیلۆپۆنین)دا پەیدا ببوو کە لە نووسینی مێژوو نووسی یۆنانی (ثوکیدیدس Thucydides) (٤٦٠-٤٠٠ پێش زایین)ە، ثوکیدیدس قسەی (پێریکلیس Pericles)ی نەقڵ کردبوو کەوا حوکمی (ئەثینا)ی بە دیموکراتییەکی نموونەیی ناو بردووە[٣٢].

دیموکراسییەکەی یۆنانی کۆن جیاوازە لەوەی ئەمڕۆ، دیموکراسییە کۆنەکە (دیموکراسییی راستەوخۆ –الدیمقراطیة المباشرة) دەناسرێت –کە دوایی باسی دەکەین– و لەم سەدەیەدا لە چەند شوێنێکی زۆرکەمدا مابووەوە وەك چەند ناوچەیەکی بچووکی سویسرا.

پاش سەردەمی پێریکلیس ناکۆکیو پشێوی رووی کردە شارەکە ئەمەش بووە هۆی ناشیرین کردنی ناوی دیموکراسییو بە حوکمێکی پشێوی بزانرێت بۆیە ئەفلاتونو (ئەرستۆ)ی قوتابیی ئەفلاتون رەخنەیان لە دیموکراسیی گرتبوو... چونکە ئەم دوو فەیلەسووفەش ناوبانگێکی گەورەیان هەبوو نرخی وشەی دیموکراسیی دابەزیو کەم

---

[٣٢] سۆڵ پاداوەر، معنی الدیمقراطیة، ل٢٣. (پیلۆ پۆنین) دوورگەکانی وڵاتی یۆنانە (پێریکلیس) فەرمانڕەوای ئەثینا بوو لە نزیکی (٤٩٥)ی پێش زایینەوە تا (٤٢٩)و سەردەمەکەی بە سەردەمی زێڕینی ئەثینا ناو دەبرێت. لە وڵاتی یۆنانو دەوروبەریدا شاری ئەثینا لە هەموو شار (یان دەوڵەت)ەکانی تر زیاتر ناوبانگی هەبووە کە حوکمێکی دیموکراتی تیادا بەرپابوو.

بووەوە[33]، بە شێوەیەکی گشتیی زۆربەی زۆری یۆنانی کۆنیش دیموکراسییان بە دڵ نەبوو[34].

چەند هۆیەك باسکران بۆ وازهێنان لە دیموکراسیی، بۆ نموونە (پانۆڤەر) دوو هۆ ناو دەبات: یەکەمیان ئەوەیە کە ئەم جۆرە دیموکراسییە بەکەڵکی وڵاتێکی بچووك دێت، دووەمیشیان ئەوەیە کە بە حوکمی (عەوام)ی فەوزەویو ئاژاوەچی (غەوغا) دەزانرێتو ڕێگەش خۆش دەکات بۆ دیماگۆجییەت کە هەستەکانی خەڵکی نەزان دەوروژێنێت[35].

(لاسکی)ش دوو هۆ دەهێنێتەوە بۆ فەشەل هێنانی دیموکراسییەکەی یۆنان، یەکەمیان ڕەچاو نەکردنی پەیوەستی هیلینی (الرابطة الهيلينية).. (یۆنانی) واتە هەر شارێك لە وڵاتی یۆناندا دەوڵەتێك بوو بۆ خۆیو هەموویان لە یەك دەوڵەتدا یەکیان نەگرتبوو. دووەم هۆش شارەزووی یەکسانێتیی[36] لای ئەثینایییەکان کە ببووە ڕێگر بەرامبەر پێکهێنانی دەسەڵاتێکی بەجێهێنانیی (سلطة تنفيذية)[37]ی بەهێزی وا کە چالاکانەو بەهێزانە لە مەیدانی پەیوەندییەکانی دەرەوەدا کار بکات[38]. دەوڵەتەکەش کە لەم مەیدانەی دەرەوەدا لاواز بێت ئیمکانییەت زۆرە بۆ تێکچوونی نیزامی حوکمەکەی.

---

[33] سەرچاوەی سەرەوە، ل٢٤-٢٥.

[34] H. Laski, Op. Cit. P. 78.

[35] سۆل پانۆڤەر، معنى الديمقراطية، ل٢٦-٢٧ دیماگۆگ ئەو کەسەیە کە هەستی خەڵکی نەزان دەوروژێنێت بۆ مەبەستی تایبەتیی خۆی. بە کردارەکەش دەوترێت دیماگۆجییەت.

[36] واتە یەکسانیی نێوان ((هاووڵاتیان)) ئەم یەکسانییەش ڕێگرە بەرامبەر هەبوونی فەرمانڕەوایەك یان چەند فەرمانڕەوایەکی بەهێز. مەبەستیش لە ((هاووڵاتی)) ئەولەی بە ڕەچەڵەك ئەثینین لەبەر ئەوە هاووڵاتێتی بێگانەکانو کۆیلەکان...ی نەدەگرتەوە، هەروەها ئافرەتانیش مافی بەشدار بوونیان نەبوو.

[37] دەسەڵاتی بەجێهێنان ئەوەیە کە ئەمڕۆ پێی دەوترێت حکومەت (بە واتا تایبەتییەکەی)و کەسەرۆك کۆمارو وەزیرەکانی یان سەرەك وەزیرانو وەزیرەکانی ... دەگرێتەوە (بڕوانە بەشی دواتوو: جۆرەکانی دیموکراسیی).

[38] H. Laski, Op. Cit. P. 78.

هەیشە دوو هۆ دەهێنێتەوە بۆ ئەو فەشەل هێنانە یەکەمیان کۆیلێتیو دووەمیان سەرنەکەوتن لە ڕووی دروستکردنی نیزامێکی جیهانیی کارێگەر[39].

بەڕای ئێمەش دوو هۆی سەرەکی هەن بۆ فەشەل هێنانی ئەم جۆرە حوکمە، یەکەمیان دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی حوکم (بەڵکو سروشتی بەشەرییەت خۆی) کە ئەگۆڕیی هەتاهەتایی بۆ خۆی قەبووڵ ناکاتو بەم جۆرە هیچ شێوە حوکمێك بۆ هەتا هەتا نامێنێتەوە، دووەم هۆش دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی حوکمی دیموکراتی خۆی کە ناواتێکی خەیاڵییەو لە کۆتاییدا هەر دەبێتە حوکمی کەمایەتی وەك دوایی بۆمان دەردەکەوێت.

لەسەردەمی دەوڵەتی (ڕۆما)دا چەمکێکی دیموکراتی هەبوو بەڵام ئەمە تەنها بە ناو بوو. تەنانەت لە سەردەمی کۆماریی ئەو دەوڵەتەشدا (٥٠٩ پێش زایین تا کۆتایی سەدەی یەکەمی پێش زایین) کە خەڵکی زیاتر بەشداری حوکمیان دەکرد لە چاو سەردەمی دوایی تر واتە سەردەمی ئیمپراتۆری[40]، فەیلەسووفە (ڕەواقی Stoic)یە ڕۆمایییەکانیش* ڕێزیان لە یەکسانی دەگرت بەڵام ئەمە لە ڕووی ئەخلاقییەوە بوو نەك سیاسی[41].

---

39- A. V. Wynen Thomas, Op. Cit. P. 17.

40- Ibid, p. 78f.

* ڕەواقییەت Stoicism فەلسەفەیەکی ئەخلاقییە لە سەدەی چوارەمی پێش زایین پەیدا بووو تا سەدەی سێیەمی زایینی بەردەوام بوو.

41- A.N.W. Thomas, Op. Cit.

تەقلیدی (جووڵەکە – نەصرانی) یەکێکە لە هۆکارەکانی دیموکراسیی لای هەندێك، بۆ نموونە بڕوانە:

Neal Rimer, Democratic Experiment, p. 30ff.

بەڵام ئێمە گومانمان لە گرنگێتیی ئەم هۆکارە هەیە.

ئەو بەشەی ئەورووپاش چیتر حوکمی دیموکراتیی بە خۆیەوە نەبینییەوە، پاش بڵاو بوونەوەی ئایینی مەسیحیش (سەدەی چوارەمی زایینی بە دواوە) باسی یەکسانی لە لایەن سیاسەتمەدارە نەصرانییەکان دەکرا بەڵام ئەم یەکسانییە ڕۆحی بووە نەك سیاسی[42]، لە چەرخە ناوەڕاستەکانیشدا[43] چەند بیروباوەڕێکی عەمەلی تر هاتنە کایەوە بە هۆی هەندێك هۆوە وەك پەیوەندی نێوان دەرەبەگەکان و ئەتباعیان، هەروەها ململانە لەسەر دەسەڵات لە نێوان کەنیسەو دەوڵەت و بیروباوەڕەکانی هەندێك لە پیاوانی کەنیسە. لەو چەرخەشدا بیرۆکەی نوێنەرایەتی (التمثیل)[44] تۆوی گەشەسەندنی هەڵگرتبوو چونکە بە پێی ئەم فیکرەیە ئەو کەسانەی کە بێ بەش بوون لە حوکم کردن مافی شکات کردنیان دەست کەوت، پاش گەشەکردنی باروبۆخە کۆمەڵایەتییەکانیش ئەم شکات کردنە بووە ناڕەزایی دژی ئستبداد، تۆوەکانی دیموکراسیی نوێش لەم شتەدا هەن[45].

لەگەڵ پەیدا بوونی مەزهەبی پرۆتستانتی، هەروەها ئابووریی سەرمایەدار؛ گرنگێتییەکی گەورە درا بە مرۆڤی تاك و بە تاك ڕەویی[46]، ئەم تەئکید کردنەش لەسەر فەردییەت بووە هۆی ئەوەی کە دیموکراسیی و لیبرالییەت پێکەوە گرێ بدرێن[47].

---

سەرچاوەی پێشوو.

سەدە ناوەڕاستەکان: لەسەدەی ٥ تا ١٥ی زایینی.

ئەوە بوو دەرەبەگو خاوەن زەوییەکان و قەشەکان بەشداری حوکمیان دەکرد بەڵام خەڵکەکەش ...وسەری خۆیان هەبوو لە پەرلەمانی ئەو کاتەدا.

45- H. Laski. Democracy. Op. Cit. p. 79.

(لاسکی) هەروەها دەڵێت کەوا خولسنی بێ سنوور (الإرادة غیر المحدودة) لەگەڵ بیرکردنەوەی ئەو ...سەدەگونجا ئەمەش بووە هۆی پەیدا بوونی فیکرەی (دەستوورییەت) واتە دانانی دەستوورو ...کا... [illegible]

46- Ibid.

لای (بلیتزەر)یش تیۆرو چەسپاندنی مەزهەبی پرۆتستانتی (هەر چەندە ئەم تیۆرو چەسپاندنە دیموکراسیی نەبوون) هێزێك بوو بۆ ئامادە کردن بۆ دیموکراسیی[٤٨].

بەبێ ئەوەی بچینە ناو قۆناغەکانی دوایی تری دیموکراسیی دەڵێین کەوا چەند شۆڕشێك کارێکی گەورەیان هەبوو لەسەر گۆڕانی حکومەتەکان، لە حوکمی تاکە کەسەوە (پادشا) بۆ حوکمێك کە بەشدار بووانی ئەو حوکمە ژمارەیەکی زۆرتر بن، ئەو شۆڕشانەش؛ شۆڕشی ئینگلیزی (سەدەی حەڤدەی زایینی) کە بریتی بوو لە جەنگی نێوان پەرلەمانییەکانو لایەنگرانی پادشاو کە بە لە سێدارەدانی پادشا (ساڵی ١٦٤٩) کۆتایی پێ هات، شۆڕشی فەرەنسی (١٧٨٩ز) دژی دەرەبەگەکانو دژی حوکمی رەهای پادشاو شۆڕشی ئەمەریکی (١٧٧٦ز) کە هەر چەند دژی داگیر کەری ئینگلیزی بوو بەڵام لە دژی حوکمی پادشایی حوکمێکی کۆماری (جمهوری) دامەزرا.

هەندێك بارودۆخی سیاسی (تەنانەت جوگرافیش) کاریان هەبوو لەسەر گەشەکردنی دیموکراسیی. بۆ نموونە بەریتانیا لە لایەن پادشای غەیری ئینگلیزەوە حوکم دەکرا، ئەمانەش زمانی ئینگلیزییان نەدەزانی یان هیچ نەبێت ئاگاداری تەقالیدی ئینگلیزی نەبوون بۆیە مەسئولییەت دەدرا بە ئەنجوومەنی وەزیران، پەرلەمانیش لەم وەزیرانەی دەپرسییەوە[٤٩]، واتە بەم شێوەیە رۆڵی پادشا کەمتر بووەوەو رۆڵی حکومەت و پەرلەمان بەرەو گەورەبوون دەچوو. لە لایەکی تریشەوە ئینگلتەرا دوورگەیەك بوو کەمتر مەترسیی هێرشی لەسەر بوو، هەروەها وڵاتەکە دەمێك بوو خۆی یەکخستبوو

[١٢] لیبرالیەت (ئازادیخوازی) بڕوای بەوەیە کە دەوڵەت خۆی نەخزێنێتە ناو کاروباری تاکە کەسەکان لە رووی ئابوورییەوە. لە رووی سیاسیشەوە تاکە کەسەکان ئازادیی تەواویان هەبێت.

[48] Ch. Blitzer, Democracy, Op. Cit. p. 524.

(بیلتزەر) دوو هێزی تر ناو دەبات: (رێنیسانس)و (دامەزراندنو بەهێز بوونی خێرای چینی ناوەڕاست).

[٤٩] ئیلیسیل بێرنر، الدیمقراطیة، ل١٤-١٥ هەروەها بڕوانە

The British Parliament, p. 7.

هێمنی بە خۆیەوە بینی بوو[٥٠] بەڵام وڵاتێکی وەك فەرەنسا لە کێشوەرەکەدا بوو واتە دەورو بەری چنرا بوو بە وڵاتی دوژمن ئەمەش وای کرد کە فەرەنسا زیاتر پێویستی بە هەبوونی حکومەتێکی بەهێز هەبێت‌و حوکمی رەهای پادشایی تیادا زیاتر بخایەنێت[٥١].

پێویستە ئەوە بوترێت کەوا پەرلەمان بە هۆی باجەوە گەشەی کرد. پادشایان پشتیان بە نوێنەران دەبەست بۆ کۆکردنەوەی باج. کاتێکیش پادشا پێویستی دەبوو بە پارە ئەو دەزگایە یان ئەو نیمچە پەرلەمانەی بانگ دەکرد کەکۆببێتەوە تا ئەمە بە نوێنەرانی ناوچەکان یان نوێنەرانی چینەکان رابگەیەنێ. زەحمەتیش بوو پارە کۆبکرێتەوە لەو کۆمەڵانەی کە باجەکەیان دەدا بەبێ رەزامەندیی ئەوان لەبەر ئەوە دەبینین کەوا ئەم پارە کۆکردنەوە دەسەڵاتێکی گەورەتری بەو دەزگایە بەخشی[٥٢] ئەم دەزگایانەش بوونە بناغەی پەرلەمانی ئەمڕۆ، ئەندامەکانیشیان (واتە: نوێنەرەکان) سەرەتا دەرەبەگو قەشەکان بوون، ئەمانەش لە ئینگلتەرادا شۆڕشێکیان بەرپا کرد کە ئەنجامەکەی ئەوە بوو لە (١٢١٥)دا ماگناکارتا (پەیمانی گەورە)(Magna Carta) دەرچوو کە تیایدا پادشا پەیمانی دا هیچ باجێکی تر نەسەپێنێت بەبێ رەزامەندیی ئەنجوومەنەکە[٥٣].

بەم شێوەیەش خواستی دەرەبەگو بازرگانەکان بۆ دەست گرتن بەسەر دەسەڵاتدا یەکێك بوو لە هێزە هەرە گرنگەکانی دامەزراندنی پەرلەمان‌و نیزامی دیموکراتی[٥٤]. ئەمەشیان بە هۆی باجەوە بوو... ئەمەش بۆ خۆی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە حوکمی گەل بناغەی دیموکراسیی نییە بەڵکو بناغەکەی بریتییە لە ئەساسی هەموو

---

[٥٠] سەرچاوەی سەرەوە. ل١٥

[٥١] عطا بكري. الديمقراطية و التكوين. ل٦١.

[52] Francis W. Coker, Carlton C. Rodee. Representation Encyclopaedia of the Social Sciences, Vol. 13, p. 311.

[٥٣] دكتور طه... ... حرية الدولة والأسس العامة للتنظيم السياسي، ل٢٦٩-٢٧٠.

[٥٤] ديلمسا ... ... ... ضة، ل١٩.

جۆره حوکمێکی تر، واته: بەدەست هێنـانی دەسـەلات**، دواییـش ئەمـەمان باشـترو بـە بەڵگەی زیاترەوە بۆ ئاشکرا دەبێت.

ساڵی (١٦٤٢ز) لە بـەریتانیادا جـەنگی نێوان پەرلـەمانو پادشـا چـارلزی یەکـەم روویدا، پاشان شۆڕشی دووەم (١٦٤٧ز–١٦٤٩ز) بەرپا بووو ئەنجامەکەی لە سێدارەدانی پادشـا بـووو دامـەزراندنی نیزامی کۆمـاریی بـە سـەرکردایەتیی (ئۆلیڤـەر کرۆمویـڵ)... (١٥٩٩–١٦٥٨ز)ی ئەفسـەرو پێشـەوای دەرکـەوتووی نـەیارەکانی پادشـا کەلـە سـاڵی (١٦٥٣ز)ەوە تا (١٦٥٨ز) حوکمێکی دیکتاتۆریی پیادە کـرد، پـاش ئـەویش پادشـایەتی ساڵی (١٦٦٠ز) حوکمی کردەوە، بەلام بە دەسەلاتێکی سنووردارەوە، بەلام کێشەکە هەر مایەوە تا شۆڕشی بێ خوێنی (١٦٨٩ز) کە لەو کاتەوە دەسەلاتی پادشایی لە بەریتانیادا سنووردار بووەو پەرلەمان دەسەلاتێکی گەورەی دەستکەوت، پـاش ئەمـەش شۆڕشـێکی تـری خەڵکەکـە (جووتیـارانو بازرگانـەکان) سـاڵی (١٨٣٢ز) یاسـای چـاککردنی (قـانون الإصلاح)ی بەرپا کرد (Bill Reform) کـە ئەنجامەکـەی ئـەوە بـوو چینـی ناوەڕاسـت (بورجوازییـەکان) چوونـە پەرلـەمان بـەلام هێشـتا چینـە هـەژارەکان لـە خۆپـالاوتنو لـە دەنگدان بێبەش بوون چونکە سنوورو قەیدی زۆر لەسەر دەنگدان دانرابوون.

پاشـان چـەند چـاککردنێك بـەرپا کـران بـە هـۆی سـێیەمیانەوە (سـاڵی ١٨٨٤ز) دەنگدان بۆ هەموو هاولاتییەك بوو (ئافرەتان نەبێت).

گەشەسەندنی دیموکراسیی لە فەڕەنسادا توندو تیژتر بوو، لە ئەمەریکاشدا هێمـن تر بوو. سەبارەت بە ئافرەتانیش دەستکەوتنی مافی دەنگدان درەنگ کەوت: لە بەرتانیادا ساڵی ١٩١٨ز (ئەو ئافرەتانەی تەمەنیان سی ساڵ بەرەو ژوورە پاشان ساڵی ١٩٢٨ وەکو پیاوانیان لێ‌کرا واتە تەمەنی ٢١ ساڵی بەرەو ژوور)، ئافرەتـانی نیوزیلانـد سـاڵی ١٨٩٣ز

---

** لەبەر ئەوە ئەو قسەیەی کە دەڵێت کەوا مێژووی دیموکراسیی تا رادەیەکی گەورە بریتییە لە مێژووی زیاد بوونی بەردەوامی بەشـداری کردنـی خەڵکەکـە لـە هـەلبژاردن (بڕوانـە: Encyl. Britannica, Vol. 7, p. 184.) قسـەیەکە تەنیا رواڵەتی تەماشا کردووە بەلکو مێـژووی دیموکراسـیی بریتییـە لـە مێژووی هەوڵەکانی تاقمە بەهێزەکان بۆ بەشداری کردن لە دەسـەلاتی سیاسیدا.

مافیـان دەسـتکەوت، نـەرویج (١٩١٣)، ئەمـەریکا (١٩٢٠).. ئەمـە بـۆ گشـت ولات بـەلام هەندێ ویلایەتی ئەمەریکی لـە هەڵبژاردنـەکانیاندا زووتـر مافەکـەیان دابوو).. فەرەنسـاو ئیتالیا (١٩٤٦)، سویسرا (١٩٧٣).

مێژووی دیموکراسیی زۆر بە کورتی بریتییە لە ململانەی نێوان چینەکانی گـەل لـە لایەکو پاشا لە لایەکی تر، هەروەها ململانەی نێوان تاقمو کۆمەڵو چینەکان خۆیـان بـۆ دەست کەوتنی گەورەترین بەش لە حوکمو دەسەلات، بە درێژایی ئەو مێژووەش هەوڵی زۆردران بۆ ئـەوەی سـنوورەکانی خـۆ پـالاوتنو دەنگدان کـەم بکرێنـەوە یـان لابـبرێن، ئەوساش قەیدی جۆراوجۆر هەبوون وەك؛ مەرجی هەبوونی برێکی دیاری کراوی سامان، مەرجی هەبوونی جێگەی نیشتەجێ.... تاد.

بە پێی بڕیاری فەڕەنسـی دوتۆکفیـل (lxis De TocquevilleA) (١٨٠٥-١٨٥٩ز) سەدەی نۆزدەمی زاییـنـی بەسـەدەیەکی دیموکراتـی دەزانرێـت[٥٦]. بـەلام هێشـتا وشەی دیموکراسیی لە ناو جیهاندا بڵاو نەبووەوە تا سەرۆکی ئەمەریکی (وودرۆ ویڵسۆن) لە کاتی جەنگی یەکەمی جیهانییەوە بەکاری هێنا[٥٧] ئینجا وشـەکە رەواجـی بـە خۆیـەوە بینی.

پاش جەنگی یەکەمی جیهانیو لەوە زیاتر پـاش جـەنگی دووەم زۆر لـە حوکمـی پاشاییەکانی ئەوروپا هەرەسیان هێناو ئەولەی تر بوونـە پاشـا نشـینێکی دەسـتووری بـەلام مـاوەی نێـوان دوو جەنگەکـە کێشـە بـۆ دیموکراسـیی درووسـت بـوو بـە هـۆی فاشییەتەوە، پاش جەنگی دووەمیش بە هۆی کۆمۆنیزمەوە.

مێژووی دیموکراسیی لەوەی سەرەوە ئاڵۆزترە بەلام بۆ ئەوەی درێژە بـە باسـەکە نەدەین ئەوەندە بە بەس دەزانین بۆ خوێنەر تا فیکرەیەکی گشتیی هەبێت لە بارەی ئەو مێژووەوە *.

---

[٥٦] سۆڵ پادۆڤەر، معنى الديمقراطية، ل٣٨.

[٥٧] سەرچاوەی سەرەوە، ل٢٢ و٤٨.

* بۆ شارەزا بوون لە مێژووی دیموکراسیی بڕوانە، دکتۆر طعیمة الجرف، نظرية الدولة، ل٢٦٩ بە دواوە، عطا بکری، الديمقراطية في التكوين، ل٢٥ بە دواوە.

# ٤- جۆرەکانی دیموکراسیی

دیموکراسیی چەند جۆرێکی سەرەکیی هەیە، بەر لەوەی باسیشیان بکەین با هەندێ شتی گرنگ روون بکەینەوە تا خوێنەر باشتر لەوان و لەسەرجەم باسەکانی ئەم کتێبە تێبگات.

لە دەوڵەتدا سێ دەسەڵات هەن:

١- دەسەڵاتی یاسا دانان (السلطة التشريعية)Power Legislative: کاری سەرەکیی ئەم دەسەڵاتەش بریتییە لە بڕیار دان لەسەر یاساکان جگە لە کاری تری وەك پەسەند کردنی بودجە... تاد. ئەم دەسەڵاتە پێویستە (پەرلەمان) پیادەی بکات.

٢- دەسەڵاتی بەجێهێنان (السلطة التنفيذية) PowerExecutive : دەسەڵاتی بەجێهێنانی یاساکان و بەڕێوە بردنی وڵات (کاروباری ناوخۆ، پەیوەندییەکانی دەرەوە،...)

ئەم دەسەڵاتەش کابینەی حکومەت (سەرۆك وزیران و وەزیرەکانی) لە نیزامی پەرلەمانیدا یان سەرۆکی کۆمارو وەزیرەکانی لە نیزامی سەرۆکایەتیدا پیادەی دەکەن.

٣- دەسەڵاتی قەزایی (السلطة القضائية) Judicial Power: ئەویش کە مەسەلە قەزاییەکان بەجێ دەهێنێت و دادگاکان بەمە هەڵدەستن.

کاتی خۆی لە ئەورووپادا ئەم دەسەڵاتانە لە دەستی یەك کەس یان دەزگادا بوون بۆیە بۆ مسۆگەر کردنی ئازادیی و بۆ ڕێگرتن لە ئستبداد بیر لە جیاکردنەوەیان کرایەوە بە جۆرێك هەر دەسەڵاتێکیان لە دەستی یەك دەزگادا بێت بەو لێك جیاکردنەوەیەش دەوترێت لێك جیاکردنی دەسەڵاتەکان (فصل السلطات) Seperation of Powers: کە لەم کتێبەدا بەشێکی تایبەتیمان بۆ تەرخان کردووە.

بەهۆی چۆنیەتی ئەم لێك جیاکردنەوەیەش چەند جۆرێکی حکومەت دروست دەبن:

١- حكومەتی جەمعیە (یاخود حكومەتی ئەنجوومەن): كە نموونەی زۆر كەمە، لەم حكومەتەدا دەسەڵاتی یاسادانانو دەسەڵاتی بەجێهێنان تێكەڵییەكی تەواویان هەیە (ئەنجوومەن خۆی وەك دەسەڵاتێكی یاسادانان دەسەڵاتی بەجێهێنان هەڵدەبژێرێتو دەسەڵاتی گەورە هی یەكەمیانە).

٢- نیزامی سەرۆكایەتی (النظام الرئاسي): سەرۆك كۆمار (كە سەرۆكی دەسەڵاتی بەجێهێنانە)و پەرلەمانیش (كە دەسەڵاتی یاسا دانانە) هەر یەكەیان بە جیایی هەڵدەبژێردرێن. لەم نیزامەشدا سەرۆك وەزیران وجودی نابێتو سەرۆكی كۆمار دەسەڵاتی گەورەی هەیە نموونەش لەسەر ئەم نیزامە ئەمەریكا، لەم نیزامەشدا لێك جیا كردنی دەسەڵاتەكان تەواوو رەقە (جامد)ە، چونكە نە سەرۆك كۆمار دەتوانێت پەرلەمان هەڵوەشێنێتو نە پەرلەمان دەتوانێت دەنگ بدات لەسەر لابردنی سەرۆك، ئەمەش بە پێچەوانەی نیزامی (پەرلەمانی) كە لێك جیاكردنەكە لاستیكییە (مرن).

٣- نیزامی پەرلەمانی: لەم نیزامەدا خەڵكەكە پەرلەمان هەڵدەبژێرن، ئەو حیزبەش كە زۆرینەی كورسییەكانی پەرلەمانی دەست دەكەوێت حكومەتی (كابینە) پێك دەهێنێت كە دەسەڵاتی بەجێهێنانەو كە بریتییە لە (سەرۆك وەزیرانو وەزیرەكان). سەرۆك كۆمار (یان پادشا ئەگەر حوكمەكە پادشایی بێت) سەرۆكی ئەم دەسەڵاتەی بەجێهێنانە بەڵام دەوری سەرۆك كۆمار یان پادشا دەورێكی رەمزییەو دەسەڵاتی گەورە هی سەرۆك وەزیرانە ئەمانەش هەموو شتی (نظری)ن ئەگینا گۆڕانێكی زۆر بەسەر ئەم جۆرە نیزامانەدا رووی داوە بۆ نموونە فەرەنسا كە ئەوسا نیزامێكی پەرلەمانیی پیادە دەكرد بەڵام پاش (١٩٥٨) نیزامەكەی بووە (نیزامی تێكەڵ) یاخود وەك هەندێك ناوی دەنێن (نیزامی نیوە سەرۆكایەتی) یان (نیوە پەرلەمانی)[٥٨]. هەروەها ئیسرائیل كە نیزامەكەی

---

[٥٨] بەر لە (١٩٦٢ن) پەرلەمان بە دوو ئەنجوومەنەكەی سەرۆكی فەرەنسیی هەڵدەبژارد كە ئەمە لە نیزامی سەرۆكیدت نییە پاش (١٩٦٢) مانی هەڵبژاردنی سەرۆك درا بە خەڵكەكە.

پەرلەمانییە بەلام لە سالی (١٩٩٦) دەستکاریی دەستوور کراو سەرۆك وەزیران ئیتر بە هەلبژاردنی گشتی هەلدەبژێردرێت کە ئەمە لە نیزامی سەرۆکایەتیدا هەیە نەك پەرلەمانی.

ئەمە زۆر بە کورتی روونکردنەوەی چەند زاراوەیەکی پێویست کە دەبێ خوێنەر بە وردی بیانخوێنێتەوە چونکە زۆر لە کتیبەکەدا دووبارە دەبنەوە....

ئەم شتانەش کە باسمان کردن شایەنی کتێبی گەورەن چونکە (تفاصیل)و وردەوالەیان زۆرە.

ئینجا بێینە سەر جۆرەکانی دیموکراسیی و بە کورتی باسیان بکەین و پاشان هەر یەکێکیان بە جیاوەربگرین:

**جۆری یەکەم**- دیموکراسیی راستەوخۆ (الدیمقراطیة المباشرة): Democracy Direct ئەویش کە گەل راستەوخۆ لە کاروباری حوکمدا بەشداری دەکات بۆیە پەرلەمان وجودی نابێت بەلکو ئەنجوومەنی هاولاتیان یاخود (جەمعیە) Ecclesia هەیە کە بریتییە لە هەموو ئەو هاولاتییانەی کە مافی بەشدار بوونیان هەیە.. ئەم ئەنجوومەنەش جیایە لە جەمعییەی سەرەوە چونکە ئەوەی سەرەوە جۆرە پەرلەمانێکە.

**جـــــــۆری دووەم** – دیموکراســــیی نوێنەرایـــەتی (الدیمقراطیـــة النیابیـــة): Representative Democracy لە جیاتی ئەنجوومەنی هاولاتییان (کە تیایدا هەموو هاولاتییان کۆدەبنەوە) ئەو هاولاتییانە نوێنەری خۆیان هەلدەبژێرن بۆ نموونە ئەگەر هاولاتییان دە هەزار کەس بن لە جیاتی ئەوەی ئەمانە لە یەك شوێندا کۆببنەوە بۆ بریاردان لەسەر مەسەلەکان ئەمان بۆ (نموونە) دە کەس هەلدەبژێرن کە هەر یەکێك لەم دە کەسە نوێنەری هەزار هاولاتییەو ئەم دە کەسە پەرلەمانێك پێك دەهێنن، واتە گەل کە خاوەنی دەسەلاتە ئەو دەسەلاتە دەخاتە دەستی نوێنەری خۆی، بەمەش دەترێت پێسپاردنی دەسەلات (تفویض السلطة).

**جۆری سێیەم**- دیموکراسی نیوە راستەوخۆ (الدیمقراطیة شبه المباشرة):-Semi Direct Democracy جۆری دووەمی سەرەوەی کە باسمان کرد بەشدارییەکی کەمتری خەلکەکەی تیایە لە حوکمدا بۆیە بە پال هەبوونی پەرلەمان کە تایبەتییەکی

جۆری دووەمەو وەك چارەسەرێك چەند ئیجرائێك هەیە وەكو ئستفتاء (پرس بە گەل)، مافی گەل بۆ پێشنیار، ئیعتراز... هتد واتە ئەم جۆرە دیموكراسییە نیوە راستەوخۆیە بریتییە لە دیموكراسیی نوێنەرایەتی (جۆری دووەم) بە پاڵ هەبوونی یەكێك یان زیاتر لەم ئیجرائاتە.

جگە لەم سێ شێوەیە (دیموكراسیی قەیسەری)هەیە (یان هەبووە) كە دان بەوەدا دەنێت كە گەل خاوەنی سەروەرییە بەڵام گەل ئەم سەروەرییەی خستۆتە دەستی كەسێك كە جێگەی متمانەیەتی. ئەم جۆرەش لە كاتی ناپلیۆنی یەكەمو ناپلیۆنی سێیەمدا هەبووە (سەدەی نۆزدەی زایینی).

دیسان جۆرەكانی سەرەوەش زۆر بە كورتی باسمان لێكردوونو لە بەشە داهاتووەكاندا روونتر دەبنەوە. لە راستیشدا گرنگترین جۆرە كە ئەمڕۆ پیادە دەكرێت جۆری دووەمە (دیموكراسیی نوێنەرایەتی) بۆیە زۆرتر لەسەری دەڕۆین بەڵام با سەرەتا لە بارەی جۆرەكانی تر بدوێین.

# یەکەم: دیموکراسیی راستەوخۆ

دیموکراسیی راستەوخۆ ئەوە بوو کە لە وڵاتی یۆنانی کۆندا پیادە دەکرا هەروەها تا ئەم سەدەیە لە چەند ناوچەیەکی بچووکی (سویسرا)و لە شارەکانی ناوچەی (نیو ئینگلاند) واتە: ویلایەتەکانی کەناری رۆژهەڵاتی ئەمەریکا[59].

وتمان لەم جۆرە دیموکراسییەدا پەرلەمان (بەو واتایەی ئێستای پەرلەمان) وجوودی نییە، واتە لە جیاتی ئەوەی پەرلەمانێك هەبێت کە ئەندامەکانی هەڵبژێردراو بنو نوێنەری خەڵکەکە بن.. هاوڵاتیان راستەوخۆ حوکم دەکەن واتە خەڵکەکە لە یەك شوێندا کۆدەبنەوەو بڕیار لەسەر یاساکان دەدەنو بەم جۆرە کاری یاسا دانان (تەشریع) بەجێ دەهێننو بەم هاوڵاتییانە دەوترێت ئەنجوومەنی هاوڵاتییان یان ئەنجوومەنی گەل یان (جەمعیە)... بەڵام لەبەر ئەوەی کاری بەجێ هێنان (تنفیذ) بەو هەموو خەڵکە ناکرێت ئەنجوومەنێکی بچووکتر هەڵدەبژێرن کە بەم کارە هەڵسێت.

لە ئەثینادا دە خێڵ هەبوون، هەر یەکێکیان پەنجا ئەندامی دەناردو ئەنجوومەنی (٥٠٠) کەسی دروست دەبووو حوکم بەنۆرە دەبوو لەنێوان ئەم خێڵانە، ئەم ئەنجوومەنەش (دەسەڵاتی بەجێهێنان)ی پێك دەهێنا، کارەکانیشی بریتی بوون لەسەرپەرشتی کردنی کاروباری دارایی و باجەکانو دادگایی کردنی هاوڵاتییانو پێشوازی کردن لە باڵیۆزەکان بەپاڵ ئەمانەشەوە ئەنجوومەنەکە دەوری هەبوو لە لایەنی یاسادانان بەوەی کە پێشنیاری یاساکانی دەکردو پێشکەشی دەکرد بە ئەنجوومەنی هاوڵاتییان تا بڕیاریان لەسەر بدات[60].

---

[59] نازانین ئێستا تا چەند ئەمە ماوە.

[60] دکتۆر إبراهیم دەرویش، الدولة نظریتها، تنظیمها، دراسة فلسفیة تحلیلیة، ل١٢٠-١٢١.

بەم شێوەیە لە جیاتی پەرلەمان کە ژمارەیەکی کەمی ئەندامی تێدایە کە نوێنەرایەتی خەڵکی دەکرد... هەموو هاوڵاتییان ئەنجوومەنەکەیان پێك دەهێناو هەموویان کۆ دەبوونەوەو بڕیاریان لەسەر یاساکان دەداو ئەم ئەنجوومەنە ئەنجوومەنی پێنج سەد کەسییەکەی هەڵدەبژاردو چاودێریی دەکردو هەروەها فەرمانبەرەکانی هەڵدەبژارد.

کەواتە لەم جۆرە دیموکراسییەدا خەڵکی راستەوخۆ حوکمیان دەکرد.

جان جاك روسۆ (١٧١٢-١٧٧٨ی زایینی) تەنیا ئەم شێوەیەی بە حوکمی دیموکراتی دەزانیو کەلەو کاتەدا لە وڵاتی ئەسڵی روسۆدا (سویسرا) پیادە دەکرا بەڵام هەر خۆشی دانی بەوەدا دانابوو کەوا ئەم شێوە حوکمە تەنیا بەکەڵکی وڵاتێکی بچووك دێت[٦١] کە ژمارەی دانیشتوانی کەم بن، ئاشکراشە کە ناکرێت ژمارەیەکی زۆری خەڵك لە یەك شوێندا کۆبکرێنەوە، ئەمەش لە راستیدا رەخنەی یەکەمە کە هەموو دیموکراسیخوازێك لەم جۆرە حوکمەی دەگرێت.

لە وڵاتێکیش کە ژمارەی خەڵکەکەی چەند ملیۆنێکە دەبێت سەدان هەزار کەس لەیەك شوێندا کۆ بکرێنەوە تا موناقەشەی پرۆژەی یاساکان بکەن کە ئەمەش زەحمەتە بەڵکو قەدیش ناکرێت. رەنگە بشوترێت کە بە هۆی ئامێری نوێوە (تەلەفزیۆن) ئەم کارە بکرێت، واتە خەڵك لەماڵی خۆیاندا بتوانن ئاگاداری موناقەشە بنو بەشداری تیا بکەنو بەم جۆرە بتوانن حوکم بکەن بەڵام بە پێچەوانەوە ئەنجامی ئەمە دیموکراسییەکی کەمتر دەبێت چونکە کۆنترۆڵی ئەو ئامێرە دەکەوێتە دەست خاوەنەکانی کە ژمارەیەکی کەمی پیاوانی راگەیاندنو دەسەڵاتی ئەوان گەورە دەبێت نەك هی گەل[٦٢].

بەڵام مەسەلەکە تەنیا کۆکردنەوەی ئەو ژمارەیە نییە بەڵکو کێشەکە گەورەترە چونکە ئەم ژمارە زۆرەی خەڵك (بگرە دەیەکیو لەهەزاردا یەکی ئەو ژمارەیەش) قەد

---

[٦١] روسو، في العقد الإجتماعي، ل١١٩.

[٦٢] هـ. أ. شيللر، المتلاعبون بالعقول، ل٢٣٥ دولیی تریش باسی ئەمە دەکەینەوە.

ناتوانن موناقەشاتی جیدی بکەن و بە پێی پێویست تاوتوێی مەسەلەکان بکەن، تەنانەت پەرلەمانیش کە لە جیاتی دەیان هەزار کەس تەنیا سەد یان دووسەد یان ئەوپەڕەکەی (٦٠٠) کەسی تێدایە کەم جار دەتوانێت موناقەشاتی جیدی بکات و قەیش بەوردی لە مەسەلەکان ناکۆڵێتەوە (بڕوانە باسی لیژنەکانی پەرلەمان لە بەشی حوکمی کەمایەتی). ئەمەش رەخنەی دووەمە کە لە دیموکراسیی راستەوخۆ دەگیرێت. رەخنەکانی تریش بەم شێوەیەن:

١- خەڵکەکە وەك وتمان بڕیار لەسەر یاساکان دەدەن بەلام یاسا دانان ئەمڕۆ ئاسان نییە چونکە پێویستی بە شارەزایییەکی باش هەیە لە رووی قانونی و کۆمەلایەتی و سیاسی و ئابووری و لەرووی مەسەلەکە خۆی، بۆ نموونە پرۆژەی یاسایەك لە بارەی زیادکردنی گومرگ یان باج کە خەڵکی سادە تەنیا سوود یان زیانە راستەوخۆو روالەتییەکەی دەبینن بەلام تەنیا پسپۆڕی ئابووری دەزانێت ئاکامی ئەو یاسایە چی دەبێت. دیاریشە کە ژمارەی پسپۆڕان لە چاو خەڵکی سادەدا ژمارەیەکی زۆر کەمە. لە راستیشدا کێشەی پسپۆڕێتی (یان با بڵێین کەفائەت) نەخۆشییەکە جۆرەکانی تری دیموکراسییش دەگرێتەوە، واتە پەرلەمان بەو ژمارە کەمەی ئەندامانی دووچاری ئەم نەخۆشییە دەبێت چ جای ئەنجوومەنی هاوڵاتییان کە هەزاران کەس لە خۆیدا دەگرێت و کە زۆربەیان خەڵکی سادەن. خەڵکەکەش دەتوانن بڕیار لەسەر مەسەلە گشتییەکان بدەن (بۆ نموونە فڵانە ناوچە سەربەخۆیی وەربگرێت یان نە)بەلام لە مەسەلە وردو ئاڵۆزەکاندا ئەوەیان بۆ ناکرێت.

٢- زۆرجار هەندێك شتی بێ بایەخ سەرنجی خەڵکەکە رادەکێشن، بۆ نموونە لە ناوچەی ئوری Uri لە سویسرادا ئەنجوومەنی گشتیی گەل بڕیاری دا لەسەر کۆمەڵێك یاسای مەدەنی بەبێ ئەوەی کە موناقەشەیەکی وا لە بارەیەوە بکرێت بەلام

موناقەشەیەکی گەرم سازکرا لە بارەی مەسەلەی زیندان یان قەدەغە کردنی سەماکردن لە رۆژانی یەك شەممانداا[٦٢].

٣- دیاریشە کەوا لایەنی ئارەزوو لە حوکمێکی وەهادا زیاتر دەردەکەوێت، بۆ نموونە خەڵکی رازی نابن باج زیاد بکرێت هەتا ئەگەر سوودیشی بۆ هەموو دەوڵەتەکە هەبێت.

هەروەها بە شێوەیەکی ئاسانتر دەتوانرێت کاریگەرێتە سەر ئەنجوومەنکەو دیماگۆگەکان دەتوانن بە ئاسانی حەماس و سۆزی خەڵك بوروژێنن و بەم جۆرە زۆر یاسا دڵگەرمی خەڵکەکە رەفزی دەکات و زۆری تریش هەر دڵگەرمی و سۆز پەسەندیان دەکات.

٤- پرۆژەی یاساکانیش کە دەکەونە بەردەم ئەنجوومەنکە یەك بە یەك موناقەشە ناکرێن بەڵکو بە (جوملە) بڕیاری لەسەر دەدات یان رەفزی دەکات.

٥- هەرچەندە ئەم شێوە دیموکراسییە دەیەوێت زیاترین ژمارەی خەڵك بەشداری حوکم بکەن بەڵام لە بواری قەزایی و بەجێهێنانیدا پەکی دەکەوێت و ناچار دەبێت ئەم دوو بوارە تەسلیمی ژمارەیەکی کەمی هاوڵاتیان بکات.

٦- لەبەر ئەوەی کە بڕیار دان لەسەر یاساکان بە شێوەیەکی ئاشکرایە واتە ئەندامەکە دەست بەرز دەکاتەوە یان بە (بەڵێ) یان بە (نەخێر) بڕیاری خۆی بدات، ئەندامەکان دەترسن ئەگەر بڕیارەکەیان لەگەڵ هی خەڵکەکە یان هی دەسەڵاتداران نەگونجێت ئەمەش ئازادیی بڕیاردان کەم دەکاتەوە.

لە سویسراشدا تێبینی کراوە کەوا پیاوانی ئایینی و فەرمانبەرەکان و دەوڵەمەندەکان کارێکی گەورەیان هەیە لەسەر بڕیاردان لەسەر یاساکان چونکە خەڵکەکە رەچاوی بەرژەوەندیی ئەوان دەکەن.

---

[٦٢] دکتۆر محمد کامل لیلة، النظم السیاسیة، الدولة والحکومة، ل٥٠٨.

٧- سوكرات و ئەفلاتوونیش رەخنەیان لەم حوكمە (یان دیموكراسیی خۆی) گرتبوو چونكە دەبێتە هۆی ململانـەی حزبایەتی و پارچە پارچە كردنی گەلو دروست بوونی ناثارامی، هەروەها لەبەر ئەوەی هەر هاولاتییەك تەمەنی بگاتە بیست ساڵ بۆی هەیە ببێتە فەرمانبەر یان قازی یان ئەفسەر ئەمەش بووە هۆی دۆڕانی (ئەثینا) بەرامبەر دوژمنەكانی و رووخانی دەوڵەتەكەی. سوكرات هەروەها دەڵێت كەوا خەتیبی (واتە خطابة) لە كۆمارە كۆنەكاندا سەروەر بوو، هەموو شتێك لە دەستی گەل دا بووە، گەلیش لە ناو دەستی خەتیبەكاندا بوو[٦٤].

٨- رەخنەیەكی تریش تایبەتە بە چەسپاندنی ئەو شێوە دیموكراسییەتە لە (ئەثینا)دا كە گوایە ئەم شێوەیە بۆ ئەوە دانراوە كە هەموو خەڵك لە حوكمدا بەشدار بن بەلام دەبینرێت كەوا مەسەلەكە جۆرێكی ترە. لە ئەثینادا تەنیا نێرینە ئازادەكان مافی بەشدار بوونیان هەبوو واتە ئافرەت و كۆیلە دوور خرابوونەوە، دیاریشە كە ژمارەی ئافرەتان بەلای كەمەوە نیوەی ژمارەی پیاوان بوون (ئەگەر زۆرتر نەبوو بن). كۆیلەكانیش ژمارەیەكی زۆر بوون، دەشوترێت كەوا ژمارەیان (١٥٠) هەزار كەس بوو (لەسەرجەمی چوار سەد هەزار كەسی ئەثینا)[٦٥] مرۆڤە ئازادەكانیش قەد زۆرینەی خەڵكی هیچ كۆمەڵگەیەكی یۆنانیان پێك نەدەهێنا[٦٦].

جگە لەمانەش بێگانەكان مافی بەشدار بوونیان نەبوو. واتە هەتا ئەگەر باوك و دایكی ئەو كەسە لە ئەثینادا لە دایك بوونایە ئەو كەسە بە هاولاتی ئەثینی نەدەژمێررا

---

[٦٤] سەبارەت بە رەخنەكانی سوكرات بڕوانە: د. عبدالحمید متولی، الوجیز في النظریات...، ل٢٥، سەبارەت بەو رەخنانەی كە ئارستەی ئەم شێوەیەی دیموكراسیی كراون بڕوانە: سەرچاوەی سەرەوە، ل٥٠٦ بەدواوە، هەروەها دكتور طعیمة الجرف، نظریة الدولة..، ل٢٥٨، هەروەها رۆبەرت مەكئایڤەر، تكوین الدولة، ل٢٠٨-٢٠٩.

[٦٥] لیلاند دوایت بۆڵدوین، الدیمقراطیة أمل الإنسانیة الأكبر، ل١١.

[66] H. Laski, Op. Cit., p. 78.

چونکە بە رەگەز (یان بە خوێن) ئەثینی نییە[66]. لەم جۆرەش هەزاران کەسی وەها هەبوون[68].

بەم شێوەیەش لە سەرجەمی (٤٠٠)هەزار کەسی ئەثینا تەنیا (٤٠) هەزار هاوڵاتیی هەبوون کە مافی بەشدار بوونیان هەبوو[69]. واتە ئەو مافە هی تەنها ١٠٪ی خەڵکەکە بوو هەرچەندە وتراوە کە ڕێژەکە لەمەش کەمترە واتە ٣٪[70].

٩- بەڵام مەسەلەکە لێرەدا ناوەستێ چونکە لەو (٤٠) هەزار کەسە تەنیا سێ یان چوار هەزار کەس بەشدارییان دەکرد ئەویش لە قەرەباڵغترین کۆبوونەوەدا[71].

واتە هاوڵاتییان کەمتەرخەم بوون لە بەشداریی کردن لە کۆبوونەوەکاندا (یان لەسەردەمی نوێدا دیاردەی بەشداری نەکردن لە دەنگداندا هەیە) ئەمەش بە مەرجێك کە هاوڵاتییان بە زۆری کۆیلەکانیان دەخستە کار بۆ بژێوی خۆیان واتە هاوڵاتییان (متفرغ) بوون بۆ سیاسەت ((سێ هەزار هاوڵاتیی کە سەد هەزار کۆیلە کاریان بۆ دەکردن))[72] لە چەسپاندنی نوێتری ئەم دیموکراسییەشدا، (مەبەستمان لە سویسرادا) ئەم دیاردەیە هەروەها هەبووە. لە ناوچە سویسرییەکاندا هەندێك کەسی تەنیا لەو کاتەدا ئامادە دەبن کە مەسەلە باسکراوەکان بایەخیان هەبێت لایان.[73] دوایی تریشو لە باسی (سلبییەتی گەلدا) زیاتر لەمە دەدوێین.

---

دکتۆر ابراهیم درویش، الدولة...، ل٢٨٩.

[68] ر. مەکئایڤەر، تکوین الدولة، ل٢٠٨ وتراویشە کە ژمارەکەیان (٤٠) هەزار کەس بوو بڕوانە: بۆڵدوین، سەرچاوەی سەرەوە، ل٤٤.

[69] م. دیڤرجێ، النظم السیاسیة، ل١٨.

[70] A. V. Wynen Thomas, Op. Cit, p. 82, n. 31.

[71] م. دیڤرجێ، النظم السیاسیة، ل١٨.

[72] Ch. Blitzer, Democracy, Op. Cit; p. 522.

[73] Jean Boulouis, Local Government as a Basis and Training in Democracy, International Social Science Bulletin, Vol. 5, no. 1, p. 36.

١٠ چ له ئەثینای کۆن و چ لە سویسرادا ئەوانەی کە بەڕاستی لە ئەنجوومەندا حوکم دەکەن چەند کەسێکی کەمن کە پێشەوایەتیی زۆرینەکە دەکەن واتە حوکم لە دەست کەمایەتیدایە.

لەبەر ئەم هۆیانە ئەم دیموکراسییە پشت گوێ خراوە، بۆیە وەك مەکئایفەر دەڵێت ئەم حوکمە زیاتر لە نووسینەکاندا ناوبانگی هەیە وەك لەوەی لە مێژوودا پیادە کرابێت و جگە لە (ئەثینا)دا. زۆر بە دەگمەن لە یۆنانی کۆندا بینراوە[٧١]. لە فەرەنساشدا -پاش شۆڕشی ١٧٨٩- ویسترا ئەم جۆرە حوکمە بهێنرێتە دی بەلام فەشەلی هێناو خستیانە ئەولاوە. ئەوەش دەمێنێتەوە بڵێین کەوا ئەو ئازادییە فەردییانەی کە لە دیموکراسییەتی نوێدا باسیان دەکرێت لە ئەثینادا وجودیان نەبوو چونکە دەوڵەت بە تەواوی دەسەڵاتی بەسەر تاکە کەسەکاندا هەبوو، ئازادی ئایینیش نەبوو بەڵکو ئایینی رەسمی دەوڵەت ئایینی هەموو تاکە کەسەکان بوو، تەنانەت ئازادیی موڵکایەتیش لە ژێر رەحمەتی دەوڵەتدا بوو، دەوڵەتیش لە هەندێك حاڵەتدا دەستی دەگرت بەسەر خشڵی ئافرەتان یان جلو بەرگی تایبەتی بەسەر خەڵکدا دەسەپاند[٧٥]. دەشتوانرا بە بێ رەزامەندیی خەڵکو بەبێ دادگایی کردن هەرکەسێك بێت نەفی بکرێت لە وڵات بە تۆمەتی ئەوەی کە تەماعی لە حوکم هەیە[٧٦]. سەیریش ئەوەیە کە ئەوەندەی لەو سەردەمەدا باسی ئازادی کراوەو بانگەشەی بۆ دەکرا لە هیچ سەردەمێکی تردا باسی نەکراوەو بانگەشەی بۆ نەدەکرا[٧٧]. لە راستیشدا ئەو ئازادییەی ئەوان باسیان دەکرد لە (یەکسانی)یەوە وەرگیرابوو، واتە تاکە کەسەکە بە ئازاد لە قەڵەم دەدرا ئەگەر دەوڵەت

---

[٧١] رۆبەرت مەکئایفەر، تکوین الدولة، ل٢٠٨.

[٧٥] دکتۆر ابراهیم درویش، الدولة نظریتها، تنظیمها، ل٢٨٩.

[٧٦] دکتۆر عبدالحمید متولی، الوجیز في النظریات...، ل٢٠.

[٧٧] بڕوانە دکتۆر عبدالحمید متولی، الوجیز...، ل٢٢، پەراوێز (١). (قسەی دوگی Duguit ی زانای فەرەنسی).

وەکو خەڵکی تر رەفتاری لەگەڵ بکات و جیاوازی لە مامەڵەدا نەبێت هەتا ئەگەر ئەو رەفتارەش زوڵم بوایە[78]. ئەو ئازادییەش کە بانگەشەی بۆ دەکرا ئازادیی تاکەکان نەبوو بەڵکو ئازادیی گەل بەرامبەر بە حاکمەکانی و ئازادیی لەو کاتەدا واتای ئەوە بوو گەل حوکم بکات و مل کەچی ستەمکار نەبێت....

کەواتە ئازادی لەم شێوە دیموکراسییەدا سنووردارە، ئەگەر راستیشمان بوێت ئەم سنوور دانانە بۆ ئازادیی فەردی زیاتر گونجاوترە بۆ دیموکراسیی چونکە وەك دوایی لە باسی (ئازادییە فەردییەکان)دا بۆمان روون دەبێتەوە ناڕێکی هەیە لە نێوان دیموکراسیی و ئازادیی و بۆ ئەوەی دیموکراسیی شایەنی ناوەکەی بێت پێویستە سنوور بۆ ئازادییە فەردییەکان دابنێت.

لە لایەکی تریشەوە بینیمان کە ئەم شێوەیەی دیموکراسیی (جگە لە هەموو عەیبەکانی تری) حوکمی هەموو گەل نییە چونکە هەموو گەل مافی بەشدار بوونی نییە، ئەوانەش کە مافی بەشدار بوونیان هەیە هەموویان بەشداری ناکەن (لەبەر کەمتەرخەمی) و لە کۆتاییدا لە ناو ئەنجوومەنەکە (کە ئیتر ژمارەیەکی کەمی خەڵکی تیادا دەمێنێتەوە) کەمایەتییەك دروست بێت کە زۆرینەکە ئاراستە دەکەن و پێشەوایەتییان دەکەن.

لەبەر ئەمانەش هەڵە نییە ئەگەر بووترێت کە باس کردنی ئەو شێوە حوکمە گوایە حوکمێکی گەلەو لە رێی گەلەوە کار بکات تەنیا قسەیە و هیچ راستییەکی تیا نییە[79].

ئەمەش بەسە وەك رەخنەیەکی کوشندە کە ئاراستەی دیموکراسیی بکرێت چونکە ئەم شێوە حوکمە پوختترین شێوەی دیموکراسییە و نزیکترینیانە لە بنەماکانی دیموکراسیی... بۆیە خوێنەر بۆی هەیە بپرسێت: ئەی دەبێت شێوەکانی تر چۆن بن؟!.

---

[78] دکتۆر عبدالحمید متولی، الوجیز فی النظریات...، ل٢١-٢٢.

[79] مۆریس دیڤرجێ، النظم السیاسیة، ل٨.

## دووەم: دیموکراسیی نیوە راستەوخۆ

### (الدیمقراطیة شبه المباشرة):

زانیمان کەوا دیموکراسیی راستەخۆ ئەوەیە کە گەل راستەوخۆ بڕیار لەسەر یاساکان بداتو فەرمانبەرەکان هەڵبژێرێت، بەڵام ئەگەر گەل دەسەڵاتی خۆی بخاتە دەستی نوێنەرەکانی ئەو کاتە دیموکراسیی نوێنەرایەتی (الدیمقراطیة النیابیة) پەیدا دەبێت.

وتیشمان لەبەر ئەوەی کە دیموکراسیی نوێنەرایەتی بەشداری کردنێکی کەمتری خەڵکی تێدایە لە حوکم دا... (دیموکراسیی نیوە راستەوخۆ) هەیە وەك چارەسەرێکی ئەمە. لەم جۆرە دیموکراسییەشدا بە پاڵ پەرلەمان چەند ئیجرائێك دانراوە تا خەڵکەکە راستەوخۆ بڕیار لەسەر شتەکان بدەن ئەو ئیجرائاتانەش ئەمانەن (مەرجیش نییە نیزامی حوکم هەموویان پێکەوە پیادە بکات):

١- ئستفتاء(ریفرەندوم) Refrendum:

بۆ نموونە پرۆژەی یاسایەك دەخرێتە بەردەم گەل ئەویش بڕیاری رازی بوونی دەدات یان رەفزی دەکات[٨٠].

٢- ئیعتراز: ژمارەیەك لە ناخبەکان[٨١] (کە دەستوور ژمارەی ئەم ناخبانە دەستنیشان دەکات) ئیعتراز دەکەن لەسەر یاسایەك، یاساکەش دەخرێتە بەردەم خەڵك بۆ ئیستفتاءکردن لەسەری.

---

[٨٠] جۆرێکی ئستفتاء پێی دەوترێت پلێبسایت یان پلێبیسیت Plebiscite کە لە بارەی یەکێك لە دوو شتە: یەکەمیان (شێوەی حکومەت) بۆ شەرعییەت دان بە حوکم. دووەمیش (سنوورەکانی دەوڵەت) وەك ئیستفتاء لەسەر لکاندنی ناوچەیەك بە وڵاتەکە.. بڕوانە: Electoral Processes, Encycl. Britannica, Micropaedia, Knowledge in Depth, p. 532.

[٨١] ناخبەکان Electors: ئەوانەن کە مافی بەشداری کردنیان هەیە لە هەڵبژاردنەکاندا لە کاتێکدا دەنگ دەر ئەو ناخبەیە کە لە رۆژی هەڵبژاردنەکاندا دەنگ دەدات.

٣- پێشنیار (دەستپێشکەری) Initiative ژمارەیەك ناخب پێشنیاری یاسایەك دەکەن‌و پێشکەش بە پەرلەمانی دەکەن.

٤- مافی ناخبەکان لە لابردنی نوێنەرەکانیان (حق الأقالة) Rllace: ژمارەیەك ناخب رازی نین لە ئەندامێکی پەرلەمان (یان هەر فەرمانبەرێك کە بە هەڵبژاردن کارەکەی دەست کەوتووە)و دلوای لابردنی دەکەن. پاش ئەم داوایە هەڵبژاردن دەکرێت‌و ئەگەر ئەو کەسە سەرکەوت ئەوە دەبێتە هەڵبژاردنێکی نوێ بۆی‌و لە جێگەی خۆیدا دەمێنێتەوە ئەوانەش کە داوایان کردبوو کە لابرێت دەبێت مەسرەفی هەڵبژاردنەکە بدەن.

٥- هەڵوەشاندنەوە (حق الحل الشعبي): ژمارەیەك ناخب دلوای هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان دەکەن. ئەم داوایەش دەخرێتە بەردەم گەل‌و بە ئستفتاء بڕیاری لەسەر دەدرێت.

٦- لابردنی سەرۆك کۆمار: کە ئەویش وەکو لابردنی نوێنەرە (ژمارە ٤).

دەستووری وڵاتیش خۆی بڕیار دەدات چەند لەم ئیجرائاتانە وەربگیرێن[82].

ئەم جۆرە حوکمە پاش جەنگی دووەمی‌جیهانی رەواجی پەیدلکرد لە زۆر لە وڵاتانی ئەوروپا[83] بەڵام دوایی حکومەتەکان وازیان لیٚ هێنا[84]،نموونەیەکیش لەسەر ئەم جۆرە حوکمە دەستووری هەندێك لەوێلایەتەکانی ئەمەریکا(چونکە هەر وولایەتێك دەستوورێکی تایبەتی خۆی هەیە بەپاڵ دەستووری هەموو دەوڵەتەکە).

لایەنە باشەکانی ئەم ئیجرائاتانە چەند شتێکن وەك:

١- نزیکترە لە دیموکراسیی چونکە بەشدارکردنێکی زیاتری تیایە لەلایەن خەڵکەوە لە حوکمدا.

٢- رێگایەکە بۆ کەمکردنی ئستبدادی پەرلەمان.

---

[82] بڕوانە: دکتۆر محمد کامل لیلة، النظم السیاسیة، ل٥١. بەدواوە. دەستووریش بریتییە لە یاسای باڵای وڵات (یاسای ئەساس)و دەبێت هەر بڕیارێك یان یاسایەك.. هتد لەگەڵیدا رێك بێت.

[83] سەرچاوەی سەرووەرە،ل ٥١٠.

[84] بەپێی ج. بیردۆ، بڕوانە د. طعیمة الجرف،نظریة الدولة...،ل ٤٠٥.

٢- دەسەلاتی حزبەکان بەسەر خەلکدا کەم دەکاتەوە [٨٥].

ئەمەش جگە لە چەند تایبەتییەکی تر ، بەلام هەروەها ئەم رەخنانەشی لێ دەگیرێت:

١- خەلکەکە ئەوەندەی ئەندامانی پەرلەمان شارەزا نین بۆیە ناتوانن بریاری عەقلی لەسەر مەسەلەکان بدەن، زۆربەی مەسەلەکانیش ئالۆزن وپێویستیان بە پسپوری(تخصص)هەیە.

٢- موناقەشاتی پێویست روو نادات بویە بریاری کرج وکال دەردەچن.

٣- لەبەر ئەوەی ژمارەی ناخبەکان زۆرە تەنیا ئەوەیان بۆ دەکرێت کەلەسەر وەرەقە بنووسن(بەلێ) یان (نەخێر) ولتە ناتوانن چارەسەرێکو بریارێکی وردو دوورو درێژ بدەن چونکە ناکرێت دەیانو سەدان هەزار وەرەقەی ئاوا بخوێنرێنەوەو جیا بکرینەوە...هتد.

٤- لایەنە حزبییەکان بە هۆی پروپاگەندەوە دەتوانن کار بکەنە سەر خەلکو بریاری هەلەیان پێ بدەن.

٥- چەن رێگرێك هەیە بۆ ئەوەی ئەم ئیجراناتانە بینە شتێکی ناعەمەلی، بۆ نموونە دەبێت ئیمزای ژمارەیەکی زۆری خەلکی کۆبکرینەوە تا بتوانرێت پێشنیارێك پێشکەش بکرێت (بۆ نموونە پێنج یەکی ژمارەی ناخبەکان) کە ئەمەش پێویستی بە هەلمەتێکی گەورەیە.

٦- کەم خەلك بایەخ بەم ئیجراناتانە دەدەنو ژمارەی بەشداربووان تیایاندا نیوەی ژمارەی ئەولەنەی کە لەهەلبژاردندا بەشداری دەکەن [٨٦].

٧- پێویستە بەرپرسیاری (مسئولية) هەبێت بۆ موحاسەبەکردنی بەلام بەهۆی بەشدار کردنی خەلکەوە بەرپرسیاری(مسئولية) وون دەبێت لە نێوان خەلکەکەو پەرلەمان.

---

[٨٥] د. محمد كامل ليلة، النظم السياسية، ل ٥٢٣.

[٨٦] هارۆلد لاسکی، اصول السياسة، ج ٣، ل ٣٩. لاسکی بەپێی وەرگێرانی عەرەبی باسی (تستفتاء پێشنیار) دەکات بەلام وا بزانین لە ئەسلی کتێبەکەدا مەبەستی لە هەموو ئیجرائاتەکەیە.

جگە لەوەش ئەم جۆرە بۆ هەندێك مەسەلەی گرنگ بەكار نایەت كە گرنگترین كار دەوڵەتن وەك بودجەی وڵات وپەیمان لەگەڵ وڵاتان و باج و مەسەلەی ئەحكامی عورفی ،هەروەها ئەو یاسایانەی كە پەرلەمان بەپێویستی دەزانێت كە بەپەلە بڕیاریان لەسەر بدرێت[٨٧]. بۆیە تەنانەت لە حاڵەتە هەرەگونجاوەكانیشدا ئەم جۆرە لەتەنیا چەند مەسەلەیەكدا بەكاردێت[٨٨]. بەم شێوەیە ئەم جۆرە دیموكراسییە:

١- حوكمێكی عەمەلی نییە.

٢- مەبەست لێی ئەوەبوو كە گەل حاكم بێت بەڵام لێرەشدا هەر وەكو دیموكراسیی راستەوخۆ حاكمی راستەقینە گەل نییە مەگەر لە شتێكی كەم دا نەبێت. هەرچەندە زۆر كەسیش هەبوون كە دیفاعیان لەم جۆرە دەكرد بەتایبەتی ئیستفتاء بەڵام دەركەوت كە ئەم حوكمە هیوایەك بوو لەجێگەی خۆیدا نەبوو[٨٩].

## سێیەم: دیموكراسیی قەیسەری

ئەم جۆرە بەدیموكراتی نازانرێت بۆیە ئێمەش لەسەری نارۆین بەڵكو هەر ئەوەندە دەڵێین كە ئەم جۆرە بە پێچەوانەی فیكرە لەبارەیەوە جۆرێكی دیموكراتییە ئەگەر بەتەواوی بچەسپێنرێت چونكە مادەم گەل سەروەریی و دەسەڵاتی بەو كەسە سپاردووە و لە كارەكانی رازییە كەواتا گەل حوكم دەكات، ئینجا چ جیاوازییەك هەیە بۆ حوكمی گەل نێوان ئەوەی گەل سەروەریی بە یەك كەس بسپێرێت و ئەوەی بە پەرلەمانێكی بسپێرێت؟ بێگومان جیاوازی هەیە بەڵام لە كرۆكدا یەك شتن چونكە لە هەردووكیاندا پێسپاردن

---

[٨٧] د. محمد كامل ليلة، النظم السياسية، ل٥١٥–٥١٦.

[88] Coker and Rodee, Representation, Op. Cit, p. 312.

[٨٩] بڕوانە: ئێدوارد بێرنز، افكار فی صراع، ل١٤ لەبارەی هەموو ئەم جۆرانەی دیموكراسیی یە بڕوانە: Ch. Blitzer,Democracy,Op. Cit,P527. هەرچەندە (بلیتزەر) بەناوی (راستەوخۆ) ناوی دەبات.

(تفويض)هەیە، هەرچی جیاوازی تریش هەبێت یان ئەوەیە جەوهەری نین یان لە کاتی چەسپاندندا زۆر لە ئەهەمییەتیان لە دەست دەدەن.

# چوارەم: دیموکراسیی نوێنەرایەتی
# (الدیمقراطیة النیابیة)

ئەگەر دیموکراسیی لە دوو شێوەی (راستەوخۆ)و (نیوە راستەوخۆ) ئاوا ناتەواو بێت ئەی دەبێت حالّی دیموکراسیی نوێنەرایەتی- کەلەو دووانە دوورترە لە دیموکراسیی-چۆن بێت؟ دەتوانین هەر لێرەدا کۆتایی بەباسەکانمان بهێنین بەلاّم بەردەوام دەبین تا راستی زیاترمان بۆ دەربکەوێت. ناچار بوونیش بە دیموکراسیی نوێنەرایەتیو دوورکەوتن لە دوو جۆرەکەی تر کە دیموکراتی ترن بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە دیموکراسیی عەمەلی نییە، واتە بۆ ئەوەی کە حوکمێکی عەمەلیتر دابمەزرێنین دەبێت ئەو حوکمە کەمتر دیموکراتی بێتو پەنا بردنە بەر دیموکراسیی نوێنەرایەتی یەکێکە لەو بەلگانەی کە حوکم لە جیهاندا بەرەو نادیموکراسیی دەچێت نەك بەپێچەوانەوە، دواییش بەلگە زیاتر دەبینین لێرەشەوە کتێبەکەمان شێوازێکی تر وەردەگرێتو لێرەوە بەدواوە باسی بنەماکانی دیموکراسیی دەکەینو لە روانگەی بنەماکانەوە رەخنە لە دیموکراسیی نوێنەرایەتی دەگرین هەرچەندە جارویار دوو جۆرەکەی پێشووش دێنەوە ناو باسەکان.

# بەشی دووەم

# بنەماکانی دیموکراسیی

بینیمان چۆن پێناسەیەکی وا نییە بۆ دیموکراسیی کە هەمووان لەسەری رێك بن، بەهەمان شێوەش و لەمەسەلەی بنەماکانی دیموکراسییدا نارێککەوتنێکی ئاوا نێوان بیرباریان دەبینین.

دکتۆر(عبدالحمید متولی) پێنج بنەما بۆ دیموکراسیی رۆژئاوای ئەم سەردەمە دەهێنێتەوەو کە جیاوازن لەوانەی دیموکراسیی کۆنی یۆنان:

## ١-بنەمای سەروەریی میللەت ( مبدأ سیادة الامة )*

ئەم بنەمایە وەڵامی ئەو پرسیارەیە کە دەڵێت: کێ خاوەنی سەروەرییە، واتە کێ خاوەنی دەسەڵاتە؟ بەپێی ئەم بنەمایە هەموو هاوڵاتییان خاوەنی دەسەڵاتن نەك کەسێك بەتەنها یان تاقمێك یان چینێك...تا.

## ٢- بنەمای حکومەتی نوێنەرایەتی ( مبدأ الحکومة النیابیة )؛

ئەمەش کە جیای دەکاتەوە لە دیموکراسییەکەی یۆنان، واتە لە جیاتی ئەوەی وەکو جاران هاوڵاتیان هەموویان کۆببنەوەو بڕیار لەسەر یاساکان بدەنو فەرمانبەران

* وشەی(امة) بەرامبەری (Nation)ە، واتە نەتەوە بەڵام لەبەر تێکەڵ نەبوون لەگەڵ (نەتەوایەتی)دا وشەی (میللەت)مان بەکار هێناوە.

هەڵبژێرن ئەمجارە هاوڵاتیان نوێنەری خۆیان هەڵدەبژێرن. بەم شێوەیە گەل راستەوخۆ حوکم ناکات بەڵکو نوێنەرەکانیان بەناوی ئەوانەوە حوکم دەکەن. ئەمەش کە لەمەفهوومی نوێنەرایەتی(التمثیل)ەوە وەرگیراوە.

## ٣-بنەمای جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان (مبدأ فصل السلطات):

ئەوەش کە پێشتر باسمان کردبوو وکە رێگە دەگرێت لەبەردەم کۆبوونەوەی دەسەڵاتەکان لەدەستی یەك دەزگا یان لەدەستی یەك کەسدا.

## ٤-بنەمای بالاّیی دەستوور (مبدأ علو الدستور):

کە هەروەها پێی دەوترێت(شەرعییەت) یان (سەروەریی یاسا).

دەستوور ژمارەیەك یاسایە کەباسی لە دەسەڵاتەکانی ئەو دەوڵەتەو چۆنێتی دابەشکردنی و هەندێك مافو ئەرکی تێدایە...تاد. دەکەن بەکورتیش دەستوور بریتییە لە یاسای بالاّ یاخود یاسای ئەساسیی دەوڵەت. ئەم دەستوورەش دەبێت لەسەرووی هەموو یاساو بریارێك بێت.

## ٥- بنەمای مافەکانی تاکە کەسەکان( مافە فەردییەکان ) یاخود بنەمای ئازادییە گشتییەکان ( مبدأ الحقوق الفردية/الحريات العامة )؛

کەبریتییە لە ئازادیی بیرو باوەڕو ئایینو قسەکردنو کۆبوونەوەو ڕۆژنامەگەری ...تاد[90]. دیارە ئەم دەستنیشان کردنەی بنەماکانی دیموکراسییش لەژێر کارێگەری قوتابخانەی یاسایی، کلاسیکی بووە. لەلایەکی ترەوە زانای دەستورناسی ناودار (جۆرج ڤیدیل G.Vedel) لە نوسراوێکی نوێیدا چوار یاسای باسکردووە لە دیموکراسیی نوێیی ئەورووپادا: هەبوونی سەرۆکێکی دەسەڵاتی بەجێهێنان کە لە لایەن خەڵکەوە دڵنراوەو لە بەردەمیدا بەرپرسیارە، هەبوونی پەرلەمانێك کە جێگەی زۆرینەیەکی دڵسۆزی راستگۆیە (......)، ئازادییە گشتییەکان، دەوڵەتی قانونی[91]. بنەمای سێیەمو چوارەم لەگەڵ بنەمای چوارەمو پێنجەمی سەرەوە یەکدەگرنەوە، بنەمای یەکەمو دووەمی ڤیدیلیش چەسپاندنی.بنەمای حکومەتی نوێنەرایەتین. (ئۆستن ڕەنی)ی ئەمەریکیش چوار بنەمای تر دادەنێت:

١-سەروەریی گەل: کە بنەماکانی خوارەوە ئەنجامی ئەوەن.

٢- یەکسانیی سیاسی لەنێوان ئەندامانی کومەڵگەدا.

٣- شوورای گەل: واتە بزانرێت گەل چ سیاسەتێکی دەوێتو جێبەجێکردنی ئەو سیاسەتە.

٤- حوکمی زۆرینە (حكم الأغلبية[92])

یەکێکی تریش سێ بنەمای سەرەکی دەستنیشان دەکات:

---

[90] دکتۆر عبد الحمید متولی، الوجيز في النظريات.. ،ل١٧٣ بەدواوە.

[91] Denis Jeambar, Les vrais Pouvoirs du President, Le Point, 1179, 22/4/1995, p. 54.

[92] ئۆستن ڕەنی، سياسة الحكم، ج١، ل٢٦٢ بەدواوە.

١- هەڵبژاردنی ئازاد.

٢- فرە حزبی.

٣- ئازادیی مەدەنیو سیاسی[93]

لەلایەکی ترەوە زۆر لــە سۆشیالیستەکان هــەبوونی یەکسانیی ئـابووری بــە بنەمایەکی دیموکراسیی دەزانن‌و دەڵێن کە دیموکراسیی تەنها دیموکراسیی سیاسی نییــە بەڵکو پێویستە هەروەها دیموکراسیی ئابووری بێت. بنەماکانی سەرەوە لە هەندێك شـتدا یەکدەگرنەوە بەڵام هێشتا جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوانیاندا، ئەوەندەش نموونــە بەســە تابزانین کە بیریــاران چــەند نـاڕێکن لـەنێوان خۆیـاندا لـەبارەی بنــەماکانی دیموکراسیی. ئێمەش بۆ ئاسان کردنی لێکۆڵینەوەکەمان ئەو پێنج بنەمایە وەردەگرین کە دکتـۆر (عبـد الحمید متولی) باسی کردبوون، جگە لەوەی کە ئەم دەست نیشان کردنە زۆر لە بنەماکان لە خۆیدا کۆ دەکاتەوە.

93- Ch. Blitzer,Democracy,Op. Cit. ,p. 523.

# یەکەم- بنەمای سەروەریی گەل.

ڕەنگە زۆر کەس لەسەر ئەوە ڕێك بن کـە ئەمـە گرنگـترین بنـەمای دیموکراسـییە. لێرەدا دوو زاراوە هــەن کــە هــەر یــەکێکیان واتایــەك دەدات: یەکــەمیان(ســەروەریی میللەت)ە، دووەمیشیان (سەروەریی گەل)[94]ە. چەند جیاوازییـەکیش هەیـە لـەنێوان ئـەم دووانەدا، یەکێك لەوانە ئەوەیە کە لە یەکـەمیاندا مـافی دەنگدان(وظیفـة)ە واتـە میللـەت دەتوانێت بڕیار بدات کێ بۆی هەیە لەدەنگداندا بەشداری بکات لە کاتێکدا لە دووەمیـاندا دەنگدان (ماف)ە واتــە بـۆ هـەموو کەسێکە[95]. ئەمـەش ئەنجامێکـە بـۆ جیـاوازیی نێـوان (سەروەریی گـەل) کـە تیـایدا هـەر کەسێك بەشـێکی ئـەم سـەروەرییەی هەیـە بـەڵام لـە (سەروەریی میللەت) دا (سەروەریی) قابیلی بەشکردنو جیاکردن نییە[96]. جیاوازی تریش هەن نێوان ئەم دوو سەروەرییە بەڵام چونکە ئەم موناقەشەیە بۆتە شتێکی کۆنو ئـەوەی ئەمڕۆ هەیە(سەروەریی گەل)ە ئێمەش لەوە زیاتر لەسەری ناڕۆین. ڕەخنەی زۆریـش لـەم بنەمایە گیراوە کە ئەمە کورتەکەیانە:

١- مەرج نییە ئەگەر ئەم بنەمایە هەبێت دیموکراسیی پەیدا ببێت چونکـە بنەماکـە هەروەها لەگـەڵ ئـەو حوکمانەشدا دەگونجێـت کـە پێیـان دەوترێـت دیکتـاتۆری ئـەویش ئەگەر گەل ڕەزامەندیی خۆی بە حکومەتەکە بەخشیبێت. ئەم ڕەخنەیەش بۆ خۆی بەسە بۆ ئەوەی پایەیەکی گەورەی دیموکراسیی بڕوخێنێت.

---

[94] ر. بیللو، المواطن والدولة، ل ٢١.

[95] دکتۆر طعیمة للجرف، نظریة الدولة، ل٢٩٢.

[96] دکتۆر محمد کامل لیلة، النظم السیاسیة، ل٢١١.

٢- ئەم بنەمایە کە لە ئەسڵدا دژ بەستەمی پادشایان بەرزکرابووەوە رێگە لە ستەم ناگرێت بەلام ئەم جارە ستەمەکە بەناوی گەلەوەیە[٩٧].

٣- ئەم بنەمایە مەترسیی هەیە لەسەر ئازادیی: زانای فەرەنسی بارتێلومی Barthelemy دەڵێت کەوا ئەم بنەمایە هانی هەلگرانی دەدات کە خواستی میللەت بە خواستێکی رەوا بزانن، واتە ئەم خواستە هەمیشە راستیو دادپەروەری پیشان دەدات، بەم پێیەش هەر بریارێك لەم میللەتەوە دەربچێت بریارێکی راستە هەر لەبەر ئەوەی کە لە میللەتەوە دەرچووە، ئەنجامیش ئەوەیە کە گەل (یان نوێنەرانی گەل) هەموو دەسەلاتەکان بخاتە دەستی خۆی کە ئەمەش ئستبدادە[٩٨]. بەپێی مامۆستایەکی فەرەنسیش: ئەم بنەمایە خەلکی خستە سەر رێگە ترسناکەکەی خۆسەپاندنی پەرلەمانی[٩٩] ئەویش چونکە پەرلەمان نوێنەری گەلە، ئەو گەلەی کە هەموو کارو بریارو بیرکردنەوەی راستو دادپەروەرن. رەخنەکانی ئێمەش لە خوارەوەدا بۆ ئەم بنەمایە شێوەیەکی تر وەردەگرن:

**یەکەم**- سەرەتا دەپرسین: ئایا بەراستی شتێك هەیە پێی بووترێت (سەروەر یی گەل) ؟ ئایا لە دیموکراسییدا گەل بەراستی سەروەرە ؟ بیریارانی رۆژئاوا دان بەوەدا دەنێن کەوا لە دیموکراسییدا ((حوکمی گەل)) وجودی نییە بەڵکو ئەوان((رازین)) کە زۆرینە حوکم بکات بۆیە دەبینین کە هەندێکیان (حوکمی زۆرینە) نەك (حوکمی گەل) دەکەنە بنەمایەکی دیموکراسیی. ئێمە دەڵێین کە ئەوان ((رازین)) چونکە خۆیان بۆیان دەرکەوتووە کە تەنانەت(حوکمی زۆرینە) ش وجودی نییە. ئەوان دەزانن کە ئەوەی هەیە (حوکمی کەمایەتی) یە نەك (حوکمی گەل)و نەك (حوکمی زۆرینە). دوایی ئەوەمان بۆ

---

[٩٧] دکتۆر عبد الحمید متولی، الوجیز فی النظریات....، ل١٨٢، لەوە ناچێت نووسەر جیابکاتەوە نێوان دوو جۆرە سەروەرییەکە.

[٩٨] دکتۆر عبد الحمید متولی، الوجیز فی النظریات....ل ١٨٥.

[٩٩] سەرچاوەی سەرەوە، ل١٨٦ پەراوێز.

روون دەبێتەوە بەڵام با ئێستا چەند شایەتییەکی بانگخوازانی دیموکراسیی لەسەر ئەم ڕاستییە بهێنینەوە:

١-جان جاك ڕوسۆ– کە یەکێکە لە((پێغەمبەرانی)) دیموکراسیی – دەڵێت کە قەد دیموکراسییەکی ڕاست نەبووەو قەد نابێت چونکە سروشتی شتەکان قەد بەو جۆرە نییە کە زۆرینە سەروەریی بکاتو کەمینە مل کەچ بێت

٢- زانای ئەمەریکی (مەکنایفەر) دەڵێت:

ڕاستی ئەوەیە کە زۆرینە حوکم ناگرنە دەستو هەموو گەل حوکم ناکات بەڵکو هەمیشە کەمایەتی حوکم دەکات[101]. بۆیە دەڵێت: دیموکراسییواتای حوکمی زۆرینە یان حوکمی جەماوەر نادات[102]

٣- (مۆریس دیڤرجێ)ی زانای فەرەنسیش دەڵێت کە باسکردنی ((حکومەتی گەل ولە ڕێگەی گەلەوە)) قسەیەکی هیچەو هیچ واتایکی تێدا نییە چونکە لە شارە یۆنانی وڕۆمانییەکانو لە ناوچەی سویسریەکاندا کاروبارەکانی وڵات هەمیشە لە لایەن کۆمەڵێك کەسەوە بەڕێوە دەبران کە ئەمانە فەرمانڕەوای ڕاستەقینەن[103] ئەمەش لە(دیموکراسیی ڕاستەوخۆ) واتە پوختترین شێوەی دیموکراسیی.

٤- دیموکراسیخوازێکی عەرەبیش دەڵێت: کە خۆ حوکم کردن (الحکم الذاتی) تەنها بەناو دیموکراتیەو ڕای زاڵ لەم حوکمەدا ڕای کەسایەتییە تایبەتییەکانە(واتە: کەمایەتی) نەك ڕای جەماوەر[104]. دیارە لەبەر ئەم دەسەڵاتەی کەمایەتی وتراوە کە هەر

---

[100] ڕوسۆ، فی العقد الاجتماعی، ل ١١٨–١١٩.

[101] ر. مەکنایفەر، تکوین الدولة، ل١٨٧.

[102] سەرچاوەی سەرەوە، ل٢٤٧.

[103] مۆریس دیڤرجێ، النظم السیاسیة، ل٨.

[104] نقولا حداد الدیمقراطیة سیرها ومصیرها، ل ١٠٢.

هەولێك بۆ دەست نیشـان كردنی ئاغا یـان سـەروەر (السید) كـارێكی زەحمەتـە[105] واتـە زەحمەتە بزانین سەروەر گەلە یان پەرلەمانە، یان فەرمانڕەوایە...هتد.

**دووەم**- بـا بشـڵێین كـەوا حوكمـی دیموكراتـی حوكمـی زۆرینـەیـە، بـەڵكو وەكـو خاترانە با بڵێین كە حوكمی هەموو گەلـە.. ئایا رای خـەڵك هەمیشـە راسـتە تـا بیكەینـە پێوانە؟ ئێستاش لە وەڵامی ئەم پرسیارەوە دەست پێ دەكەین.

# گەل و پێوانەی راستی

ئەگـەر بتوانـین ئـەوە بسـەلمێنین كـە گـەل (یـان هیـچ نـەبێت زۆرینـەی گـەل) هەمیشە(یان هیچ نەبێت زۆربەی كات) لەسەر هەقە ئەو كاتە دەتوانین باوەڕ بە حوكمـی گەل[106] بكەینو هەنگاو هەڵبنێین بەرەو بەدەست كەوتنی ئەو حوكمە. بەڵام ئەگەر خوێنـەر بەئارام بێتو پەلە نەكات لەخوارەوەدا چەندین نموونـەی بـۆ دەهێنینـەوە كـە واقـع ئـەو قسە باوە بەدرۆ دەخاتەوە كە دەڵێت (گـەل هەمیشـە لەسـەر هەقـە) یـان (دەنگی گـەل لەدەنگی خودلوەیە). ئەمەش كە بیریارانی رۆژئاوا خۆیان بە درۆی دەخەنەوە.

وتمان كە بەناوی میللەتو گەلەوە ستەمكارییەك دەكرێـت كـە وەكـو سـتەمكاریی دیكتاتۆرەكانە... فەیلەسووفی بەریتانیش (بێرتراند ڕەسڵ) دەڵێت كـە ئـەو كەسـەی كـە بـاوەڕی وایـە دەنگی گـەل دەنگی خودایـە دەگاتـە ئـەو ئەنجامـەی كـە هـەر جـۆرە بیركردنەوەیەكی نائاسایی جۆرێكە لە بێباوەڕیو پێویستە وەكو یـاخی بوونێك تەماشـا بكرێت... بۆیە ڕەسڵ دیفاع لە هەبوونی ئازادیی دەكات، دەشڵێت كەوا كۆمەڵگەیـەك كـە هەموو كەسێكی بریتییە لە كۆیلە(مەبەستی لە دیموكراسیی كە ئازادیی تێدا نییە) كەمێك

---

[105] هـ. لاسكی، اصول السیاسة، ج١،ل١٠٠.

[106] دەڵێـین حوكمـی گـەل نـەك(دیموكراسـیی) چونكـە سـەلماندنی ئـەوەی كـە گـەل لەسـەر هەقەئامانگەیەنێتە دیموكراسیی بەتەنیا بەڵكو هەروەها دەمانگەیەنێتە حوكمی تاكەكەس یان كەمایەتی ئەگەر گەل لێیان رازی بێت.

باشترە لە کۆمەڵگەیەک کە تیایدا هەموو کەسێک کۆیلەیە بۆ ئاغایەک[107]. واتە باوەڕ هێنان بە گەل وەک پێوانەی ڕاستی گەل دەکاتە دیکتاتۆرێک، گەلەکە هەر خۆشی کۆیلەیە.

ئەگەر بڵێین (گەل هەمیشە ڕاستە)ئەو کاتە گەل دەست دەداتە ستەمکاری‌و ئێمەش دەبێت ئیعتراف بکەین کەوا ئەم ستەمە شتێکی باشەچونکە گەل کردوویەتی. کاتی خۆشی بنەمای (ئیرادەی گەل) لە یۆناندا مافێکی بە گەلەکە بەخشی بەڵام گەلەکە ئەم مافەی بەکار هێنا بۆ لە سێدارەدانی مەزنترین پیاوانی گەلەکە یان دەرکردنیان لەشارەکە[108]، کە یەکێک لەوانە(سوکرات)ی فەیلەسووفە کە ڕەخنەی لەم بنەمایە گرتبوو[109]. لە ڕۆماشدا(نیرۆن)ی ئیمپراتۆر نموونەیەک بوو بۆ دیکتاتۆریەت لەگەڵ ئەوەشدا مێژوو نوسێکی ئەو سەردەمانەی ڕۆما لە باسکردنی کارەکاتی نیرۆندا بەشێک لە کارەکانی بەباش زانیبوو، یەکێکیش لەو کارانە چەوساندنی نەصرانییەکان‌و بەرپاکردنی قەسابخانە لە دژیان، ئەم قسەیەش نیشانەیە کە ئەم کارەی (نیرۆن) ڕای زۆریەی ڕۆماییەکانی دەردەبڕی[110]. بەم پێیە پێویستە ئەو نەصرانییە دیموکراسییخوازانەی کە بڕوایان بەو (دەنگەی گەل) هەیە دان بەوەدا بنێن کە گەلی ڕۆما لەو کاتەدا لەسەر هەق بووە، هەروەها پێویستە ئەو دیموکراسییخوازانەی کە بانگەشە بۆ یەکسانیی ئافرەت دەکەن دان بەوەدا بنێن کە لە بنای دیموکراتی لەسەر هەق بووە کە هیچ مافێکی سیاسی بە ئافرەتان نەبەخشیبوو.

ئەم ستەمکارییەی زەمانی زووش ئەمڕۆش دەگرێتەوە، وەکو زانای فەرەنسیش دیکی Duitguەڵێت پێویستە بەهێزترین زمانەت دا بنرێن دژی حکومەتەکانی گەل چونکە لەهەموو حکومەتێکی تر زیاتر ڕووەو ئستبداد دەچن‌و وا دەزانن کە

---

[107] ب. ڕەسل، السلطة والفرد، ل٩٩.

[108] مەکنایفر، تكوين الدولة، ل ٢٢٢.

[109] کیلاند دوایت بۆلدوین، الديمقراطية امل الانسانية الاكبر،ل٤٦-٤٧.

[110] دکتۆر البرت بدر لە، مستقبل الديموقراطية ومفاهيمها، ل٣٥٢.

دەسەلاتەکەیان بێ سنووروو قەیدە[111]. هەر لە سەدەی نۆزدەیشەوە بیریارانی فەرەنسی(سان سیمۆن) و(ئۆگوست کۆنت) باسی ئەوەیان کردبوو کە دیموکراسیی تەنها ئەوەیە کە لە جیاتی (سەروەریی پادشایان) (سەروەریی گەل)هەیەو بەبێ زیادکردنی شتێك کە رێگە لە ئستبدادی ئەم دەسەلاتەی گەل بگرێت[112].

ئەو شتەی کە هەوڵدرا لە ئستبدادی ڕێبازی دیموکراتی کەم بکاتەوە بریتییە لە(ئازادیی)و لەم بوارەدا دەوری بینیوە بەلام ئەم چارەسەر ە هەموو شتێك نییە چونکە دەرکەوتووە کە ئازادیی راستەقینە تەنها ئازادیی هەندێك کەسو دەزگاو هێزە، ئەمەش کە دولیی لەبەشی(ئازادیی) دا بەدوورودرێژی لەسەری دەڕۆین.

ئەنجامێکی بنەمای(زۆرینە لەسەر هەقە) وەك (ڕەسڵ) دەڵێت ئەوەیە کە مرۆڤ رێز لە خۆی نەگرێت چونکە ئەگەر هەموو خەڵك وا بزانن کە رای زۆرینە یان رای حکومەت هەڵە ناکات گەشەسەندنی رەوشتو عەقڵ دەبێتە شتێکی(موستەحیل[113]).

بەڵگەیەکی تر لەسەر هەڵەی ئەم بنەمایە ئەوەیە کە بەزۆری ئارەزووو هەست خەڵك دەبزوێنێت نەك عەقڵ. ئەو کارانەش کە ئارەزووەکان دەجوڵێنن زیاتر شایەنی ئەوەن کە خەڵکی بەدەمیانەوە بچێتو سەرنجیان رابکێشێت لەچاو ئەو کارانەی کە سەرنجی عەقڵ رادەکێشن[114].

زۆر ئاسانیشە کە ساختەچیو درۆزن خەڵك بخەڵەتێنێت، دەشڵێن کە(پەتی درۆ کورتە) کەچی دەبینین ئەگەر ژمارەیەك خەڵك لەو درۆزنە دووردەکونەوە ئەوا ژمارەیەکی تر هەر لەدەوریدا دەمێننەوە هەندێك لەبەر بەرژەوەندیو زۆریان لەبەر((ئارەزوو)) واتە ئارەزوویان لەگەڵ ئەو درۆزنەدا هەیە. نموونەیەکی تریش لەسەر

---

[111] دکتور محمد کامل لیلة، النظم السیاسیة، ل ١٩٨بەرلاویز.

[112] دکتور طعیمة الجرف، نظریة الدولة، ل٢٩٧.

[113] ب. رەسڵ، السلطة والفرد، ل٩٨.

[114] سبرێل جۆد، الحریة فی القرن العشرین، ل ١١٥.

کاری ئـارەزوو ئەوەیـە کـە سیاسییەکان و زاناکـان... کـەمتر نـاودارن لای خـەڵك لـەچاو هونەرمەندان و وەرزشەوانان.. گەورەترین زانا بمرێـت تەنـها سـتوونێکی بچووکـی دەسـت دەکەوێت لەرۆژنامەکاندا بەڵام ((ئارەزوو وەرووژێنەران)) زۆریان لەسەر دەوترێت و مردنیان بە زیانێکی گەورە دەزانرێت دەشزانین کـە سـوودی زانـا چـەندە لـەکاتێکدا زۆر لەوانـەی بەخۆیان دەڵێن((هونەرمەند)) زیان بەولاوە هیچی تریان نییە بۆ خەڵك.

ئارەزوو تەنانەت چاوی خەڵك کوێر دەکـات لـەو شـتانەی کـە جێگـەی مەترسـین. لێرەدا دیاردەیەك وەك نموونە دەهێنینەوە ئەویش کە (دیووی) باسی دەکات و دەڵێت کە خەڵکی چیـتر لـە کۆمپانیـا ئیحتیکارییـەکان ناترسن بـەڵکو جێگـەی شـانازییە لایـان[115].

ئەمەش بەمـەرجێك کـە مەترسییەکانی ئـەو کومپانیایانـە زۆرن، هـۆی شـانازی کردنیـش دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی کـە لـە کارەکانیـاندا ((سـەرکەوتوو))ن، مرۆڤیـش – بەتایبـەتی مرۆڤی ئەمەریکی– هەمیشە موعجیبی کـاری سـەرکەوتوو وگەورەیـە، سـەرکەوتووش لای ئەوان ئەو کەسەیە کـە پـارەو ناوبـانگی هـەبێت بەتایبـەتیش یەکـەمیان. ئەگـەر گـەلیش هەمیشـە لەسـەر هـەق بێـت کەواتـە ئـەم بـۆ چوونـەی گـەلی ئـەمریکی سـەبارەت بـەو کۆمپانیایانە راستە.

هۆیەکی تر بۆ ئـەوەی کـە(زۆرینـە) نەکرێتەپێوانـەی راسـتی ئەوەیـە کـە خـەڵکی چاکەی لەیاد دەچێت. (ئەلفرید سۆڤی) ی فەڕەنسی دەڵێت کەوا خەڵکی چاکـەیان لـەیاد دەچێت و ئەو حوکمەی کە لەسەر پیشەوایان دەیدەن حسابی ئەو خزمەتـەی دەکـات کـە ئێستاو دوا رۆژ پێشکەشی دەکەن(بێ ئاوڕدانەوە لە رابوردووی پڕ خزمـەت) دەشـڵێت کـە ئەمە تەجروبە پڕ ئازارەکەی کلیمانسـۆ (لەفەرەنسـادا) سـاڵی ۱۹۱۹ داو پاشـان چێرچڵ ودوایی دیگۆل لە سـاڵی ۱۹٤٥–۱۹٤٦[116] دەشـتوانین (جـۆرج بـوش) ی ئەمـەریکی زیـاد

[115] جۆن دیووی، الفردیة قدیماوحدیثا، ل ۳٥

[116] ئە. سۆڤی، الرأی العام، ل ۲۹. چێرچل کە سەرکردایەتی بەریتانیای کرد لە جەنگی دووەمی جیهاندا پاش جەنگ لە هەڵبژاردندا سەرنەکەوت و حوکمی نەدرا بەدەستەوە، دیگۆلیش هەروا دەستی لەکار

بکەین کە ساڵی ١٩٩٢ بەرامبەر (کلنتۆن) بەزی هەرچەندە(بوش) سەرکەوتنێکی گەورەو بە کەمترین زیانی بەخشی بە ئەمەریکییەکان لە جەنگی دووەمی کەنداودا. یەکێك لە هۆکانی ئەم بەزینانە ئەوەیە وەك وتمان ئارەزوو جوولێنەری خەڵکە، هۆیەکی تریش ئەوەیە کە خەڵك زوو شتیان لەیاد دەچێت[117]، ئەگەر ئەم دوو هۆیەش کۆ بکەیتەوە بۆت روون دەبێتەوە بۆچی بەشێکی ئەو خەڵکەی کە قسە بە سیاسی درۆزن دەڵێن هەر خۆیان پاش ماوەیەك دەنگی بۆ دەدەن، یان ئەوەی ئەمڕۆ خزمەتیان دەکات سبەینێ ئەگەر ئەمەی بۆ نەکرا لەبەر چاویاندا نرخی کەم دەبێتەوە.

خەڵکەکەش زۆربەی کات کە دەنگ بۆ کەسێك دەدەن تەماشا تایبەتییە(شخصی) یەکانی ئەو کەسە دەکەن(لاسکی)باس ئەوە دەکات چۆن پاڵێوراوی وا هەیە لە هەڵبژاردندا سەردەکەوێت چونکە بەباشی دەزانێت (گتیار) بەکاری بهێنێت[118]. بەهەر حاڵ ئەمە حاڵەتە هەرە(شان)ە کەیە، حاڵەتی غەیری ئەوەش هەیە وەکو دەنگدان بۆ(دوایت ئایزنهاوەر) بۆ سەرۆکایەتیی ئەمەریکا. (ئایزنهاوەر) سەرکردەی لەشکرەکانی بەرەی رۆژئاوای ئەورووپا بوو ئەویش لەجەنگی دووەم دژی ئەڵمانیا. لەهەڵبژاردنەکەدا ژمارەیەکی زۆری ئەمەریکییەکان ساڵی (١٩٥٦) دەنگیان بۆ (ئایزنهاوەر) دا نەك لەبەر بەرنامە سیاسییەکەی بەڵکو لەبەر ئەوەی کە (ئایك) Ikeیان خۆشدەوێت[119]. ئەم دیاردەیەش لەئەمەریکادا دەردەکەوێت زیاتر وەك لە ئەورووپا[120]. بەڵام ئەورووپا لەمە بێبەش نییەو وەك (جۆد) دەڵێت کە سیاسەتمەدارێکی ناودار پێی ووت کە لە

لەکار کێشایەوە بە ئومێدی ئەوەی گەل داوای بکات بەڵام گەل داوای نەکردو بۆ ١٢ ساڵ دوور بوو لە حوکم.

[117] مۆریس دیڤرجێ، النظم السیاسیة، ل٦٠.

[118] هـ. لاسکی، الدیمقراطیة الامریکیة، ل١٨١.

[119] ئۆستن رەنی،سیاسة الحکم،ج١،ل٣٥٢،(ئایك)نازناوی خۆشەویستییە بۆ (ئایزنهاوەر).

[120] سەرچاوەی سەرەوە،ل٤٧٢.

هەڵبژاردنــەكانی ئینگلتــەرای (١٩١٨)دا بــەزی بەرامبــەر نەیارەكــەی چونكــە ئــەویان وابەناوبانك بوو كە لە جەنگدا بە دەمانچەیەك شەش ئەڵمانیی كوشتبوو، هەروەها مێردی ئەكتەرێكە كە لای جەماوەر خۆشەویستە[٢١].

ئەمانە هەمووی نموونەن لەسەر كاری (ئارەزوو) لەسەر خەڵكو دەیسەلمێنن كــەوا وتەی (گەل هەمیشە راستە) وتەیەكی ناراستە، كۆمەڵە نموونــەی تریـش هــەن ئــەوانیش لەبارەی نــەزانی لــەناو گــەلدا بــەڵام بــەر لــەوەی نموونــەكان بهێنینــەوە بــا وەڵامــی ئــەو رەخنەیەی كە رەنگە لێمان بگیرێت كە گوایە ئەمە(رەشبینییە) و(بەكەم زانینــی گەلــە).. تاد وەڵامەكەش بەكورتی ئەمەیە:

١– پێویستە ئێمە بزانین واقع چی دەڵێتو دانی پیادا بنێین نــەك شــوێنی خــەیاڵ بكەوین. بیریارانی رۆژئاواش خۆیان ئەم واقعەیان ناسیوە.

٢– بۆیە چارەسەری ئەوان بریتییە لە فێركردنو پەروەردەكردنی گەلە، ئێمــەش بڕوامان بەوە هەیە بەڵام لەوەڵامی ئەو پرسیارەدا لە یەكتر جیادەبینەوە: فێركردنی چیو پەروەردەی چی؟

مەبەستی ئێمەش بەم شێوەیە دوو شتە:

١– سەلماندنی ئەوەی كە ئارەزووو نەزانی بڕیارەكانی گەل دەشێوێنی بۆیە گــەل نابێتە پێوانەی راستی.

٢– گەل پێویستی بە فێركردن وپەروەردەیەكی وایە كە بەسەر ئەو ئارەزووو ئەو نەزانییە سەربكەوێت.

بەڵام با ئاگاداری یەك راستی بین: دەتوانین پەروەردەی میللەت بكەین كە شوێنی ئارەزوو نەكەوێت هەرچەندە ئەمە كارێكە ماندووبوونێكی زۆری پێویستە بەڵام چارەســەر كردنی نەزانی زەحمەت ترە چونكە حوكم كردن پێویستی بە شارەزایی‌و پسپۆڕی هەیــە. ئێستاش با چەند نموونەیەك لەسەر نەزانی بهێنینەوە:

---

[٢١] سیریل جۆد، الحریە فی القرن العشرین، ل ١١٥.

سەرەتا دەڵێین کەوا لە رۆژئاواداو لە هەموو شوێنێکی تردا خەڵکی دەنگدەدەن بۆ پاڵێوراوانو بۆ حزبەکان بەبێ ئەوەی کە بەرنامەی حزبەکە (یاخود بەرنامەی هەڵبژاردن- البرنامج الانتخابي) بەتەواوی بزانن. ئەوان تەنها چەند خاڵێکی لێ دەزانن، ئەوانیش بە زۆری ئەو خاڵانەی کە پەیوەندییەکی راستەو خۆیان هەیە بە خۆیانەوە. (بارتێلومی) دەڵێت: ئەوانەی کە لە بەرنامەی حزبەکان تێدەگەن زۆر کەمن (کەمایەتین)، بەڵام کەمێك لەم کەمایەتییە دەتوانن رای خۆیان دەربڕن لەبارەی چارەسەرکردنی ئەو کێشانە کە بەرنامەکە باسیان دەکات[122].

دەنگدەران بڕیار لەسەر هەندێك مەسەلە دەدەن غەیری ئەوەش تەنها ئەوەیە خەڵکەکە مەیلیان بۆ ئەم حزب یان ئەو حزب یان پاڵێورلو هەیە. نەبوونی کەفائەتیش لای خەڵك وای لە مێژوو ناسو فەیلەسووفی فەرەنسی ئێرنست رێنان (١٨٢٣-١٨٩٢) کرد- هەرچەندە دیموکراسییخوازە- خەفەت بخوات کە دەنگدانی گشتی فەیلەسووف یان زاناو نەخوێنەوار یەکسان دەکات[123]. نموونەیەکی تر لەسەر بێئاگایی گەل یان با بڵێین دیاردەیەکی ترسناکی تر بریتییە لە نهێنی لەکاری حکومیدا. واتە زۆر لەکاری حکومەتو پەرلەمان بە نهێنیدەکرێنو خەڵك بێ ئاگایە لێیان. گەلێکی بێئاگاش لەم کارانە بڕیارەکانی ناتەواونو بەمە نابێتە(پێوانەی راستی).

یەکێك لەو بوارانەی کە گەل بێئاگایە لێیان،بواری سیاسەی دەرەوەیە(لیدەرەر)نموونەی زۆر دەهێنێتەوە لە کتێبەکەی (میللەتی مەر- أمة من غنم) A Nation of Sheep (سەرەتای شەستەکانی ئەم سەدەیە) بەڵکو کتێبەکە لە راستیدا بە زۆری بۆ ئەم مەسەلەیە تەرخان کراوە. (لیدەرەر) دەڵێت:کەمی زانیاری گەل لەبارەی کاروباری نێو دەوڵەتی ئەم گەلەی کردە میللەتێکی مەڕ ئاسا چونکە ئەوان رازین بەچەند چارەسەرێك کە ئاسان بیارنو لەسەرچاوەیەکەوە دێن کە بەرواڵەت لەوان

---

[122] دکتور عبد الحمید متولی، الوجیز...، ل٢٤٩.

[123] گ. بوتول، سوسیولوجیا السیاسة، ل١٦٥.

زاناتره[124]. نموونەش زۆر دەهێنینەوە. یەکێك لەوانە وڵاتی (چین) کە راستی لە بارەیەوە نـازانرێت بـەهۆی حکومـەتی ئەمەریکیـەوە، هـەروەها بـەهۆی دەزگاکـانی راگـەیاندن[125]. تەنانەت لێپرسراوانو حکومـەتو کۆنگریسـی ئەمـەریکیش تووشـی چەواشـەکاری دەبـنو باسی چەند نموونەیەك دەکات کە حکومەتەکانی لاوسو تایوان... تولتیبـوو یـان هـەموو ئەمانە بخەڵەتێنن. یەکێك لەوانە ئەوەیە حکومەتی فرمۆزا(تایوان) هەواڵێکی بڵاوکـردەوە لـەبارەی هێرشـێکی سـەربازی چینـی کۆمۆنیسـت لـە کـاتێکدا رووداوەکـە وەك دوایـی دەرکەوت تەنها تەقەکردن بوو لە بەلـەمێکی راوە ماسـی[126]. ئـەوەش بـۆ ئـەوەی تـایوان پارە بکێشێتەوە لە ئەمەریکا.

ئـەزانی پـەیامنێرەکانی دەرەوەی رۆژنامـەکان بـەپاڵ کـاری چەواشـەکاری کـە دەزگاکانی راگەیاندن دەیکەن کارێکی گەورەیان هەیە لەسەر نزم بوونی ئاسـتی سیاسـی جـەماوەر، ئـەم دەزگایانـەش(گێلێتیـی سیاسـی)بڵاودەکەنـەوە. قـەبارەی بچووکـی بابەتیسیاسی بەتایبەتی سیاسەتی نێو دەوڵەتی لە دزگاکانی راگەیاندندا نیشانەیەکە بـۆ ئەمە. (لیدەرەر) دەڵێت کە تەنها ٤٪ ی قەبارەی رۆژنامە تەرخان دەکرێت بـۆ کاروبـاری دەرەوە ((واتە نیمەی خوێنەر تەنها سێ دەقیقە لە رۆژێکدا تەرخان دەکەبن بۆ رووداوە جیهانییەکان))[127] و لێرەشـدا خەڵکەکـە بەشـدارە لـە تاوانەکـە چونکـە حـەز لـە بابــەتی رابواردن دەکەن زیاتر لە بابەتی سیاسی.(لیدەرەر) دەڵێت کە خەڵك رۆژنامـە بۆ بابـەتی رابواردنو ئابرووچونەکان دەخوێننەوە[128] و رەخنە لە قسەی ئەو سەر نووسەرە دەگرێـت

[124] ولیەم لیدەرەر، أمة من غنم، ل٤.

[125] سەرچاوەی سەرەوە،ل٥٨.

[126] ولیەم لیدەرەر، أمة من غنم، ل١٢٧–١٢٨.

[127] ولیەم لیدەرەر، أمة من غنم، ل١٢٦.

[128] سەرچاوەی سەرەوە، ل١٥٦، ئەم قسەیەی لیدەرەر لەباسی ئازادیدا بەدوورو درێژی دەهێنینەوە.

که دەڵێت کەوا ناتوانێت فەبارەیەکی زۆری رۆژنامەکە بۆ هەواڵەکانی دەرەوە تەرخان بکات چونکە خوێنەرەکانی بابەتە هەزەلییەکان لا باشترە[129].

هەر لە بارەی ئەمەشەوە سیناتۆرێکی ئەمەریکی دەڵێت: هەرچەندە ژمارەی تەلەفزیۆن و رادیۆ لە ئەمەریکا زۆرترە لەچاو ولاتان بەڵام زانیارییەکانی ئەمەریکییەکان لەزانیاریی ولاتانی تر کەمترە[130]. نموونەیەکی تری نەزانی لە ئەمەریکادا لێکۆڵینەوەی سوپای ئەمەریکی لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا کە دەریانخست کەوا نزیکی نیوەی گەلی ئەمەریکا تەمەنی مێشکیان تەمەنی هەرزەکارێکی چواردە ساڵە[131]. نموونەیەکی تر لێکۆڵینەوەی مێژوو نوسێکی ئەمەریکی کە بۆی دەرکەوتووە کەوا ٣٠٪ ی ئەو کەسانەی کە رایان وەرگیراوە ئیعتراف دەکەن کە نە قسەیەکیان بیستووەو نە شتێکیان خوێندۆتەوە لەبارەی مەسەلە گرنگەکانی دەرەوەی ولات، ئەمانەش ((بێ ئاگاکانن))، ئاگادارەکانیش کە رێژەکەیان ٤٥٪ە هەندێك شت بە تەمو مژاوی دەزانن، زاناکانیش (٢٥٪)ن و کە زانیارییەکانیان خراپ نین، مێژوو نووسەکە دەڵێت: بەڵام پێویست ناکات زۆر بە قووڵی ورد بێتەوە تا بزانیت کەوا زانیارییەکانی ئەم (٢٥٪) ە کە زاناکان پێك دەهێنن زانیارییەکی ورد نییە[132].

(ستوتزل) و(جیراپ) یش کە ئەم قسە دەهێننەوە و دەڵێن کە وەزع لە ئەوروپادا بەهەمان جۆرەو دەڵێن کەوا ئەمانەن ئەو کەسانەی کە داوایان لێ دەکرێت رای خۆیان دەربڕن لەبارەی دەزگاکانی ئەوروپا یان سیاسەتی ئەمەریکا[133].

---

[129] سەرچاوەی سەرەوە، ل١٣٤.

[130] ه. شیللەر، المتلاعبون بالعقول، ل٢١٨.

[131] ئێ. بیرنز، افکار فی صراع، ل ٣٠.

[132] جان ستوتزل وئالان جیرار، استطلاع الرأی العام،ل١٥.

[133] سەرچاوەی سەرەوە.

نموونەی تر زۆرن، یەکێك لەوانە ئەوەیە کە (بێرتراند ڕەسڵ) لەبارەی خەڵەتاندنی گەل سەبارەت بەچەکی ئەتۆمی دەیهێنێتەوەو دەڵێت کە پیاوە سیاسییەکان‌و ڕۆژنامەگەری کۆششی ئەوە دەدەن کە خەڵکی هیچ نەزانن لەبارەی هەوڵەکانی زانایان لەبارەی وەستان دژی مەترسیی ئەتۆمی[١٣٤]، ئەویش بۆ ئەوەی ڕۆژئاوا بەردەوام بێت لەسەر تاقیکردنەوەی ئەتۆمی‌و پێش وڵاتە کۆمۆنیستەکان بکەوێت.

نموونەیەکی فەرەنسیش لەسەر بێ ئاگایی ئەوەیە کە فەرەنساییەکان تەنانەت لەمێژووی خۆشیان بێ ئاگان، ئەویش کە بە پێی ڕاپرسییەك دەرکەوت کەوا ٦٢٪ ی فەرەنسییەکان نازانن ساڵی چەند(لویسی شانزەیەم)لە سێدارەدرا[١٣٥]. بەمەرجێك ئەم ڕووداوە یەکێکە لە ڕووداوە گرنگەکانی شۆڕشی فەرەنسی‌و کە ئەم شۆڕشە گرنگترین ڕووداوی مێژووی فەرەنسییەو یەکێکە لەو ڕووداوانەی کە کارێکی گەورەیان کردۆتە سەر مێژووی نوێی جیهان.

بیریارانی ڕۆژئاوا هەستیان بەم نەزانی‌و شوێنکەوتنی ئارەزوو لەلایەن گەلەوە کردووە بۆیە هەندێکیان بە ڕاشکاوی باسی هیچو پوچێتی (ناخب) دەکەن. بیریارو ڕۆماننوسی ئینگلیزی هـ. ج. وێڵز(١٨٦٦–١٩٤٦)داوای حکومەتێکی کردبوو کە لە زاناو پسپۆڕ پێکهاتبێت‌و ڕەخنەی لە دیموکراسیی گرتبوو چونکە(ناخب) ی ئاسایی هیچوو پووچ ونەزانە[١٣٦]. فەیلەسووفو ئەدیبی بەریتانیش (بێرناردشۆ)(١٨٥٦–١٩٥٠) باسی ((پیاوی ئاسایی))ی کردبوو کە دەیەوێت بیرو باوەڕەکانی بەئامادەیی دەست بکەوێت هەر وەکو پێڵاوو جل وبەرگەکانی‌و پێویستی بە ئازادیی نییە بەڵکو بە نیزام...تاد. بۆیە

---

[١٣٤] ب. ڕەسڵ، هل للانسان مستقبل، ل٦٤.

[١٣٥] گۆڤاری الدستور ٥٦٩، ١٩٨٩/١/٢٣،ل٤١.

[١٣٦] سێریل جۆد، الحرية،ل ١١٠.

دەنگدەران دەنگ لەسەر سیاسەتەکان نادەن بەڵکو لەسەر کەسەکان[137]، دیارە هەر ئەگەر ئەمانەش زیندە ڕۆییان کردبێت لەم رەخنانە ئەوا بەڵگە ی بەهێزمان باسکرد لەسەر کەم زانینی خەڵکی.

بەپێی نووسەرێکی فەرەنسیش: لێکۆڵەرەوە ئەمەریکییەکان تۆژینەوەی زۆریان بەئەنجام داوە کە لێنە هاتووی زۆربەی هاولاتیان دەسەلمێنن. لەساڵی ١٩٦٤ داو لەراپرسییەکی دەزگای ناوداری گالوپ Gallup ٣٨٪ ی ئەمەریکییەکان وایان زانیبوو کە یەکیەتی سۆڤییت ئەندامێکی (ناتۆ)بووە[138] !نوسەری ئەم قسەیە هەروەها لەبارەی هاولاتی فەرەنسییەوە پرسیار دەکاتو دەڵێت: ئایا(منطقی)یە هاولاتیی دەنگ بدات بۆ(عمدە) ی کۆمۆنیست (کە چەپرەوە) لەدەنگدانێکی ناوچەیی دا کەچی لە دەنگدانی گشتیدا دەنگ بۆ راسترەوەکان بدات؟ لە خوولی یەکەمی هەڵبژاردندا دەنگ بۆ بەرەی نیشتمانی FN (ئەوپەری راست)بداتو لەخوولی دووەم دەنگ بۆ چەپ بدات؟ نووسەر ئەمە بەزۆری بۆ کارەکانی سیاسییەکان دەگێرێتەوە، هەروەها دیفاع لە هاولاتی دەکات هەرچەندە ناوونیشانی باسەکەی حقیقەتێکی تر نیشان دەدات[139].

(لاسکی) دان بەوەدا دەنێت کە راست نییە داوای رای خەڵکی بکرێت مەگەر بۆ مەسەلە گەورەکان نەبێت[140] (ڕەنی)یش یەکێك لە هۆکانی سەرنەکەوتنی سەرۆکی کۆمار (کانێك روو دەکاتە خەڵك) ئەوەیە کە لە هەموو شتێکی گەورەو بچووکدا بگەرێتەوە بۆ ئەوان[141].

---

[137] سەرچاوەی سەرەوە،ل١١٣ هەروەها بڕوانە قسەیتر، ل١١١ هەروەها رەخنەی کەسانی تر ل١١٧.

[138] E. Dupin, Electeurs =Imbéciles+Girouettes. L, Evenement du Jeudi, 2-8/5/1996, p. 96.

[139] Ibid وەرگێرانی ناونیشانەکە ئەمەیە(ناخبەکان-گێل+حولحول)

[140] هـ. لاسکی، اصول السیاسة، ج١،ل٨١.

[141] رەنی، سیاسة الحکم، ج٢، ل١٤٩.

نموونەیەکی تر لەسەر ئەوەی کە خەلك پێوانەی راستی نین (سۆڤی) بۆمان دەهێنێتەوە. ساڵی١٩٣٨ لە فەرەنسادا حکومەتی (رینۆ)ژمارەیەك بریاری دابوو. خەڵکیو نەیارەکان نارەزا بوون تەنانەت ئەو راستڕەوانە کە لایەنگری حکومەت بوون دیفاعێکی سستیان لە نەخشەکە دەکرد بەڵام دوایی نەخشەکە سەرکەوت وبەم جۆرە کەمایەتییەکەی کەمی پسپۆران سەلماندیان کە لەسەر هەق بوون هەرچەندە دژ بەرای گشتی بوون[١٤٢]. (سۆڤی)دەڵێت کە تاکە تاوانی (رینۆ)ئەوە بوو کە زۆر جار لەسەر هەق بوو ئەویش بەپێچەوانەی زۆرینەی خەلك[١٤٣].

ئەگەر بمانەوێت باسی ئەم مەسەلەیە بکەین واتە ((خەلکی یان زۆرینەی خەلك هەمیشە لەسەر هەق نینو نابنە پێوانەی راستی)) نموونەی زۆر دەدۆزینەوە بەلام لێرەدا دەوەستینو جارێکی تر دەڵێین کە رەنگە ئەمە بە سووکایەتی کردن بە جەماوەر بزانرێت، رەخنەیەکی وایش هیچ بایەخێکی نییە چونکە پێویستە مەبەستمان گەیشتن بەراستی بێت نەك رازی کردنی ئەمو ئەو.

تا ئێستاش مەبەستەکەمان وەلام دانەوەی ئەو پرسیارەیە بوو کە ئایا رای خەلك پێوانەی راستییە یان نا؟ ئەگەر ناش بۆ چی؟ وەلامەکەش بەس بوو بۆ هەڵتەکاندنی بناغەکانی دیموکراسیی(حوکمی گەل) بەلام ئێمە هەنگاوێکی فراوانتر رووەو راستییەکیتر دەنێین.

---

[١٤٢] ئە. سۆڤی، الرای العام، ل١١١ بەدواوە.

[١٤٣] سەرچاوەی سەرەوە، ل ١٢٠.

# کۆسپەکان لەبەردەم حوکمی گەلدا

سەلماندمان کە هەتا ئەگەر گەل خۆی حوکم بکات ئەوا ئەم حوکمە بۆ خۆی پێوانەی راستی نییە، لێرەشدا دەیسەلمێنین کە لە دیموکراسییدا گەل ئەسڵەن حوکم ناکاتو ئەوەی حوکم دەکات تەنها(کەمایەتی) یە.

حوکمی راستەقینە دەبێت لە هەڵبژاردنەکانەوە دەست پێ بکاتو بە درێژایی ماوەی حوکمی نوێنەرانی گەل بەردەوام بێت تا دەگاتە هەڵبژاردنەکانی داهاتوو. بەلام دیموکراسخوازانی وا هەن کە دان بەوەدا دەنێن کە وا گەل تەنها لە کاتی هەڵبژاردندا حوکم دەکاتو لەوە بەدوا سەروەریی خۆی لە دەست دەدات، لەوەش زیاتر ئەگەر لەمە ورد بینەوە بۆمان دەردەکەوێت کە گەل تەنانەت لەکاتی هەڵبژاردنەکانیشدا حوکم ناکاتو سەروەر نییە.

سەرەتا قسەی (روسۆ)ی یەکێك لە((پێغەمبەرانی)) دیموکراسیی دەهێنینەوە. روسۆ وەك بینیمان دیموکراسیی راستەقینە بە((دیموکراسیی راستەوخۆ))دەزانێت بۆیە لەبارەی((دیموکراسیی نوێنەرایەتی))ی بەریتانیای سەردەمی خۆی دەڵێت کەوا گەلی ئینگلیزی ئازاد نییە تەنیا لەکاتی هەڵبژاردنەکاندا نەبێت، هەر ئەوەندەش هەڵبژاردنەکان تەولو بێن گەل دەبێتە کۆیلە، بەڵکو دەبێتە((هیچ))[144].

(پۆل کلاڤال)ی فەرەنسیش هەروا باسی بەشدار بوونی چالاکانەی هاوڵاتی دەکات کە تەنها لە کاتی هەڵبژاردنەکاندایە"[145].

---

[144] جان جاك روسو، فی العقد الاجتماعی، ل١٥٥.

[145] پۆل کلاڤال، لە: المثقفون والدیمقراطیة،ل ٦٠.

بەلام رەسل هەنگاوێك بەرەو پێشترمان دەبات ودەڵێت كە لە سەرجەم (٢٠) ملیۆن كەس (كە ژمارەی ناخبەكانە) تۆ تەنها یەك كەسیت بۆیە زیاتر هەست دەكەیت كە حوكم كراویت نەك حاكم[١٤٦].

جا با بزانین ئەو كۆسپانە چین كە دێنە بەردەم گەل وڕێگەی حوكم كردنی لێدەگرن:

## كۆسپی یەكەم: گەلەكە خۆی:

پێشتر باسی ئاستی نزمی زانیاریمان كرد كەتایبەتییەكی جەماوەرەوە كە خەڵك بەزۆری شوێنی ئارەزوو دەكەون. لێرەشدا وبەپاڵدوو دەردی (نەزانیو ئارەزوو)سلبیەتی خەڵك زیاد دەكەین بۆ باسەكانمان.

خەڵكەكە مەشغوولی ژیانی خۆیانن بۆیە كەم بایەخ بە سیاسەت دەدەنو كەمتر بایەخ بەوە دەدەن كە كاریان هەبێت لەسەر سیاسەتی وڵاتەكەیانو لە هەمووشی كەمتر ئامادەن كە خۆیان تووشی نارەحەتی بكەن، بێگومان لە هەموو ئەمانەش كەمتر ئامادەن قوربانی بدەن. تەنانەت لەو ماوەی هەرە شۆرشگێرانەشدا كە گەل رادەپەڕێت تەنها بەشێكی گەل ئامادەی قوربانییە ئەویش هەر لەماوەی هەڵچوونەكە. رۆژئاوای ئەمڕۆ زۆر سلبی ترە لە رۆژهەڵات چونكە زۆرتر هۆكانی سلبیەتی پێوە دەبینرێت. بایەخ نەدان بەسیاسەت یەكێكە لە دیاردەكانی سلبیەتی گەل.

لەئەمەریكادا زۆریەی خەڵكەكە بایەخ بەسیاسەت نادەن، زیاتریش هەواڵەكانی ناوخۆ سەرنجیان رادەكێشێت چونكە زیاتر باسی وەرزشو كات بردنە سەریان تێدایە، ئەگەر بێت و بابەتی سیاسی لە تەلەفزیۆندا ببینن هۆكەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لەو

---

[١٤٦] ب، رەسل، السلطة والفرد،ل ١٢٠. رەسل قسەی رەخنەگرانەی تر دەكات وەكو: هەستەكەت بەرامبەر كاروباری سیاسی لەو بارودۆخەدا ئەو هەستە نییە كە دیموكراسیی مەبەستی بوو بێتە كایەوە بەڵكو هەستێكی زۆر نزیكتر لە حوكمێكی دیكتاتۆری ل١٢٠-١٢١.

کاتەدا ڕێکەوتبوو کە تەماشای تەلەفزیۆنیان دەکرد[١٤٧]. ئەمەش هۆیەکە بۆ نەزانی لەبارەی سیاسەتەوە(بەتایبەتی سیاسەتی دەرەوە) کەبابەتی باسەکەی پێشوومان بوو.

(پاتۆفەر)دەڵێت کەوا زۆر دەگمەنە مرۆڤی ئاسایی کە لە پێناوی ئەودا تیۆرو نیزامە دیموکراتییەکان دانراون بایەخ بدات بەو مەسەلانە کە پێویستە شارەزا بێت لە بارەیانەوە. باسی مانگرتنی ڕۆژنامە گەریی نیویۆرکی ساڵی(١٩٦٢) دەکات کە دوایی ڕاپرسییەك کرا کە ئایا دەرنەچوونی ڕۆژنامەکان چەند کاری کردە سەر هاوڵاتیان. لە ئەنجامدا دەرکەوت کە هاوڵاتی ئاسایی گوێ ناداتە دەست نەکەوتنی هەواڵەکان بەڵکو بایەخ دەداتە بەرنامەکانی تەلەفزیۆن و ئیعلاناتی سینەماو لیستەکانی بازاڕی پارەو هەواڵەکانی یارییە وەرزشییەکان...بەم شێوەیەش تیۆری ((خواستی گشتی– الارادة العامة)) بچووك دەبێتەوەو بەسەر چەند کۆمەڵێکی کەمدا دەچەسپێت نەك بەسەر هەموو خەڵکدا[١٤٨].

سەرۆکی ئەمەریکای ئەوسا (وودرۆ ویلسۆن) –بەر لەوەی ببێتە سەرۆك – لە(١٨٨٥) دا نووسیبووی کە کەس گوێ ناداتە یاساداناەن و کە ناتوانرێت سەرنجی هاوڵاتی‌ڕابکێشرێت بۆ شتە وردەکان بەڵکو تەنانەت ناتوانرێت سەرنجیان بۆ بنەما سەرەکییەکانی چۆنێتیی دروست کردنی یاساش ڕابکێشرێت[١٤٩].

نیشانەیەکی تری سلبیەتی هاوڵاتی کە لە هەمان کاتدا هۆیەکە بۆ ئەو سلبیەتە ئەوەیە کە گەل سیاسەت بە گەندەڵی دەزانێت.

---

[١٤٧] تۆ. ڕەنی، قنوات السلطة، ل٨٢، ٨٤، ٨٦.

[١٤٨] سۆل باتۆفەر ،معنی الدیمقراطیة، ل ١٠٤.

[149] W. Wilson. Congressional Government. p. 80.

لە راپرسییەکدا لە ئەمەریکا(ساڵی١٩٤٤) ٦٩٪ی ئەو کەسانەی پرسیاریان لێ کرابوو وتبوویان کە نایانەوێت منداڵەکانیان کاری سیاسی بکەن‌و ١٨٪ وتبوویان کە حەز بەمە دەکەن[١٥٠].

ئەویش چونکە ئەمەریکییەکان باش ناڕواننە سیاسییەکان.

لەبەریتانیاشدا زوو لەسەرەتای سەدەی بیستەوە باسی ئەوە کراوە کە خەڵکەکە چیتر بایەخ بەسیاسەت نادان‌و ناتوانن بەباشی وەکو ساڵی(١٨٧٠)پێشەوا سیاسییەکانیان هەڵبژێرن[١٥١].

# کۆسپی دووەم: باردۆخی سەپێندراو:

هاوڵاتی خۆی لەبەردەم(أمر واقع) ێکدا دەبینێتەوە، باردۆخێکە بەسەریدا سەپێنراوە و ئیمکانیەتی گۆڕینی زۆر کەمە. هەوڵی گۆڕینیشی خەبات‌و قوربانی دەوێت، هاوڵاتیش بۆتە هاوڵاتییەکی سلبی بۆیە ملکەچی واقع دەبێت‌و خۆی لەگەڵیدا دەگونجێنێت.

ئەو واقعە بریتییە لە هەبوونی چەند حزبێک کە هاوڵاتی هیچی بۆ ناکرێت بەرامبەریان‌و دەستیان گرتووە بەسەر گۆڕەپانەکەدا، بواری مانەوەو گەشەسەندنی حزبە بچووکەکانیش زۆر کەمە لە سەردەمێکدا کە داراییەکی گەورە یەکێکە لەمەرجەکانی مانەوەی حزب.

لەلایەکی ترەوە هاوڵاتی نیزامێکی دیاریکراوی پەرلەمان‌و دەسەڵاتی بەجێهێنان دەبینێت کە هەتا ئەگەر ئەم نیزامەشی بەدڵ نەبێت ئەوا ناتوانێت هیچ بکات بۆ گۆڕینی، گۆڕینی ئەندامانی پەرلەمان‌و سەرانی دەسەڵاتی بەجێهێنانیش کەمێک لەمەسەلەکە دەگۆڕێت، بەر پرسیاران لەسەر حوکم لادەچن بەڵام نیزامەکە هەر دەمێنێت.

---

[١٥٠] ئۆ. ڕەنی، سیاسة الحکم، ج١،ل ١١-١٢.

[١٥١] س. جۆد، الحریة...،ل ١١٠ ئەویش قسەی لۆرد(جەیمەس برایس) ە(١٨٣٨-١٩٢٢).

هەروەها چەند هێزێکی گەورەی ئابووری بوونەتەوە سەرچاوەی ژیانی مادیی، دەسەڵاتی هاوڵاتیش بەرامبەریان زۆر کەمترە لە چاو دەسەڵاتی بەرامبەر حکومەت.

پاشان دەزگای راگەیاندنی قەبە چوار دەوریان گرتووەو بیەوێت یان نەیەوێت پێویستە لەگەڵیاندا بگوزەرێت.

لەباسەکانی داهاتوومانداهەموو ئەو هێزانە یەك بەیەك دەخەینە ژێر لێکۆڵینەوەو لێرەدا تەنها چەند ووشەیەك دەڵێین:کاتێك مرۆڤ خۆی لەبەردەم واقعیکدا دەبینێت کە ئەوەندە لە خۆی گەورەترە کە توانای گۆرینی نەبێت ئیتر چۆن بتوانین بڵێین کە مرۆڤ خۆی، خۆی حوکم دەکات؟ هەڵبەتە ئەمە بۆ یەکێك کە بیر بکاتەوە و هەست بکات بەڵام زۆربەی خەڵك نوقمی ئەم واقعەبوونو پێی تلیاکاوی بوون بۆیە خۆیان حوکم ناکەن لەوەش خراپتر ئەوەیە کە هەست بەم راستییە ناکەن.

## کۆسپی سێیەم: حزبایەتی و میراتی و لاسایی کردن:

ئەمە کۆسپێکە کە مرۆڤ دەتوانێت بەشێوەیەکی(نظری) خۆی لیَ دەرباز بکات بەڵام بەشێوەیەکی عەمەلی خۆ دەربازکردن لێی بەو ئاسانییە نییە.

ئەو جۆرە حزبایەتییە ئەوەیە کە مرۆڤ لایەنگری حزبێکە لەبەر ئەوەی کەسوکاری لایەنگیریی دەکەن. لە ئەمەریکادا ¾ ی ناخبەکان دڵسۆزن بۆ یەك لە دوو حزبەکە ئەویش بەهۆی ((میراتییەوە)) بۆیە وەك دەوترێت رابردووی خۆیان پیس ناکەن بەهۆی دەنگدان بۆ حزبەکەی تر، واتە ئەو سیَ چارەکە بڕیاریان نییەو تەنها چارەکەکەی تر بڕیار لەسەر ئەنجامی دەنگدانەکە دەدەن[١٥٢]. ئەمەش کۆسپێکی گەورەیە لەبەردەم(حوکمی گەل) چونکە بڕیاری گەل خۆی لە چارەکی ناخبەکاندا دەبینێتەوە، جا ئەگەر بزانین کە لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی ئەمەریکادا کەمتر لە ٥٠٪ی ناخبەکان

---

[١٥٢] دەیڤید ك، کۆیل،النظام السیاسی فی الولایات المتحدة، ل١١٤ هەروەها: زینكو هاورێیانی، نظام الحكم والسیاسة فی الولایات المتحدة، ل١٦٧ بڵام ئەمانی دوایی ژمارە ناهێننەوە.

دەنگدەدەن دەزانین کە کەمتر لە ١٢٪ ی ناخبەکان لە هەلبژاردندا حوکمی گەل بەدی دەهێنن، ئەگەر حسابی ئەوەش بکەین کە هەموو ئەم ١٢٪ بە بڕیارێکی عەقلانی نادەن لە کاتی دەنگداندا ئەو کاتە رێژەکە زۆر کەمتر دەبێتەوە.

ژن و مێردەکانیش کاریان هەیە لەسەر یەکتر لەمەدا، بۆ نموونە لێکۆڵینەوەیەکی ساڵی(١٩٤٠) لەئەمەریکادا دەریخست کەتەنها ٤. ٥ ٪ ی ژن و مێردەکان جیاوازییان هەبوو لەبارەی پەسەند کردنی پاڵێوراوەکان[153].

ئەم کارەی کەسوکار لەسەر یەکتر بڕیاری نا عەقلانی لێ بە ئەنجام دێت و ئەمە دەبێتە کۆسپێکی گەورە لەبەردەم بەدیهێنانی حوکمی گەل.

## کۆسپی چوارەم: دەستنیشان کردنی پاڵێوراوان (کاندیداکان)

هاولاتی خۆی پاڵێوراوەکە دەست نیشان ناکات بەڵکو حزبەکان ئەمە دەکەن، هاولاتیش تەنها ئەوەی بۆ هەیە دەنگ بۆ پاڵێوراوێك بدات. هیچ کامێکیش لەو پاڵێوراوانە ئەو کەسە نییە کە هاولاتی حەز بکات هەلبژێردرێت[154]. (جۆد)ی بەریتانی دەڵێت کە هاولاتی مافی ئەوەی هەیە کە خراپترین کەس رەفز بکات لەنێوان ئەو پاڵێوراوانەی کە((هەر پێنج ساڵ جارێك لە ئاسمانی مەرکەزیی سەرەکیی حزبەکەیەوە لە (لەندەن) دێنە خوارەوە))[155]

چارەسەرێك بۆ ئەمە بریتییە لە(لیستی کراوە) کە هاولاتی بۆی هەیە خۆی لیستێك پێك بهێنێت واتە ناوێك لە لیستی حزبی (أ)ء ناوێکی تر لەلیستی حزبی(ب)...تاد هەلبژێرێت بەلام ئەم چارەسەرە عەمەلی نییە ئەمەش یەکێکە لە رەخنە هەمیشە دووبارە

---

[153] تۆ. رەنی، سیاسە الحکم،ل ٤٤٧.

[154] J. P. Harris .Elections,Encycl. of the social Sciences,vol. 5. p. 451.

[155] س. جۆد، الحریة.. ، ل ٥٠ سەبارەت بە ئەمەریکاش بڕوانە: کۆیل، النظام السیاسي.. ، ل٩١-٩٣.

بووکان واتە پەسەندکردنی نیزامێکی عەمەلیتر دیموکراسییەکی کەمتر دەبەخشێت.. لە لایەکی تریشەوە رەنگە هێشتا هاولاتی بەهیچ کەسێك لە هیچ لیستێك رازی نەبێت.. ئەی لەم حاڵەتەدا چی بکات؟ بەهەر حاڵ ئەم چارەسەرە کەم‌و کوورت‌و ناعەمەلییە تەنها شێوەیەکی هەڵبژاردن دەگرێتەوە ئەویش (هەڵبژاردن بە لیست) ئەگینا لە (هەڵبژاردنی فەردی) دا کە لەیەك ناوچەدا پێویستە تەنها یەك کەس دەربچێت ئەم چارەسەرە کەڵکی نییە.

لە ئەمەریکادا(کۆنگرەیەگی سیاسی) دەبەسترێت بۆ دەستنیشانکردنی پاڵێوراو بۆ سەرۆك کۆمارو جێگری سەرۆك کۆمار. نوێنەرانی حزبەکە لە هەموو ولاتەکەوە دێن بۆ کۆنگرەکەو لەناو کەش‌و هەوایەکی وروژاو پڕ لە قیژو هوڕ ئەم کارە بەئەنجام دێت. ئەم کەش‌و هەوایەش بۆتە هۆی ئەوەی ناوی (سیرکی هەمەجی) لەو کۆنگرانە بنرێت. ئەم کۆنگرەیەش خزمەتی سیاسییەکان دەکات زیاتر لە خزمەتی ولات[١٥٦] ولە کۆتاییدا گەورەکانی حزب لە پشتی پەروەردەوە بڕیار لەسەر دوو پاڵێوراوەکە دەدەن[١٥٧].

رازی نەبوون بە پاڵێوراو یەکێکە لە هۆکانی ساردبوونەوەی هاولاتی‌لە دەنگدان‌و هۆیەکە بۆ زیاد بوونی سلبیەتەکەی بەرامبەر بەکارو باری ولات.

ئاسانیشە بڵێین کە ئەگەر هاولاتی کەسی بەدڵ نەبێت با خۆی بپاڵێوێت بەڵکو سەربکەوێت‌و بەرنامەی خۆی جێبەجێ بکات بەلام ئەم قسەیە لەرادە بەدەر ساکارە چونکە:

١- هەموو هاولاتییەك نە ئەو بوارەو نە ئەو توانایەی هەیە کە لە سیاسەت کاربکات.

٢- زۆربەی هەرە زۆری هاولاتییان مەسرەفی هەڵبژاردنەکانیان بۆ دابین ناکرێت... ئەمەشیان کۆسپێکی ترە لە رێگەی حوکمی گەلدا کە ئێستا لێی دەدوێین.

---

[156] Rey F. Nichols. It happens every four years. Amercan Heritage. Vol 7. p. 21+33.

[157] دەیڤید کویل، النظام السیاسی، ل ٩٢.

# کۆسپی پێنجەم: مەسرەفەکانی هەڵمەتی هەڵبژاردن.

چەند نموونەیەك لەم بارەیەوە وێنەکەمان بۆ روون دەکەنەوە:

لەهەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی بۆ ساڵی(١٩٥٢)لە ئەمەریکادا دوو حزبە گەورەکە نزیکی سەد ملیۆن دۆلاریان سەرف کردو ساڵی(١٩٦٠) مەسرەفەکە گەشتە(١٦٠)ملیۆن دۆلار[١٥٨]. ئێستاش بۆ دەستپێکردن بە هەڵمەتی هەڵبژاردن پێویستە هەر یەکێك لە پاڵێوراوەکان (٢٠) ملیۆن دۆلاری کۆ کردبێتەوە، ئەمەش پاڵێوراوەکانی تر یان ئەوانەی کە بیر لە خۆ پاڵاوتن دەکەن ناچاریان دەکات پاشەکشێ بکەن چونکە ئەو پارەیان بۆ دابین ناکرێت[١٥٩]. بەر لەوەش‌و بۆ ئەوەی هەر یەکێك رەزامەندیی حزبەکە وەربگرێت لەسەر ئەوەی کە ببێتە پاڵێوراوی حزب پێویستە تا زووە پارەی زۆر پەیدا بکات‌و تا بتوانێت یارمەتی حکومەت وەربگرێت کە دەگاتە شەست ملیۆن دۆلار[١٦٠].

مەسرەفی هەڵبژاردنەکانی ویلایەت‌و شارەکان بەهەمان شێوە مەسرەفی زۆرە، بۆ نموونە ساڵی(١٩٢٩) مەسرەفی‌هەڵبژاردنەکانی شاری (نیویۆرك)زیاتر لەدوو ملیۆن دۆلار

---

[١٥٨] ئێرنست گریفیت، نظام الحکم فی الولایات المتحدة، ل ١٤.

[١٥٩] محمد الرمیحی،گۆڤاری (العربی) ی کوێتی، ژمارە٤٥٥، تشرینی یەکەمی ١٩٩٦، ل ٢٠.

[١٦٠] سەرچاوەی سەرەوە. لە خۆپالاوتن بۆ سەرۆکایەتی لە ریزی (حزبی کۆماری) داو بەپێی ژمارەی٢/١١ی گۆڤاری (تایم)ی ئەمەریکی؛ (بۆب دۆل) تا ئەو کاتە (٢٥) ملیۆن دۆلاری سەرف کردبوو ئەوەندەی نەمابوو بگاتە سنووری (٢٧) ملیۆن دۆلار کە بۆ ئەو کەسە دانراوە کە لەهەڵبژاردنە سەرەتاییەکاندا پارەی حکومەت وەردەگرێت، لە کاتێکدا(فۆربس) لەهەمان حزب پارەی حکومەت وەرناگرێت بۆیە سنوور نییە بۆ ئەو پارەیەی کە دەتوانێت سەرفی بکات .Time.11/3/1996.p 37.

لەم پێشبڕکێی پارە کۆکردنەوەو سەرف کردنیدا کێ دەتوانێت شان لەشانی ئەمانە بدات یان ئومێدی سەرکەوتنی هەبێت ئەگەر پارەی کەمتری هەبێت؟

بووه واتا هەر دەنگێك یەك دۆلارو(٢٦)سەنتی تێ چووە، كەمترین رێژەش لەشاری (سۆلت لەیك) دا بوو ئەویش دە سەنت بۆ یەك دەنگ[١٦١].

لەبەریتانیادا (پەنجاكانی ئەم سەدەیە) دەبوایە هەر پاڵێوراوێك بڕی(١٥٠)پاوەنی بدایە، ئەگەر (١/٨) ی هەموو دەنگەكانیشی دەست نەكەوتایە پارەكەی دەفەوتا[١٦٢]. بۆ دەست كەوتنی ئەو پارەیەش پێویست بوو(لەو سالأنەدا) كرێكار پێنج تا شەش مانگ كار بكات و بەم جۆرە كەم دەرامەتان نەیاندەتوانی خۆیان بپاڵێون[١٦٣].

بەلأم هەتا ئەگەر ئەو پارەیەش دابین بكرێت ئەوا دوو سنووری گەورە هەیە:

١- گرنگ نییە هەڵگری بەرنامەیەك لەیەك ناوچەدا سەربكەوێت بەڵكو پێویستە ئەو حزبە لەسەرانسەری وڵات پاڵێوراوی هەبێت تا ژمارەیەكی زۆری ئەندامانی بنێرێتە پەرلەمان، واتە چەند پاڵێوراوی هەبێت پێویستە ئەوەندە سەدو پەنجا پاوەنی بدات. لەبەر ئەوەش حزبە بچووكەكان ناتوانن پاڵێوراویان هەبێت بۆ هەموو ناوچەكان[١٦٤].

٢-هەتا ئەگەر ئەو پارەیە بۆ پاڵێوراوە زۆرەكانیش دابین بكرێت بەلأم هێشتا مەسرەفەكانی هەڵمەتی هەڵبژاردن دەمێنێتەوە كە بڕێكی زۆر زیاتریان پێویستە[١٦٥].

دوو تیۆری سەرەكی هەیە بۆ هەڵبژاردن كە یەكێكیان هەڵبژاردن بە(وظیفة) دەزانێت واتە هەڵبژاردن مافی هەموو هاوڵاتییەك نییە بەڵكو دەنگدان سنووردارە لەم حاڵەتەشدا مەسرەفەكان كەمتر دەبنەوە چونكە بەشداربووی كەمتر لە دەنگداندا هەیە

---

[161] J. P. Harris. Elections.op. cit. ,p. 454.

[162] The British Parliament,p. 11.

[١٦٣] كريم مسعد، الديمقراطية البريطانية. ل١٦٠-١٦١.

[١٦٤] بڕوانە سەرچاوەی سەرەوە.

[١٦٥] سەبارەت بەسنووردانان بۆ مەسرەف بڕوانە سەرچاوەی خوارەوە. هەرچەندە (ئەو سنووردانانە هەمەل نییە).Electoral Systems.Op. Cit; p. 137.

بەلام چونکە ئەمڕۆ تیۆرەکەی تر پیادە دەکرێتو هەموو هاولاتییەك بۆی هەیە دەنگ بدات پێویست دەکات هەڵمەتێکی گەورەی پڕوپاگندەی هەڵبژاردن هەبێت، ئەمەش مەسرەفێکی زۆرتری پێویستە. بە واتایەکی تر، بۆ ئەوەی گەل بەراستی حوکم بکات پێویستی کرد دەنگدان فراوانتر بکرێت بەلام ئەم فراوانکردنە بووە هۆیەك بۆ زیادکردنی مەسرەفەکانی هەڵبژاردن ئەمەشیان هەندێکی سەرەکییە بۆ ئەوەی گەل لە جاران زیاتر لە حوکم دوور بکەوێتەوە. بەم شێوەیەش دەنگدان ئەو ئومێدە نییە کە خەڵك بەتەمای بوو.

## کۆسپی شەشەم: پڕوپاگندەی هەڵبژاردن
## (الدعايات الانتخابية)

پاش دەستنیشانکردنی پاڵێوراوەکان پڕوپاگندەکان دەست پێ دەکەن.

ئەم پڕوپاگندانەش هاولاتی زیاتر لەجاران گومڕا دەکەنو سەری لێ دەشێوێنن ... راستیو درۆ تێکەڵ بەیەك دەکەن، پەیمانی زۆر دەدرێن و کەمێکیان جێبەجێ دەکرێن.

پاڵێوراوان باسی ئەو شتانە دەکەن کە لای جەماوەر رەغبەتیان هەیەو خۆیان لەو شتانە دوور دەخەنەوە کە کاردانەوەیەکی خراپیان هەیە هەتا ئەگەر ئەو شتانە پێویست بن بۆ ولات. بۆ نموونە ماوەیەکی زۆر بوو پاڵێوراوان لە ئەمەریکادا باسی چارەسەری بوودجەیان دەکرد، بەلام لەهەڵبژاردنەکانی (١٩٩٦)داو لەبەر ئەوەی جەماوەر لەم مەسەلەیە بێزار ببوو، پاڵێوراوان نزیك نەدەکەوتنەوە لێی[١٦٦] لەکاتێکدا کێشەی بوودجە گەورەترین کێشەی ئابووری ئەمەریکایە.

---

١٦٦ بڕوانە: رۆژنامەی (البلاد)، ١٩٩٦/٢/٢٨، ل٩.

وەنەبێت باسکردنی مەسەلە ((خۆشەویستەکان)) نیشانەیەك بێت بۆ رەچاو کردنی(ئیرادەی گشتی) یان نیشانەیەك بێت بۆ سەروەریی گەل چونکە حوکم و سەروەریی گەل ئەوە نییە یاری بە ئارەزووەکانی بکرێت و ئەم ئارەزووانە بۆ مەبەستی چینی سیاسی بەکار بهێنرێن. سیاسیە کانیش چەند رەچاوی خواستی گەل بکەن کاتی ئەوە هەر نێت کە پاش سەرکەوتنیان ئەو خواستە بەجێ نەهێنن ... لەبەر ئەوەش کە خواستەکانی ئەندامانی کۆمەڵگە یەك نین چونکە گەل پارچە پارچە بووە (ئەمەش کە دواییتر باس دەکەین)... ئەو شتانەی کە ناوی (خواستی هەمووگەل)ی لێ دەنرێت چەند شتێك کەمن کە پێچەو پەنا لە کاتی مامەلە کردن لە گەڵیاندا ئەوەندە زەحمەت نییە.

کارێکی ئاساییە(چونکە زۆر دووبارە بۆتەوە) کە پاڵێورلو پاش سەرکەوتنی پەیمان و رای کۆنی خۆی بگۆرێت وەك چۆن (تۆنی بلێر) سەرۆکی حزبی کرێکارانی بەریتانیا– کاتێك حزبەکەی لەحوکمدا نەبوو لەبارەی یاسای نەقابەکان – کە حکومەت پەسەندی کردبوو– وتبووی کە

((یاساکە ئابروو چونەو دیموکراتی نییە و دژ بە بەرژەوەندییەکانی کرێکارانە)) بەلام کە چووە سەر حوکم ولێیان پرسی ئایا ئەم یاسا دەهێڵێتەوە وتی: بێگومان... ئەمە شتێکی (منطقی)یە[167].

نموونەیەکی تری راگۆرین لەبەر بەرژەوەندی.. هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتیی ئەمەریکی (ساڵی ١٩٧٠) کەتیایدا (ریچارد نیکسۆن) لە هەڵبژاردنە سەرەتاییەکاندا (بۆ ئەوەی ببێتە پاڵێوراوی حزبی کۆماری) راستڕەو بوو بەلام لە هەڵبژاردنە گشتییە کاندا (بۆ سەرۆکایەتی) رووەو چەپ رۆیشت[168].

ساڵی (١٩٨٨) ش سیناتۆر جاك کێمپ لە حزبی کۆماری گاڵتەی بە سیناتۆر (بۆب دۆڵ) ی مونافیسی لە هەمان حزب دەکردو دەیوت: ((کاتێك (دۆڵ) باسی دوارۆژ دەکات

---

[167] جهاد الخازن، گۆڤاری الوسط، ژمارە ١٨٠، ١٩٩٦/١١/٢٤، ل٨٠.

[168] شوقی رافع، گۆڤاری (العربی)ی کوێت، ژمارە ٤٥١، حوزەیرانی ١٩٩٦،ل١٣٤.

جزدانی پارەکەت بگـرە نـەوەکو بیدزێت. کـاتێکیش کتێبخانـەی (دۆل) سـووتا ئـەو دوو کتێبەی لە دەسـت چـوو کـە لـە کتێبخانـەدا بـوون ... هێشتا کتێبـی دووەمیشی بۆیـە نـەکردبوو)) بـەڵام کـە سـاڵی (١٩٦٦).. (دۆل) پـاڵێوراوی حزبـی کۆمـاری بـوو بـۆ سەرۆکایەتی و (کێمپ) پـاڵێوراو بـوو بۆ جێگری سـەرۆك (لەگـەڵ دۆڵدا) کێمـپ ووتـی: ((گەورەترین شەرەفە لە ژیانمدا کە داوام لێ بکرێت بەشداری بکـەم لەگـەل ئـەم پاڵەوانـە ئەمەریکیە مەزنە (..)[١٦٩])).

بـێ گومـان پـەیمانی درۆ لـە غـەیری دیموکراسییشدا هەیـە بـەڵام دیموکراسـیی تاوانبارترە چونکە لەسەر بناغەی ئیرادەی گەل راوەستاوە.. ئەو گەلەی کـە درۆ لەگـەڵدا دەکرێت.

لـە ئەمـەریکادا پروپـاگندەی هـەڵبژاردن تـەرکیز دەکاتـە سـەر چالاکییـە بـێ بایەخەکانی پاڵێوراوان، بۆ نموونە لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتیی ساڵی (١٩٧٦) نێـوان جیراڵد فۆردو جیمـس کارتـەر تێبینـی کـرا کـە (٥/٣)ی پەخشـی هەڵمـەتی هـەڵبژاردن لـە تەلەفزیۆنەکاندا شت وەکو ئەمانەی لـە خـۆ گرتبـوو: کـێ دەیباتـەوەو کـێ دەیدۆڕێنێت هـەروەکو غارغـارێنی ئەسـپ، یـان قـەبارەی خـەڵکی لایـەنگر کـە لـە فرۆکـە خانـەکاندا ئامادەن، یان کەژلوەکانی سەیارەکانی پاڵێوراوەکـە.. تـاد، لـە کـاتێکدا تەنـها لـە (٣/١) کـەمتری پەخشـەکە لـە بـارەی کرۆکـی مەسـەلەکان بـوون، واتـە لـەبارەی هەڵوێسـتی پاڵێوراوان سەبارەت بـە مەسـەلەکان یـان لـەبارەی کارەکـانی پێشـووی پاڵێوراوەکـە لـە دەزگاکانی ولاتدا.. ئەمە لە تەلەفزیۆن، لە گۆڤارو رۆژنامەکانیشدا حاڵەکە نەختێك لەمـە باشترە[١٧٠]. بەڕێوەبەری هەڵمەتەکەی (جیراڵد فۆرد) یش باسی هەڵمەتەکانی تەلـەفزیۆنی بەم شێوەیە کردووە: ((کارتەرم بینی یاری (تۆپی نەرم) –جۆرە یارییەکە – لە ویلایەتی جۆرجیا دەکرد، کارتەریشم بینی (ئامی)ی کچی ماچ دەکردو، کارتەرم بینـی بـاوەش بـە

---

[١٦٩] جهاد الخازن، سەرچاوەی پێشوو، ل ٩-٨٠.

[١٧٠] ئۆستن رەنی، قنوات السلطة، ل ١٣٢-١٣٣.

(ليليان)ی دايكی دەكرد، كارتەريشم بينی جلو بەرگی زبری لەبەرەو دەست لە ناو دەستی (رۆزالين)ی ژنی بەناو باخی فستقدا دەگەڕێت. كارتەرم بينی دەچێت بۆ كەنيسەو مەوعيزەی تيادا دەڵێت و بينيم لە كەنيسە دەردەچێن..)) پاش باسێكی زۆری تريش باسی هەڵەو پەشۆكاويی (فۆرد) دەكات.. پاشان دەڵێت: بەلام دوای هەموو ئەو سەعاتانەی پڕ لە دڵەراوكێی زۆر كە لە بەردەم تەلەفزيۆندا بردمنە سەر قەد دوو پاڵێورلوەكەم نەبيست لەبارەی مەسەلەكانی هەڵمەتەكە بدوێن[171].

پروپاگندەكان لە ئەمەريكادا زۆر ((پيسن)) واتە پڕن لەقسەی ناشيرين و دۆزينەوەی عەيب و دۆزينەوەی پەيوەنديی ناشەرعی لەگەڵ ئافرەتاندا. بەپێی رۆژنامەيەكی ئەمەريكيش، هەڵمەتەكەی ساڵی (١٩٩٦) گەشتە ژمارەی (قياسی)لە پيسيدا[172].

تيۆر دانەر (منظر)ی ئەم جۆرە هەڵمەتانەی ئەمەريكاش دەڵێت كە هەموو شتێك رەوايە بەكار بهێنرێت دژی بەرامبەرەكەت تا لەناو ببرێت ئەمەشە ديموكراسيی[173].

لەم دواييەشدا ئەم جۆرە پروپاگندەيە (كەپێی دەوترێت پروپاگندەی سلبی) لە بەريتانيادا بەكار هات بەلام نارەزايی هەبوو بەرامبەری چونكە لەگەڵ پێوانە بەريتانييەكانی هەڵبژاردندا ناگونجێت[174]، لە راستيشدا پروپاگندەی سلبی بەهەر رادەيەك بێت هەر هەيە لە وڵاتاندا بەلام ئەوەندە هەيە كە ئەمەريكا پێشی وڵاتانی رۆژئاوای داوەتەوە.

---

[171] سەرچاوەی سەرەوە، ل١٣.

[172] صوت امريكا،١٩٩٦/١١/٧.

[173] المشاهد السياسي، ژمارە ٣١، ١٣-١٩/١٠/١٩٩٦، ل٢٢.

[174] سەرچاوەی سەرەوە، ل٢١-٢٢.

جگە لەم پروپاگندە سلبیەش چەندین ڕێگەی تر هەن بۆ کارکردن لەسەر جەماوەر، بۆ ئەم مەبەستەش چەندین پسپۆڕی ئاست بەرز هەن لە بوارەکانی دیعایەو دەروونناسی، بەڵکو تەنانەت (دەروونناسی ڕەنگەکان)یش[١٧٥].

لە دواییشدا باسی کاری ڕاپرسی (استطلاع الرأي العام) لەسەر چەواشە کردنی ناخبەکان لە کاتی هەڵمەتی هەڵبژاردنو دەنگداندا.

جگە لە چەواشەکەریی پاڵێوراوەکان جەماوەر لەلایەن خۆیەوە بەشێکی تاوانەکە هەڵدەگرێت چونکە بایەخێکی زۆر نادات بە هەڵمەتەکانی هەڵبژاردن. بە پێی چەند لێکۆڵینەوەیەك نیوەی جەماوەر لە گەرمەی هەڵمەتەکەدا ئەو ووتارانە ناخوێننەوە کە تایبەتن بە هەڵبژاردنەکان، ئەوەندی تری جەماوەریش گوێ لە ئێزگەکان ناگرن و بەزۆری تەنیا ئەوانەی کە بایەخ بە سیاسەت دەدەن شت دەخوێننەوە شت دەبیستن[١٧٦]. جا ئەگەر بزانن کەوا:

١- جەماوەر بایەخ بە هەڵمەتەکە نەدات، بە تایبەتی کرۆکی مەسەلەکانی هەڵبژاردنەکە.

٢- ئەو شتانەش کە دێنە بەرچاوو گوێی ساختەکاریی زۆریان تێدایە.

کەواتە چۆن هاوڵاتی دەگاتە ڕاستی؟

بێگومان ئەوانەی کە بەدوای ڕاستیدا دەگەڕێن خۆیان لەم پێناوە دا ماندوو دەکەن دەتوانن تا رادەیەك حوکمی گونجاو لەسەر پاڵێوراوانو مەسەلەکان بدەن بەڵام

---

[١٧٥] محمد الرميحي، گۆڤاری (العربي)ی کویتی،ژمارە ٤٥٥، تشرینی یەکەمی ١٩٩٦، ل ٢٢.

[١٧٦] ئەمە لە ئەمەریکادا، لەفەرەنساشدا بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی ساڵی (١٩٥٨) ئەنجامی وەها بەدەست کەوتبوو؛ ستوتزڵو جیرار، استطلاع الرأي العام، ل ٢٠٨- ٢٠٩. ئەمەش کرلوەتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە کاری دەزگاکانی راگەیاندن کە جێگیرکردنی بیروباوەڕی خەڵکە نەك گۆڕینی بیروباوەڕەکانیان (٢٠٩-٢١٠) بەڵام گومانی لەم ئەنجامە هەیە چونکە دەوری ڕاگەیاندن بچووك دەکاتەوە.

ئەمانە لە کەمایەتی کەمترن. ئەنجامی ئەمانەش ئەوەیە لــە کۆتــایی هەڵمەتــەکانی هەڵبژاردندا هاوڵاتی دەچێت بۆ دەنگدان بە بڕیارێکی عەقلی و راستەوە ناچێت و هەڵمەتی هەڵبژاردن دەیسەلمێنێت کە رێگرێکی ترە لەبەردەم حوکمی گەلدا.

## کۆسپی حەوتەم: ساختەکاریەکانی دەنگدان:

لە وڵاتە ((دوا کەوتووکان)) دا ساختەکاری لە هەڵبژاردندا پیشـەیەکی هەمیشـەیی حکومەتانە، رێژەی ٩٩و٩٩٪ش کەحیزبی حاکم لە هەڵبژاردنەکانی هەندێك وڵاتدا دەستی دەکەوێت بۆتە ژمارەیەکی ناودار. ئەم رێژەیەش نەك لە وڵاتەو دیکتاتۆرییە پوختـەکاندا دەبیندرێت بەڵکو لەو وڵاتانـەش کـە باوکـان و دایکـانی دیموکراسیی(ئەمـەریکاو وڵاتـانی ئەورووپا) پاڵپشتیانن، واتە رژێمـەکانی رۆژهـەڵات کـە لـە کرۆکدا دیکتـاتۆرین بـە رواڵـەت دیموکراتین.

ساختەکاری چەند رێگەیەکی هەیە وەك: دزینــی سـندووقەکان، هەڕەشـەکردن لـە پاڵێوراوان، بەند کردنی پاڵێوراوان، کڕینی دەنگەکان، رێگرتن لە نوێنەرانی حزبـەکان لـە چوونـە نـاو شـوێنی دەنگـدان کـە نیـاز وایـە سـاختەکاریان تێدا بکرێــت، دابەشـکردنی ناوچەکانی هەڵبژاردن بە جۆرێك کە نەیارەکانی حکومەت دەنـگ نـەهێنن، وەك چـۆن لـە (میسر) دا دوو شوێن کرابوون بەیەك ناوچەی هەڵبژاردن هەرچەندە ٣٠٠ کیلۆمـەتریان لـە نێوان دایە. مەبەستی ئەوەش ناوچەی دووەم (چڕی)ی لایەنگرانی فڵانە حزب لە ناوچەی یەکەمدا کەم بکاتەوە.

ئێمـەش لەسـەر ئـەم سـاختەکارییە دواکەوتووانـە نـاڕۆین و چـەند نموونەیـەك لــە ساختەکاریەکان لە رۆژئاوادا دەهێنینەوە:

کـاتی خـۆی سـاختەکاری لــە رۆژئــاوا زۆر بــوو بــەڵام چونکــە جیــهان رووەو ((مۆدێرنــزم)) دەڕوات؛ ســاختەکارییە کلاســیکییەکان کــەم بوونەتــەوەو بوونەتــە ساختەکاریی مۆدێرن ... لەسەردەمی (مۆدێرنزم)یشدا تەنانەت پێویست بە ساختەکاریی

ناکات چونکە ڕێگە چەوتەکانی دەسەڵات ئەوەندە زۆرن کە هەڵبژاردنی ((پاک)) و ((ئازاد)) پێویستە بۆ داپۆشینی ئەو کۆسپانەی کە دەخرێنە بەردەم حوکمی گەل و کە هەندێکیانمان باس کرد. جگە لەوەش هاوسەنگی نێوان هێزەکان (توازن القوی) ڕێگە لە ساختەکاری دەگرن واتە مەسەلەکە واقعی هێزەکانە نەک خواستی باشی ئەو هێزانەیە. لەگەڵ ئەوەشدا ساختەکاریی کلاسیکی هەر هەیە، وەکو کڕینی دەنگەکان، ڕۆژنامەیەکی ئەمەریکیش لەم دواییەداو وتبووی: ئێستا لە جیاتی ئەوەی دەنگەکان بدرێن دەنگەکان دەکردرێن[177]، ئەوساش لە ئەمەریکادا چەند حاڵەتێکی ((فرە دەنگدان)) هەبوو، بۆ نموونە ١١٠٪ی ناخبەکان دەنگیان دەدا[178] واتە ١٠٪ ی دەنگەکان زیادو ساختە بوون، بەڵام ڕێژەی ساختاکارییەکە لەو ١٠٪ زیاترە چونکە ئەگەر حسابی ئەو کەسانەی بکەین کە بەشداری ناکەن و کە ڕێژەکەیان لە نێوان (١٠٪) یە تا (٥٠) ئەوا بەلای کەمەوە(٦٠)ی دەنگەکان ساختەن.

جۆرێکی تری ساختەکاری کارەکانی ڕاپرسی (استطلاع الرای العام)ە کە دوایتر چەند نموونەیەکی دەهێنینەوە(بەشی ڕای گشتی، خاڵی پێنجەم).

بەهەر حاڵ وەک وتمان هەڵبژاردنی ((پاک)) و ((ئازاد)) پێویستە بۆ داپۆشینی پێشێلکارییەکانی تری حوکمی گەل بەمەش دەگەینە قۆناغێکی تری چالاکیی دیموکراتی کە ڕۆژی دەنگدانە. هاوڵاتیش پاش ئەوەی کە بەو هەموو کۆسپانەدا تێپەڕیوە، بڕیارێکی هەڵگرتوو کە بە زۆری بڕیارێکی عەقلی نییەو کاغەزەکەی خستە ناو سندووقەوە ... تا گەیشتە ئەم قۆناغەش لە (حوکمی گەل) تەنها ئێسکەکەی بۆ ماوەتەوە.. بەڵام هێشتا ئەمەش بە پێی ڕەوا نازانرێت. با بزانین حوکمی گەل چ کارەساتێکی تری بەسەریدا بێت.

---

[177] صوت امریکا ١٩٩٦/١١/٦ ناشزانین مەبەست کڕینی کلاسیکییەکان شێوەیەکی ((مۆدێرن))ی کڕینە.

[178] ئێرنست گریفیث، نظام الحکم فی الولایات المتحدة، ل ١٤٨ نووسەر دەڵێت کە خۆی ئاگاداری ئەو حاڵەتانە بووە، ئەمەش ساڵی (١٩٥٤) نووسیوە.

# کۆسپی هەشتەم: ڕێژەی بەشداری کردن لە هەڵبژاردنەکاندا.. و
# کۆسپی نۆیەم: دابەش بوونی دەنگەکان

ئەنجامەکەی سەرەوە ئەوەیە کە تەنانەت ئەگەر هەموو گەل لە هەڵبژارنەکاندا بەشداری بکات ئەوا مەرج نییە حوکمی گەل بێتە دی بەڵام لەمە خراپترمان هەیە: هەموو گەل لەو هەڵبژارنانەدا بەشداری ناکات.

دیاردەیەك هەیە abstention ی پێ دەوترێت و جێگەی نیگەرانی خەمخۆرانی دیموکراسییە. ئەم دیاردەیە ئەوەیە کە ژمارەیەك لەوانەی کە مافی دەنگدانیان هەیە دەنگ نادەن ڕێژەی ئەم بەشداری نەکردنەش لە وڵاتێك بۆ وڵاتێکی تر دەگۆڕێت لەناو یەك وڵاتیشدا بە پێی باروبۆخ یان بە پێی چینەکان یان ڕەگەزەکان... تاد دەگۆڕێت.

ئەم دیاردەیە بە پێی نووسەرێکی فەرەنسی ((یەکێکە لە مەترسییە نەناسراوەکان[179])) بێگوان نەناسراو لە لایەن گەلانی ڕۆژئاوا نەك لە لایەن ڕۆشنبیرو بیریاران.

لە هەڵبژاردنە گشتییەکانی بەریتانیادا ڕێژەی بەشدتری نەکردن لە ماوەی نێوان (١٩٢٢) تا(١٩٣٥) نێوان (٢٦٪) تا(٢٠٪) بوو[180]، سالی (١٩٥٠)و(١٩٥١) یش ڕێژەی بەشداریکردن (٨٤٪) و(٨٢,٦٪) بوو[181]، واتە سالی (١٩٥٠) ڕێژەی بەشداری نەکردن(١٦٪) بوو، سالی (١٩٥١) ڕێژەکە بۆتە (١٧,٤٪).

---

[179] Le point . No. 1179, 22/4/1995, p. 15.

[180] بۆ ژمارەی ئەولو بروانە، ولیام رۆبسن، النظام الحكومي في بريطانيا العظمى.

[181] British Parliament, p. 25.

له فەڕەنسادا (لە چلەکانی ئەم سەدەیەدا) باسی پاشەکشێی سەدان هەزار کەس لە بەشداریکردن لە کاروباری سیاسی کراوە[182]، ئەگەر باسی تازەتریش بکەین ئەوا لە خولی یەکەمی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی فەڕەنسا (ساڵی ١٩٩٥) ڕێژەی بەشداری نەکردن (٢٢,٥٨٪)بوو[183]. بەشێوەیەکی گشتیش، (معدل)ی بەشداری کردن لە پێنج هەڵبژاردنی دوایەمینی سەرۆکایەتیدا (٨١,١٪) بوو بۆ خولی یەکەم و (٨٢,١٪) بۆ خولی دووەم[184]، واتە بەشداری نەکردن دەکاتە ١٨٪–١٩٪.

ڕێژەی بەشداری کردن لە ئەمەریکادا زۆر کەمترە، بە پێی خشتەیەك لە ساڵی (١٩٤٨) ەوە تا(١٩٨٢) بۆ هەردوو (سەرۆکایەتی)و (کۆنگرس)، بەرزترین ڕێژەی بەشداری کردن لە (سەرۆکایەتی) دا ئەوەی ساڵی(١٩٦٠)ە کە (٦٢,٨٪) بوو لە کاتێکدا بەشداری کردن لەوانەی کۆنگرس کەمترە کە بەرزترینیان (٥٨,٥٪) ەو هی هەمان ساڵە[185]. لە هەڵبژاردنەکانی (١٩٩٦) شدا بەشداری کردن نەختێك لە ٥٠٪ کەمتر بوو. ئەمەش بە مەرجێك هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی و کۆنگرس سەرنجی گەورەترین ژمارەی خەڵك رادەکێشن لە کاتێکدا هەڵبژاردنە ناوچەییەکان (لەسەر ئاستی ویلایەت، شارەکان،..) لە هەموو وڵاتێکی جیهاندا ڕێژەیەکی زۆر کەمتری بەشداری بە خۆیانەوە دەبینین، لە ئەمەریکاشدا باسی ڕێژەی ٢٠٪–٣٠٪ ی بەشداری کردن وەك شتێکی ئاسایی دەکرێت[186].

پاش بێزارکردنی خوێنەر بەم ژمارانە دێینە سەر مەبەستی خۆمان:

---

[182] سارتر وروسێ و ڕۆزنتال، محاولات في السياسة، ل١٨.

[183] No. 1180. 29/4/1995. p. 56. ;Le point

[184] No. 1179. 22/4/1995. p.15. ;Le point لە خولی یەکەمی هەڵبژاردندا موناقەسەکە نێوان هەموو پاڵێوراوانە، لە خولی دووەمیشدا نێوان یەکەم و دووەمی خولی یەکەمە.

[185] بڕوانە، ڕەنی، قنوات السلطة، ل ٩٦.

[186] ڕەنی، سياسة الحكم، ج٢، ل ٢٨٣، لە بەشی یەکەمی کتێبەکەدا نووسەر باسی ڕێژەی (٢٠٪)و(٢٥٪) دەکات (ل٤٠١)

ئێمە وتمان کە (حوکمی گەل) لە باشترین حاڵەتیدا لە کاتی دەنگدانەدا دەردەکەوێت، ئەمەش ئەگەر هەموو گەل (یان ئەوانەی مافیان هەیە) دەنگ بدەن بەلام ئەگەر بەشێکی گەل لەم دەنگدانەدا بەشداری نەکەن ئەوا کێشەکە بۆ (حوکمی گەل) قووڵتر دەبێت. کاتێکیش لە ئەمەریکادا زیاد لە ٥٠٪ ی ناخبەکان بەشداری نەکەن سەرکەوتوو رەزامەندیی تەنها نیوەی ناخبەکانی هێناوە، واتە لێرەدا ((حوکمی نیوەی گەل)) هەیە نەك (حوکمی گەل)، بەلام پێدا چوونەوەیەك بە حسابەکاندا ئەوەمان بۆ دەردەخات کە سەرکەوتوو رەزامەندیی تەنانەت نیوەی گەلیشی بەدەست نەهێناوە ئەمەش حسابەکەیە:

لە خولی یەکەمی هەڵبژاردنەکەی (١٩٩٥)ی سەرۆکایەتی فەرەنسادا (لیونێل جۆسپان) ٢٣,٣٪ی دەنگەکانی هێنا کە بەرزترین رێژەیە[187]. زانیشمان کەوا ژمارەی بەشدار بووان (٧٧,٤٢٪) بوو (باسی سێ ملیۆن کەسیش ناکەین کە ناو نەنووس نەکراون).. (کەواتە (جۆسپان) تەنها ٢٣,٣×٧٧,٤٢ = ١٨٪ ی دەنگەکانی ناخبەکانی دەستکەوت.

لە حاڵەتی ئەمەریکادا (ساڵی ١٩٩٦) کلنتۆن ٤٩٪ی دەنگەکانی دەستکەوتبوو[188]. لە لایەکی تریشەوە لە ٥٠٪ کەمتری ناخبەکان دەنگیان دابوو، واتە کلنتۆن ٤٩٪ ×٥٠٪ کەمتر = ٢٥٪ کەمتری دەنگی ناخبەکانی هێنابوو..

جا ئەگەر هەقمان بێت گومان لە (حوکمی گەل) بکەین ئەگەر یەکێك ٦٠٪ی دەنگەکان بهێنێت ئیتر چۆن بتوانین بڕوا بە (حوکمی گەل) بکەین ئەگەر ئەو کەسە ٢٥٪ یان ١٨٪ ی ناخبەکان پێی رازی بن ؟

---

[187] Le Point , No. 1180. 29/4/95. p. 56.
لە خولی دووەمدا (جاك شیراك)ی موناڤسی (جۆسپان) سەرکەوت.

[188] صوت امریکا، ٦/١١/١٩٩٦.

## با ئەنجامێکی خراپتر بڵێین:

ئەگەر بمانەوێت دیموکراتیتر بین پێویستە دیکتاتۆریتر بین!

با ئەمە لە ڕێگەی وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارەوە ڕوون بکەینەوە:

بۆچی (جۆسپان) ١٨٪ی دەنگی ناخبەکانی دەست کەوت؟ چونکە (جۆسپان) هەشت مونافسی هەبوو دەنگی دەنگدەران بەسەر ئەو (نۆ) پاڵێوراوە دابەش بوو، کەواتە بۆ ئەوەی (جۆسپان) یان(شیراك) یان هەریەکێکی تر ڕێژەیەکی زیاتر یان دەست بکەوێت دەبێت تەنها یەك یان دوو یان سێ پاڵێوراو هەبن[189] بەڵام ئەمە ڕێگرتنە لە خۆ پاڵاوتن، ڕێگرتنیش لە خۆ پاڵاوتن یەکسانە بە ڕێگرتن لە ئازادیی.. ئەم ئەنجامەش دەچێتە پاڵ بەڵگەکانی تری ناڕێکی نێوان (دیموکراسیی) و(ئازادیی).

ناڕێکی نێوان (دیموکراسیی) و(ئازادیی) شتێکە دواییتر باس دەکەین.. ئەوەی لێرەدا گرنگە ناڕێکی لەناو خودی دیموکراسیی خۆی ... باقسەکانی سەرەوە بە جۆرێکی دیکە دووبارە بکەینەوە:

١- بۆ ئەوەی دیموکراتی تر بین پێویستە سەرۆك کۆمار ڕێژەیەکی گەورەی دەنگی گەلی دەست بکەوێت و بۆ ئەم مەبەستە ڕێگە لەوە بگیرێت کەسانی زۆر خۆیان بپاڵێون.

٢- بەڵام دیسان بۆ ئەوەی دیموکراتی بین پێویستە ڕەزامەندیی گەل وەربگیرێت کە یەکێکە لە شێوەکانی ئەوەیە کە هەر هاوڵاتیەك دەنگ بۆ ئەو کەسە بدات کە خۆی پێی خۆشە واتە ڕێگە لە کەس نەگیرێت خۆی بپاڵێوێت.

ئەمەش وەکو مەسەلەی (مریشك و هێلکەیە).. کامەیان لە پێشترن چونکە هەردوو ڕێگەکەی سەرەوە لە هەمان کاتدا دیموکراتین و نادیموکراتین.

---

[189] ئەم کێشەیەش تا رادەیەك بە خولی دووەمی هەلبژاردن ژارەسەر کراوە بەلام چارەسەرەکە ناتەواوە چونکە لە خولی دووەمداو لە هەلبژاردنە (بۆ نموونە) چوار کەس بەشداری دەکەنەوە، بۆ ئەو خولە ئەوانیش کە ڕێژەی قانوونی ١٢. ٥ ٪ یان دەست کەوتووە بۆیە دیسان دەنگەکان دابەش دەبنەوە.

بێ گومان حاڵەت هەیە کە سەرۆکی کۆمار یان سەرۆك وەزیران یان حزبێکی دیار کراو ڕێژەیەکی گەورەی دەستبکەوێت بەلام ئێمە باسی حاڵەتە گشتییەکە دەکەین:

١- ئەگەر دوو حزبی گەورە هەبێت ئەوا وەکو یەك بەهێزن بۆیە دەنگەکانی هەریەکێکیان نزیکە لەوەی تر بەمەش ڕێژەی دەنگەکانی هەر یەکێکیان کەمتر دەبێتەوە بەرادەی نیوە یان شتێك کەمتر یان زیاتر.

٢- ئەگەر چەند حزبێك هەبن و وەکو یەك بەهێز بن دابەش بوونەکە زیاتر دەبێت. ڕێژەی حزبی سەرکەوتوو لە هەر یەکێك لەم دووحاڵەتە ڕێژەیەکی کەمەو تەنها لە حاڵەتێکدا زۆر زیاد دەکات ئەویش کاتی قەیرانی گەورە بەلام بەمەرجێك ئەو حزبە بەرنامەیەکی ((شۆڕشگێڕ))ی پێ بێت ... پاش ئەم ڕەخنانەش ئێمە هێشتا لە سەرەتا دالین:

جارێ باسی (دووڵەکان)مان نەکردووە کە چەند دەوریان هەیە لە دەنگداندا. بەپێی چەند ئامارێك دەرکەوتووە کە ٣٠٪ -٤٠٪ ی ناخبەکان لە کاتی هەڵمەتی هەڵبژاردنداو ڕۆژی دەنگدان بڕیاری خۆیان دەدەن [١٩].

کەواتە ٣٠٪ تا٤٠٪ی ناخبەکان تا ئەو کاتە رایان نەبوو ئەمەش کە ئعتبارێکی وا نادات بە بڕیارەکەیان. ئەگەر ئەمانەش بخەینە حسابی (زەرب و تەقسیم)ە کەمان دەبینین کە بەلای کەمەوە ٣٠٪ ئەو کەسانەی کە دەنگیان بۆ کلنتۆن دابوو بڕیارەکەیان عەقلیانە نەبووەو لە ژێر کاری پڕو پاگندەی هەڵبژاردندا بوو واتە ٧٠٪×٢٥٪- ١٧,٥٪ی ناخبەکان بڕیارێکی عەقلیانەیان داوبوو کاتێك دەنگیان بۆ کلنتۆن دابوو بەلام ئەگەر هەموو ئەو شتانەی کە لە کۆسپەکانی رابردوودا خستبوومانە روو بهێنینەوە یادی خۆمان وبمانەوێت حسابەکە بکەینەوە دەپرسین: چەند لەو (١٧,٥٪)ە بەراستی بڕیارێکی عەقلیانەیان دابوو؟ کەواتە نەدەتوانین باسی (حوکمی گەل) بکەین لە کاتی دەنگداندا و نەدەتوانین بڕیاری ئەو (مشتە کەسە)ی گەل بە بڕیارێکی عەقلی بزانین.

---

[١٩] رەنی، سیاسة الحکم، ج١، ل٤٦٢.

بگەڕێنە و سەر بەشداری نەکردن لە دەنگداندا.

تێبینی کراوە کە ئافرەتان کەمتر لە پیاوانو لاوان کەمتر لە پیرەکان دەنگدەدەن[191]. بەشداری کردنە کەمەکەی ئافرەتانیش هۆی دیاریکراوی هەیە کە بە دڵی ئەو کەسانە نییە کە بانگەشە بۆ مافی ئافرەتان دەکەن (کە زۆریان بازرگانی بەو مەسەلەیە دەکەن) بەشداری نەکردنی لاوانیش دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆی سەرەکی، یەکەمیان سەرقاڵیی لاوان لە ژیان و رابواردنو وەرزش... تاد. دووەمیش بێزار بوونیان لە سیاسەت و سیاسییەکان.

بەشداری کردنیش پەیوەندییەکی وای نییە بە خوێندەواریو ئاستی فێر بوون چونکە بۆ نموونە لە ئەمەریکادا هەرچەندە ئەم ئاستە بەرزبۆتەوە، هەروەها هەرچەندە قەیدەکانی ناو نووسین بۆ دەنگدانو قەیدەکانی تر کەم بوونەتەوە بەڵام بەشداری کردنەکە زیادی نەکردووە، ژمارەیەکیش تەفسیر بۆ ئەمە هەیە کە یەکێکیان دەڵێت کەوا خەڵکەکە وا بیر دەکەنەوە کە ئەوان چی بکەن ئەمە هیچ کار ناکاتە سەر کارەکانی حکومەت مەگەر شتێکی کەم کاربکات[192]. ئەمەش بۆ خۆی دیموکراسیی وەك نیزامێکی سەپێندراو پیشان دەدات.

بەشداری کردنی کەمیش لە دەنگداندا پاڵی بەهەندێك وڵاتە نا دەنگدان بکەنە زۆرە ملێ (اجباری)[193]، بەڵام ئەمە پێشێل کردنی ئازادیی تاکەکانە لە پێناوی ئەوەی کە

---

[191] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٤٧٢، بۆ بەشداری کردنی کەمتری ئافرەت بڕوانە. هەروەها: Electoral Processes, Op. Cit. p. 535.

[192] رەنی، قنوات السلطة، ل ٩٥.

[193] بەلجیکا(١٨٩٣ بڕیاری لەسەردا)، هۆلەندا(١٩١٧)، ئوسترالیا (١٩٢٤).. بڕوانە رەنی.. ، سیاسە الحكم ج١، ل٤٠٢. ناشزانین ئەمە ماوە لەو وڵاتانەدا یان نە. بەهۆی ئەم زۆر ملەنییەش رێژەکە لە ٧٥٪ ە و بۆ ٩٥٪ لە بەلجیکاو لە ٦٤٪ەوە بۆ ٩٤٪ لە ئوسترالیا زیادی کردووە (هەمان سەرچاوە) واتە هێشتا کەسانێك هەن کە دەنگ نادەن.. بڕوانە هەروەها ئەم سەرچاوەیە بە تایبەتیش بۆ بەلجیکا: Electoral Systems . Op. Cit. ,p. 163.

هەموو گەل ((حوكم بكات لە ڕێگای دەنگدانەوە)). ئەمەش بەڵگەیەكی ترە لەسەر ناڕێكی نێوان (دیموكراسیی)و (ئازادیی).

دیاردەیەكی دیكەی هەڵبژاردنەكان ئەوەیە كە لە نیزامەكانی سەرۆكایەتیدا (كە پەرلەمانو سەرۆك هەریەكێكیان بەجیا هەڵدەبژێردرێن) ڕێژەی بەشداری كردن لە هەڵبژاردنی سەرۆكدا گەورەترە لەچاو ئەوەی پەرلەمان. لە نیزامە پەرلەمانییەكانیشدا (كە پەرلەمان هەڵدەبژێردرێتو حزبی سەركەوتوو لە پەرلەماندا حكومەت پێك دەهێنێت) هەڵبژاردنەكە زیاتر دەبێتە دەنگدان بۆ تاكە كەسێك كە سەرۆكی حزبەكانن، واتە هەڵبژاردنەكان هەڵبژاردنی سەرۆك وەزیرانە زیاتر لە هەڵبژاردنی حزبەكەیەتی. ئەم دیاردەیەش عەقلییەتی جەماوەرمان بۆ ئاشكرا دەكات كە چۆن جەماوەر بە دوای((پێشەوا))دا دەگەڕێت. خەڵك مەیلیان بۆ پێشەوایەكی تاكو زیاتر لە پەرلەمانێكی ((قەرەباڵغ))هەیە. ئەمەش تەنها یەك بەڵگەیە لە دەیان بەڵگە لەسەر ئەو ڕاستییەی كە عەقلیەتی خەڵك لەگەڵ دابەش بوونو پەرشو بڵاوكردنی دەسەڵاتەكان و قەرەباڵغی دەستەی حوكمدا ناگونجێت، بەڵكو لەگەڵ چڕبوونەوەدایە. بەم جۆرە ((دیمۆ-كراسیی)).. حوكمی گەل. لەگەڵ نەفسیەتی گەلدا(دیمۆس) ناگونجێت.

## كۆسپی دەیەم: دەستنیشانكردنی سەركەوتوو و دابەشكردنی كورسییەكان.

پاش دەنگدان دەمێنێتەوە دەنگەكان بژمێردرێنو سەركەوتووان دەستنیشان بكرێنو كورسییەكانی پەرلەمان دابەش بكرێن. بۆ ئەم مەبەستەش چەند ڕێگەیەك هەیە:

**یەكەم: نیزامی زۆرینە** : كە ئەویش دوو جۆرە:

١- نیزامی زۆرینەی ڕێژەیی (الاغلبیة النسبیة) یاخود نیزامی (الاكثریة) Plurality: سەركەوتوو تیایدا ئەوەیە كە لە پاڵێوراوەكانی تر دەنگی زیاتری دەست

کەوتووە ڕێژەکە هەر چەندێك بێت ، بۆ نموونە سێ پاڵێوراو هەن کە یەکێکیان ٤٠٪ی دەنگەکانی دەستکەوتووە دوانەکەی تریش ٣٥٪و ٢٥٪. لەم نیزامەدا یەکەم کەس سەرکەوتووە. ئەم نیزامەش ئاسانترە بۆ ئیش پێ کردن بەڵام ڕەخنەی سەرەکی کە لێی گیراوە ئەوەیە کە ئەگەر سێ پاڵێوراو بەرەو ژوور هەبن ئەوا سەرکەوتوو هەرچەندە لەوانیتر زیاتری دەستکەوتووە بەڵام لەچاو هەر هەموویاندا ڕێژەیەکی کەمتر لە نیوەی هێناوە [194] هەروەك نموونەی سەرەوە کە چۆن سەرکەوتوو ٤٠٪ی دەنگەکانی دەستکەوت، واتە ٦٠٪ی دەنگدەران پێی ڕازی نەبوون. بۆ چارەسەر کردنی ئەمەش چەند ڕێگەیەك هەیە وەك: دەنگدانی دووەم کە چەند پاڵێورلوێکی سەرکەوتوو (بەمەرجی تایبەتەوە) دەچنەوە هەڵبژاردن، یان ئەوەشە ئەم نیزامە پیادە نەکرێت و لە جیاتی ئەوە کار بە یەکێك لە دوو نیزامەکەی خوارەوە بکرێت[195].

٢– نیزامی زۆرینەی ڕەها (الأغلبية المطلقة) یاخود نیزامی (زۆرینە) Majority: لێرەدا سەرکەوتوو ئەو کەسەیە کە(نیوەی دەنگەکان+١) بەرەو ژووری دەست بکەوێت. ئەمەش بۆ خۆی کێشەی ئەوەی تێدایە کە ئەگەر کەس لە پاڵێوراوەکان ئەو ڕێژەیەی دەست نەکەوێت چارەسەرەکەش ئەوەیە کە هەڵبژاردنێکی تر بکرێت[196].

هەردوو نیزامەکەی سەرەوەش دادپەروەری دابین ناکەن چونکە ڕێژەیەکی گەورەی دەنگەکان بە بادا دەچن کە لە دووەمدا ٤٩٪ بەرەو خوارە، لە یەکەمیشیاندا ڕێژەیەکی گەورەترە، کە لە نموونەکەماندا ٦٠٪ بوو. لەبەر ئەوەش‌و بۆ دابین کردنی دادپەروەری زۆر وڵات نیزامی نوێنەرایەتی ڕێژەیی‌یان پەسەند کردبوو.

---

[194] بۆ نموونەبڕوانە Plurality System . Encycl. Britannica.Micropaedia. Ready Reference and Index. Vol. 8.p. 52.

[195] Ibid

[196] Electroral Processes. Op. Cit.. 530.

ڕێگەیەکی دیکە هەیە لە سەرچاوەی خوارەوە دا ناوی هاتووە بەڵام چونکە زۆر پیادە ناکرێت باسی ناکەین Electroral Systems. Op. Cit.. p.138.

## دووەم: نـــــیزامی نوێنەرایـــــەتیی ڕێژەیـــــی (التمثیـــل النســـبي) Proportional Representation یاخود نوێنەرایەتیی کەمایەتییە سیاسییەکان:

دوو نیزامەکەی (زۆرینە)ی سەرەوە زۆربەی کات لە حاڵەتی هـەڵبژاردنی (فـەردی) یان (ناوچە) دەچەسپێنرێت واتە وڵاتەکە دەکرێتە چەند ناوچەیەکی بچووکی ژمارە زۆر.. بۆ نموونە شاری سلێمانی چەند ناوچەیەکی دەبێتو لە هەر ناوچەیەکدا تەنها یەك کەس دەردەچێت. بۆیە زۆر جار بە نیزامی زۆرینـە دەوترێت نـیزامی فـەردی یـان ناوچـە (المقاطعة). لە حاڵەتی نیزامی نوێنەرایەتیی ڕێژەییشدا زۆربەی کات لیستی حیزبەکان بۆ هەڵبژاردن دادەبەزن بۆیە زۆر جار بەم نیزامە دەوترێت نیزامی لیست (نظام القائمة).

لـە نوێنەرایـەتیی ڕێژەییـدا کورسـییەکانی پەرلـەمان بـە پێـی ڕێـژەی دەنگـەکان دابەش دەکرێن. بۆ نموونە ئەگەر دوو حیزب هەبن یـەکێکیان ٦٠٪ی دەنگـەکانی دەسـت بکەوێتو ئەوی تر ٤٠٪ پەرلەمانەکەش ١٠٠ کورسی بێت ئەوا حزبی یەکەم (٦٠) کورسیی دەست دەکەوێتو حزبەکـەی تـر (٤٠) کورسـی. (ئـەم نموونەیـەشمان بـۆ ئاسـان کردنـی باسەکەیە).

ئەم نیزامەش ڕێگە دەدات بـەو حزبانـەی کـە دەنگـی کـەمیان هێنـاوە کورسـییان دەست بکەوێتو ئەو دەنگانەی کە دەستیان کەوتووە نەفەوتێن.

بۆیە دەوترێت کە دادپەروەرییەکی زیاتری تێدایە لـە چـاو نـیزامی زۆرینـە، لەبـەر ئەوەش بوو کە لە ئەورووپای سەدەی (١٩)دا باوەڕ بەم نیزامە بە هێز بووو پـاش جـەنگی یەکەمی جیهانی بەکار هات بەڵام پاش ئەوە لە زۆر وڵاتدا پاشە کشێی کرد[١٩٧].

ئەم نیزامە بێ بەش نییـە لـە عـەیب کـە عـەیبی یەکـەمیان ئەوەیە پەرلـەمان پـڕ دەبێت لە حزبو بـەم شـێوەیەو لـە زۆر لـە حاڵەتـەکاندا هـیچ حیزبێك نـاتوانێت لـە نـاو پەرلەماندا زۆرینەی کورسییەکانی بە دەستەوە بێت، بە ناچـاریش حکومـەتێکی ئیئـتلاف

[197] H. F. Gosnell. Proportional Representation. Encycl. of the Social Sciences, vol. 12, p. 544.

لە دوو حیزب یان زیاتر پێك دێت، بەڵام حکومەتی ئیئتلاف زوو هەڵدەوەشێت بۆیە جێگیر بوونی وەزاری (الإستقرار الوزاري) بەدی نایەت، ئەمەش کار دەکاتە سەر هەردوو (پەرلەمان)و (دەسەڵاتی بەجێهێنان)و ئەمە وەزعی فەرەنسا بووو بەهۆی ئەمەوە نیزامی فەرەنسی بووە نموونەی عەیبی ئەم نیزامە تا دوایی (١٩٥٨) بەدواوە دەسەڵاتی بەجێهێنان بەهێز کراو دەسەڵاتی گەورەتر درا بە سەرۆك كۆمار[198]. هەر ئەمەش وەزعی تورکیای ئەمڕۆیە کە هەمووماں دەبینین پەرلەمان و حکومەتی چەند شێوان.

بە واتایەکی تر لە پێناوی دابین کردنی عەدالەت بۆ حیزبە سیاسییەکان و لە پێناوی دیموکراسییەکی زۆرتر پەرلەمانێکی شڵەقاوو حکومەتێکی لاواز پێك دەهێنرێن کە ئەمە بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەو راستییەی کە: **ئەگەر بمانەوێت حوکمێکی بە هێزتر دابمەزرێنین پێویستمان بە دیموکراسییەکی کەمترە.**

عەیبێکی تری ئەم نیزامە ئەوەیە کە هاوڵاتی لە ناو هەر لیستی حزبێکدا تەنها دوو یان سێ کەس دەناسێت بۆیە تەنها حوکم لەسەر حزبی خاوەن لیستەکەدا دەداتو نازانێت کەسانی ناو لیستی ئەو حزبە چەند دڵسۆزن یان لێهاتوون، لە کاتێکدا لە نیزامی زۆرینەدا (کە وەك وتمان بە زۆری لەگەڵ نیزامی فەردیدا یەك دەگرنەوە). هاوڵاتی لە ناوچە بچووکەکەی خۆیدا (لە گەڕەکی کانێسکانی سلێمانی بۆ نموونە) جگە لەوەی حوکمی خۆی هەیە بەسەر حیزبەکەی خۆیدا ناسینی ئەو کەسەی حزبەکە کە خۆی پاڵاوتووە کارێکی ئاسانترە بۆی... هەروەها ناسینی هەموو پاڵێوراوەکانی کانێسکانەکەی خۆی ئاسانترە[199] لەچاو نیزامەکەی تر کە کەسانی ناو هەموو لیستی حزبەکاندا بناسێت کە ژمارەیان دەگاتە سەدان کەس.

---

[198] فەرەنسای پێش (١٩٥٨) نیزامی پەرلەمانیی پیادە دەکرد کە دەسەڵاتی گەورە لە دەستی سەرۆك وەزیراندایە بەڵام دوایی ئەم دەسەڵاتە درایە سەرۆك كۆمار بۆیە هەڵوەشانی کابینەی حکومەتی ئێستا کارێکی ئەوتۆی نییە وەکو جاران.

[199] دەڵێین (ئاسانترە) نەك ئاسانە.

وتمان نیزامی نوینەرایەتی ڕێژەی دادپەروەرترە بەڵام وتیشمان ئەم سوودە زیانبەخشە چونکە دەرگا بۆ پێکهێنانی حکومەتی شلەقاو دەکاتەوە.. بەڵام جاری واش هەیە ئەم دادپەروەرییە لە دەست دەردەچێت‌و نامێنێت ئەویش لە چۆنییەتی دابەش کردنی کورسەیەکان.

ئەم دابەش کردنەش بە پێی چەند ڕێگەیەکەو وەك لە نموونەی خوارەوەدا دەردەکەوێت کە بە پێی سێ جۆری دابەش کردنەو کە ئەنجامەکانی ئەم سێ جۆرە نزیکن لە یەك:

نموونەکەمان ئەوەیە کە دوو سەد هەزار کەس دەنگیان داوە، لیستی (أ) ٤٢٪ی دەنگەکانی هێناوە، لیستی (ب) ٢٨٪... (باسی لیستەکانی تر ناکەین چونکە ئەم دووانە بەسن بۆ نموونەکە). دەبینین کە پاش دابەش کردنی دەنگەکان‌و لەسەرجەم پێنج کورسی لیستی (ب) یەك کورسیی دەست دەکەوێت‌و لیستی (أ) سێ کورسی[٢٠٠]، ئەمە لە کاتێکدا لیستی (ب) زیاتر لە نیوەی دەنگەکانی لیستی (أ)ی هێنابوو، واتە بەشێکی گەورە لە دەنگەکان بێ سوود بوون‌و بەبادا چوون، کەواتە لەم حاڵەتەدا ئەم نیزامە هەروەها دادپەروەر نییە.

بگەڕێینەوە سەر نیزامی زۆرینە کە لەمیان ناداد پەروەر ترە. لەم نیزامەداو لە هەندێك حاڵەتداو کەسێك دەدۆڕێت کە ژمارەیەکی زۆرتری دەنگەکانی دەستکەوتووە.

## بۆ نموونە:

وڵاتێك پێنج ناوچەیە، لە هەر ناوچەیەکیش سەد هەزار کەس دەنگیان داوە. حزبی (أ) لە دوو ناوچەدا ٨٠٪ی دەنگەکانی دەستکەوتووە، لە هەر یەکێکیش لە سێ ناوچەکەی تر تەنها ٤٠٪ی دەنگەکانی بە دەست هێناوە.

---

[٢٠٠] ئەم حیسابەمان زۆر بە کورتی لەم سەرچاوەیەی خوارەوە وەرگرتووە: دکتۆر علی غالب، القانون الدستوري، ل٦٠ بە دواوە.

بەم پێیە حزبی (أ) لەم سێ ناوچەیە دەدۆڕێت و ئەنجامی دوایەمین ئەوەیە کە ئەو حزبە دوو کورسی دەستکەوێت و حزبی (ب) سێ کورسیی بەڵام ئەگەر خەڵکەکە بژمێرین دەبینین کە حزبی (أ) ٢٨٠ هەزار دەنگی هێنابوو لە وڵاتەکەدا لە کاتێکدا حزبی (ب) ٢٢٠ هەزار دەنگی دەست کەوتبوو[٢٠١].

حاڵەتی واش لە بەریتانیادا ساڵی (١٩٥١) روویدابوو کاتێك حزبی کرێکاران دووسەد هەزار دەنگی زیاتری هەبوو لە حزبی پارێزگاران بەڵام تەنها (٢٩٣) ناوچەیان دەستکەوت و حزبی پارێزگاران (٣٢١) ناوچە[٢٠٢].

لە ئەمەریکاشدا چەند سەرۆکێکی ئەمەریکی بەم شێوەیە سەرکەوتن هەرچەندە بە حیسابی ژمارەی دەنگەکانی سەرجەم وڵات ژمارەیەکی کەمتریان لە موناف‌سەکەیان دەست کەوتبوو[٢٠٣].

بەم شێوەیە سەرکەوتوو دەرکەوت و کورسییەکان دابەش کران و (حوکمی گەل) لە جاران زیاتر لە واقع دوور کەوتەوە.. واتە هەڵبژاردن دیموکراسیی تەواوی نەهێنا کایەوە، بەڵام دەبوایە پێشتر ئەم پرسیارەی خوارەمان بکردایە:

---

[٢٠١] بڕوانە: نقولا حداد، الدیمقراطیة، ل٧٠، نموونەکەی (حداد) بە شێوەیەکی ترەو ئێمە بۆ ئاسانی شێوەکەیمان گۆڕی.

[٢٠٢] کریم مسعد، الدیمقراطیة البریطانیة، ل١٦٢.

[٢٠٣] بڕوانە، ئەلفرێد لیلینتاڵ، إسرائیل ذلك الدولار الزائف، ل٥٣٥ هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی لە ئەمەریکادا دوو قۆناغەو روونکردنەوەی لێرەدا دەرچوونە لە باسەکانمان.

# کۆسپی یانزەیەم: ئایا هەڵبژاردن یەکسانە بە دیموکراسیی؟

بەر لە دوو سەدە بینثەم Benthamو بزووتنەوەی (لائحی) Chartism لە بەریتانیادا، بایەخێکی گەورەیان دابوو بە فراوان کردنی مافی دەنگدان بەلام وەك (لاسکی) دەڵێت کەس ئێستا وا بیر ناکاتەوەو ئەوانە مەسەلەکەیان زۆر بە ساکاری وەرگرتبوو[٢٠٤].

لە کۆنەوە تا ئێستا پێنج تیۆر لە بارەی دەنگدانەوە هەبوون. تیۆرێکیان دەنگدان بە (وظیفة)ی هاوڵاتیتی دەزانیت، هەیشە بە مافی دەزانێت، تیۆری نوێش بە (وظیفە)ی حکومەتی دەزانێت، تیورێکی ئەخلاقیش بە وەسیلەیەکی دەزانێت بۆ گەشەسەندن بە کەسایەتی تاکەکان ... تاد[٢٠٥]، هیچ تیۆرێکیش لەمانە لە لایەن هەموانە قبووڵ نەکراوە[٢٠٦]. بێ گومان پەسەند کردنی هەر تیۆرێك لەمانە چەند ئەنجامێکی دیاری کراوی لێ دەبێتەوەو دەبێتە مایەی لێك جیاوازییان بەلام چونکە هیچ کامیان لای هەموان پەسەند نییە کەواتە ئێمە (یان لە راستیدا: ئەوان) لەبەردەم کێشەیەکی (نظري) داین لە بارەی دەنگدانەوە. ئەم کێشەیەش لە ژێر دروشمی (هەر کار بڕوات) پشت گوێ خراوە.

کێشە گەورەکەش ئەوەیە ئایا ئەگەر هەڵبژاردن هەبێت دیموکراسیی هەیە؟ وەڵامەکە ئەوەیە کە هەڵبژاردن تەعبیر لە رای خەڵك ناکات، یاخود وەك دەوترێت:

---

[204] W. J. Shepard, Suffrage, in: Encycl. of the Social Sciences, vol. 14, p. 81.
[205] J. P. Harris, Elections, Encycl. of the Social Sciences, vol. 5, p. 447.
[206] Ibid. p. 450.

تەنانەت لەو ولاتانەش کە هەلّبژاردنێکی ئازادو دادپەروەرانەیان تێدایە سندووقی دەنگدان ئامێرێکی زۆر ناتەواوە بۆ تۆمارکردنی راو خواستەکانی دەنگدەر[207].

• لێکۆلەرەوەیەك بە ناوی (لانگرۆد) یش Langrod دەلّێت: بە تەواوەتی شتێکی ناڕاستە کە هەر نیزامێکی هەلّبژاردن یەکسان بکرێت لەگەلّ دیموکراسیی چونکە هەلّبژاردن دەتوانێت خزمەتی رژێمێك بکات کە دەسەلاّتی دەولّەت دەسەپێنێت (Authoritarian)، خزمەتەکەش ئەوەیە کە ئەو هەلّبژاردنە سروشتە دیکتاتۆرییەکەی ئەو رژێمە دادەپۆشێت[208]. ئێمەش لە دوو توێی ئەم کتێبەدا ئەو راستییە دەزانین کەوا هەلّبژاردن هەروەها سروشتی حوکمە دیموکراتییەکەی رۆژئاوا دادەپۆشێت کە حوکمی کەمایەتییە.

وتمان: ئەوسا هیوایەکی گەورە بە دەنگدان دەبەستراو هەولّ دەدرا ئەم مافە بدرێتە هەموو هاولاّتییەك نەك ئیحتکار بکرێت بۆ چەند چینێکی دیاری کراو. واتە بە بیری ئەوان دەنگدانێکی فراوانتر یەکسانە بە دیموکراسییەکی زیاتر. بەلاّم پێشتر بینیمان چۆن دەنگدانێکی فراوانتر یەکسانە بە دیموکراسییەکی کەمتر ئەویش لەبەر ئەوەی کە دەنگدان تا فراوانتر بێت مەسرەفێکی زۆرتر بۆ هەلّمەتەکانی هەلّبژاردن پێویست دەبێت، ئەمەش خۆپالاّوتن دەخاتە دەستی دەولّەمەندەکان، هەروەها مەسرەفی زۆریش بۆ پروپاگەندەی زۆر ئەوە دەگەیەنێت کە هێزە سیاسیو ئابورییەکان هەلّمەتێکی بەرفراوان دەکەنو بەمە کار لەسەر مێشکی خەلّك دەکەنو بڕیاری هەلّەیان پێ دەدەن.

ئەگەر هەلّبژاردن پێوانەی دیموکراسیی بێت کەواتە چەند لە ولاّتەکە هەلّبژاردنی جۆراو جۆر بکرێن ئەوەندە دیموکراسیی زیاترە، بەلاّم واقیع ئەمە بە درۆ دەخاتەوە چونکە حالّەتی وا لە ئەمەریکادا هەیە. لەو ولاّتەدا هەلّبژاردنی زۆر هەنو لە سالّێکدا چەند

[207] J. P. Harris, Elections, Encycl. of the Social Sciences, vol. 5, p. 451.
[208] Jean Boulois, Local Government as a Basis of and Training in Democracy, International Social Science Bulletin, vol. 5, no. 1, p. 19.

هەڵبژاردنی ناوچەیی ساز دەکرێت بەڵام لەگەڵ ئەوەشداو وەك وتمان ڕێژەی بەشدار کردن لە نزمترین ئاست دایە، هەروەها لەم هەڵبژاردنانەدا نەك هەر ئەندامانی پەرلەمانی ویلایەتەکەو حاکمی ویلایەتەکە هەڵ دەبژێردرێن بەڵکو هەروەها فەرمانبەری گەورەو قازی.. تاد، جگە لەمەش لە لیستەکاندا چەند یاسایەك هەن کە داوا لە هاولاتی دەکرێت دەنگ بدات لەسەریان.

ویلایەتی وا هەیە لە ئەمەریکادا لیستی (٥٠٠)ناوی تیادا دادەبەزێت بۆ ئەوەی پەنجا یان سەد کەسی لێ هەڵبژێردرێت[209] لیستی واش هەبووە کە ئەوەندەی مێزێك گەورەیە[210]. هەرچەندە هەوڵ درابوو کە هەڵبژاردنەکان کورت تر بکرێنەوەو ئەوسا بزووتنەوەیەك بۆ ئەم مەبەستە سەری هەڵدابوو تا رادەیەك سەرکەوتوو بوو[211]، بەڵام وازی لەم جۆرە نەهێنراوە چونکە لە بەرژەوەندیی سیاسییەکانە[212]، هەرچەندە کەسی نەشیاو هەڵدەبژێردرێن‌و خەڵك کوێرانە دەنگدەدەن[213]، واتە زیانی بۆ میللەت هەیە.

***

مەسەلەیەکی تر لە پەیوەندی نێوان هەڵبژاردن‌و دیموکراسیی ئەوەیە کە دەنگدان بریتی نییە لە دەربڕینی بیروڕا بەڵکو زیاتر بریتییە لە بەخشینی دەسەڵات بە حکومەت بۆ سەپاندنی هێزی دەوڵەت[214]. واتە دەنگدان پێسپاردنە (تفویض)ەو لەم پێسپاردنەدا گەل ڕاستەوخۆ حوکم ناکات بەڵکو دەسەڵاتەکان بە حکومەت‌و پەرلەمان دەسپێردرێن، کە

---

209 د. کۆیل، النظام السیاسي في الولایات المتحدة، ل١١١.

210 هـ. زینکو هاوریکانی، النظام السیاسي في الولایات المتحدة، ل١٢٢.

211 William. B. Munro, Short Ballot Movement, Encycl. of the Social Sciences, vol. 14, pp. 43-44.

212 دیڤید کۆیل، النظام السیاسي في الولایات المتحدة، ل١١٢.

213 بڕوانە بۆ ئەمانەو بۆ عەیبی تێرتری ئەم هەڵبژاردنە:
William. B. Munro, Lbid.

214 بڕوانە ستونزل و جیرلر، إستطلاع الرأي العام، ل٣٤.

ئەمەش دوور خستنی گەلە لە حوکم.. جگە لەوەی کە ئەمە مەترسییەکە بۆ خۆی چونکە ئازادی بە حاکم دەدات و لە هەمان کاتدا پێسپاردنەکە دەکاتە پاساو بۆ ئەم ئازادییەو بۆ کارەکانی.

ئاستێکی تری پێسپاردنیش، پێسپاردن لە ناو خودی حکومەت و پەرلەمان و بۆ دەسەلاتی بەجێهێنان، یان پێسپاردنی دەسەلات بە هەندێك وەزیر لە لایەن سەرۆکی دەسەلاتی بەجێهێنان... هۆی ئەم پێسپاردنەش ئەوەیە کە ئەو کەسانەی هەڵبژێردراون شارەزای چالاکیی ئیداری نین و پشت بە کەسانی ترەوە دەبەستن... ئەم نەزانینەو ئەم پێسپاردنەش نەك هەر لە شارە گەورەکاندا هەیە (کە کار تیایاندا فراوان و ئاڵۆزە) بەڵکو تەنانەت لە ناوچە بچووکەکان و لە گوندەکانیشدا هەیە"[٢١٥].

واتە خۆ دوور خستنی خەڵك لە حوکم و لە رێگەی پێسپاردنەوە گەیشتۆتە بچووکترین ئاستی وڵات. پاش هەموو ئەمانە دەتوانین وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە: ئایا هەڵبژاردن یەکسانە بە حوکمی گەل؟.

وەڵامەکەش ئەوەیە کە مەرج نییە ئەگەر هەڵبژاردن هەبێت دیموکراسیی هەبێت. دەشێت هەڵبژاردن هەبێت بەلام دیکتاتۆر حوکم بکات یان وەك (رۆژئاوا) هەڵبژاردن هەبێت بەلام حاکمی راستەقینە کەمایەتی بێت... دەشکرێت وڵاتەکە حوکمی گەلی تێدا ببینرێت بەلام هەڵبژاردن لەو وڵاتەدا نەبێت.

هەڵبژاردن و دیموکراسیی لە ماوەیەکدا پێکەوە هەبوون بەلام هەڵەکە لەوەدابوو کە وا زانرا پەیوەندی نێوان وەك پەیوەندی نێوان هۆو ئەنجام.

---

[215] J. Boulouis, op. Cit. , p. 42.

# کۆسپی دوانزەیەم: کێشەی نوێنەرایەتی:

نوێنەرایەتی یەکێکە لە پایەکانی دیموکراسیی (نوێ)و لە دیموکراسییە کۆنەکەی یۆناندا وجودی نەبوو.

خەڵك پێویستە نوێنەری خۆیان هەڵبژێرن بەڵام ئەم نوێنەرانەو بنەمای (نوێنەرایەتی) خۆی پرسیاری زۆرو گرفتی زۆر لەگەڵ خۆیاندا دەهێنن:

١- پەرلەمان کە گوایە نوێنەری خەڵکە بەو شێوەیەی کە باسمان کردبوو پێك بێت، واتە تەعبیری تەواو لە خواستی خەڵك ناکاتو وەك بینیمان حاڵەتی وا هەیە کە حزبێك کورسی زۆرتری پەرلەمانی دەست دەکەوێت کە بە حسابی ژمارەی سەرجەم دەنگدەران دەنگی کەمتری هێناوە، حاڵەتە هەرەباشەکەشی ئەوەیە کە حزبێك بەراستی زۆرینەی کورسییەکانی پەرلەمان دەهێنێت بەڵام ئەم زۆرینەیە بریتییە لە تەنها بەشێکی گەلو (دوو دڵەکان)و (ئەوانەی بەشدارییان نەکردووە).. تاد ناگرێتەوە.

٢- پەرلەمان خۆی کەمایەتییە لە چاو خەڵکدا... ئەمەش ئەساسی نوێنەرایەتییە، واتە نوێنەرایەتی ئەوەیە یەك کەس نوێنەری ژمارەیەکی زۆر تری کەسان بێت بەڵام ئەم شتە کە لە نوێنەرایەتیدا ئەساسە شتێکە لەگەڵ دیموکراسیدا ناڕێکە. کاتێکیش یەك کەس نوێنەری هەزار کەس بێت ناتوانین بە قەناعەتەوە بڵێین کەوا هەزار کەسەکە حوکم دەکەن چ جای ئەوەی ژمارەکە لە هەزار کەس زیاتر بێت.

لە ئەمەریکادا یەك ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەران نوێنەری (٣٠٠) تا (٤٠٠) هەزار کەسە[٢١٦]، لە بەریتانیاشدا ژمارەکە (٨١) هەزار کەسە[٢١٧] (بە پێی ژمارەی پەنجاکانی ئەم سەدەیە). ئایا لێرەدا دەتوانین باسی حوکمی گەل بکەین کاتێك (٣٠٠) هەزار کەس یەك نوێنەریان هەبێت؟ یا هەوڵ بدەین ژمارەکان کەم بکەینەوە، یا لە جیاتی (٣٠٠) هەزار

---

[٢١٦] هـ. زینلو هاوریکانی، النظام السیاسی فی الولایات المتحدة، ل٢٥٣.

[٢١٧] رەنی، سیاسة الحکم، ج١، ل٣٧٨.

کەس (٣٣) هەزار کەس وەربگرین کە ژمارەی ساڵی (١٧٨٩) بوو (ساڵی یەکەم کونگرسی ئەمەریکا)، بەڵام ئەگەر هەر (٣٣) هەزار کەس یەك نوێنەریان هەبێت ئەو کاتە بۆ ئەمڕۆی ئەمەریکا پێویستە ژمارەی ئەندامانی ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەمەریکی خۆی لە (٣٧) هەزار ئەندام بدات[٢١٨]. ئەویش چونکە ژمارەی دانیشتوانی ئەمەریکا زۆر زیادی کردووە لە چاو ساڵی (١٧٨٩)، بێگومان هیچ ئەنجوومەنێکی وا لە جیهاندا نەبووەو نییە بەڵام تەنانەت ئەگەر هەشبێت هێشتا کێشەی نوێنەرایەتی چارەسەر نابێت چونکە هێشتا زۆرە (٣٣) هەزار کەس یەك نوێنەریان هەبێت. چارەسەرەکەس بریتییە لە لادان لە دیموکراسیی، چەند ژمارەی دانیشتوانی وڵاتەکەش زیاتر بێت ئەوەندە زیاتر پێویستە لادانەکە گەورەتر بێت لەمەشەوە دوو ئەنجاممان دەست دەکەوێت:

**یەکەم**- بۆ ئەوەی حوکمێکی عەمەلی تر هەبێت پێویستە بنەمای (نوێنەرایەتی) هەبێت، چەندیش ژمارەی نوێنەرەکان کەمتر بێت لایەنی عەمەلی بەهێزتر دەبێت، واتە (دیموکراسیی پوخت)و (عەمەلییەت) دوو شتی دژ بەیەکن و لە پێناوی (عەمەلیەت)دا پێویستە زۆر لە دیموکراسیی لا بدەین.

**دووەم**- دیموکراسیی لەگەڵ ئەو وڵاتانە ناگونجێت کە ژمارەی دانیشتوانیان زۆرە.

٣- بەڵام لەمە نادیموکراسیی تر ئەوەیە کە تەنانەت ئەگەر بە (٣٣) هەزارەکە رازی بووین ئەوا نوێنەرە کە لە راستیدا نوێنەری هەموو ئەو (٣٣) هەزار کەسە نییە چونکە هەموویان دەنگی بۆ نادەن بەڵکو بەشێك لە دەنگەکانی دەست دەکەوێت.

٤- ئەگەر بە نوێنەرایەتی رازی بین و بۆ ئەوەی پەرلەمان پلەی نوێنەرایەتی خۆی زیاد بکات پێویستە نەك هەر لە سیاسەتدا خەڵك نوێنەریان هەبێت بەڵکو هەروەها لە

---

[٢١٨] سەرچاوەی سەرەوە، با خوێنەر تێبینی ئەوە بکات کە لێرەشدا عەیبێکی(دیموکراسیی راستەوخۆ)مان تووش بوو ئەویش دیموکراسیی بە کەڵکی وڵاتێك نایەت کە ژمارەی دانیشتوانی زۆر بێت.

ئابوریشدا[٢١٩]، واتە هەموو توێژو چینەکانو بە پێی ژمارەیان نوێنەری خۆیان هەبێت.. دیارە ئەمەش عەمەلی نییە.

رەخنەیەکی تر ئەوەیە کە ژمارەی ئافرەتان ئەوەندەی ژمارەی پیاوانە بۆیە دەبێت ئافرەتان نیوەی کورسییەکانی پەرلەمانیان هەبێت[٢٢٠].

رەخنەیەکی تریش ئەوەیە کە پێویستە بە پێی نوێنەرایەتی ئەندامانی پەرلەمان وێنەیەکی گەلەکە بن، واتە بۆ نموونە لە وڵاتێکدا کە ٧٠٪ی خەڵکەکە نەخوێندەوار بن پێویستە ٧٠٪ی ئەندامانی پەرلەمان هەروەها نەخوێندەوار بن[٢٢١]. بێگومان تەنها مرۆڤی شێت شتی وا دەڵێت.. بۆیە لە وەڵامی ئەمەدا وتراوە کە پێویستە ئەندامانی پەرلەمان وێنەیەکی میللەت نەبن بەڵکو پێشەوا یان مامۆستای میللەت بن[٢٢٢]... ئەم وەڵامەش خۆ دزینەوەیە لە کێشەکەو خۆ خەڵەتاندنە.

٥- بەڵام ئەم خۆ دزینەوەیەش ئەگەر قەناعەتیشمان پێ بکات ئەوا ئامانجی خۆی ناپێکی چونکە ئەندامەکانی پەرلەمان نە پێشەوای میللەتنو نە مامۆستاین. سەرەتا دەسەڵاتەکان لە پەرلەماندا وەکو یەك نێوان ئەندامەکان دابەش نەکراوە.. کاتی ئەوەش نێت باسی ئەمە بکەین... پاشان کەم کەس لەو ئەنداندامانە کە وەسفی (مامۆستا)یان بەسەردا دەچەسپێت. بۆ نموونە لە ئەمەریکاو وەك چۆن ئەندامی باشی ئەنجوومەنی

---

[٢١٩] دکتۆر عبدالحمید متولی، الوجیز في النظریات.. ، ل٢٢٦.

[٢٢٠] گاستۆن بوتول، سوسیولوجیا السیاسة، ل٨٠، گۆڤاری فەرەنسیی (لوپوان) -ساڵی ١٩٩٦- باسێکی بڵاو کردبووەوە لە بارەی ئافرەتێکی سویدی کە چەند ماف دەستکەوتووە کەچی هێشتا تەنها ٤٢٪ی ئەندامانی پەرلەمانی سویدی ئافرەتن و (سوید) پلەی یەکەمی هێناوە.
ئەمەریکا (پێشەوای ئازادیی و مافی مرۆڤ و دیموکراسی!!) پلەی (٢٤)ەمی هێناو و(١١٪)ی ئەندامانی کۆنگرس ئافرەتین. فەرەنساش (دایکی ئازادی!!) پلەی (٣٦)ەمی هێناوەو رێژەکە (٦٪)ی بڕوانە: Le Point, 1229, 6/4/1996, p.42.

[٢٢١] دکتۆر عبدالحمید متولی، الوجیز... ، ل٢٢٩.

[٢٢٢] سەرچاوەی سەرەوە.

پیران هەن هەروەها ئەنجوومەنەکە ئەندامی.. دەبەنگو گەمژەی زۆری تێدایە[222].

(لاسکی) کە ئەمە دەڵێت هەروەها دوو سیناتۆر (ئەندامی پیران)ی ویلایەتی (دیلاوەیر) دەهێنێتەوە کە زیاتر نوێنەری کۆمپانیایەك بوون نەك نوێنەری خەڵکەکە.

دەشڵێت کە سیناتۆری وا لە ویلایەتی (پێنسلڤانیا) هەبوون دەبوایە لە بەندیخانە بوونایەو سیناتۆری وا لە ویلایەتی (کەنتەکی)و (ئیلینۆی) هەبوون کە جێگەی گونجاویان هۆڵێکی مۆسیقا بوو[224].

٦- ئەنجوومەنی پیران ئەنجومەنی دووەمی پێ دەوترێت ناوی (دووەم) بۆ جیا کردنەوەی لە ئەنجوومەنی (یەکەم) بەکار دێت کە ئەم یەکەمەیان نوێنەری راستەقینەی خەڵکە. ئەنجوومەنی دووەم لە بەریتانیادا (ئەنجوومەنی لۆردەکان)ەو لە فەرەنسادا (ئەنجوومەنی پیران)و.... تاد. هەبوونی دوو ئەنجوومەنیش زیاتر هۆیەکی مێژوویی‌ی هەیە بۆیە ژمارەیەك کەس رەخنە لە هەبوونی ئەنجوومەنی دووەم دەگرنو بە زیادی دەزانن[225].

لە حاڵەتی ئەنجوومەنی پیرانی ئەمەریکیشدا ئەندامەکان نوێنەری گەل نین چونکە هەر ویلایەتێك ئەگەر دانیشتوانی دەیان ملیۆن کەس بێت یان یەك ملیۆن کەس دوو ئەندامی هەیە. ئەنجومەنی لۆردەکانی بەریتانیاش -هەرچەندە زۆربەی دەسەڵاتەکانی لێ سەندراوە- نوێنەری چەند توێژێکی کەمی گەلەکەیە..

---

[222] هـ. لاسکي، الديمقراطية الأمريكية، ل١٢٧.

[224] سەرچاوەی سەرەوە.

[225] بۆ (پەسەند کردن)و (رەخنە) لە نیزامی دوو ئەنجوومەن بڕوانە: لاسکي، مدخل الى علم السياسة، ل٨٩، هەروەها: لاسکي، أصول السياسة، ج٣، ل٥١ بە دواوە، هەروەها، دکتور عبدالحميد، الوجيز...، ل٢٢٠ بە دواوە.

ئینجا دێینە سەر (نوێنەرایەتی) وەك تیۆر. مەسەلەی ((نوێنەرایەتیی دروست)) لە سەدە ناوەڕاستەکانەوە گەورەترین مەسەلەیە کە ناکۆکی لە بارەیەوە هەبووبێت[٢٢٦]، لەم بارەیەشەوە چەند تیۆرێك هەبوون؛ یەکەمیان تیۆری (وەکالەتی ئیلزامی)یە کە تیایدا ئەو کەسانەی کە ئەندامی پەرلەمانەکەیان هەڵبژاردووە دەتوانن ئەو ئەندامە لابەرن هەتا ئەگەر ماوەکەشی تەواو نەکردبێت، ئەمەش تیۆرێکی کۆنە، هەرچەندە لە ئەمەریکاداو لەسەر ئاستی هەندێك ویلایەتدا ماوە ئەویش بە شێوەی لابردنی نوێنەر (إقالة النائب) Recall[٢٢٧]. تیۆری دووەمیش ئەوەیە کە ئەو وەکالەتە نێوان نوێنەرو ئەو کەسانە نییە کە هەڵیان بژاردووە بەڵکو نێوان سەرجەم پەرلەمانو سەرجەم میللەتە. سێیەمیشیان دەڵێت کە هیچ وەکالەتێك نییە بەڵکو مەسەلەکە تەنیا هەڵبژاردن (أختیار)ی چەند کەسێکی لێهاتووە پاشان هەموو پەیوەندییەکانی نێوان نوێنەرو ئەوانەی کە هەڵیان بژاردووە دەپچڕێت[٢٢٨]. بە بێ ئەوەی کە بچینە ناو قووڵاییی ئەم باسە دەڵێین کەوا هەر یەکێك لەم تیۆرانە بە شێ خۆی رەخنەی لێ گیراوە بۆیە وتراوە کە هەر هەوڵێك بۆ دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان نوێنەرو ناخبەکان لەسەر بناغەیەکی تیۆری (نظري) هەوڵێکی سەرنەکەوتووە چونکە ئەم پەیوەندییە پەیوەندییەکی تیۆری نییە بەڵکو عەمەلیو واقیعە[٢٢٩].

کەواتە مەسەلە گرنگەکە بریتییە لەو پەیوەندییەی نێوان هەردوولا. لەم بارەیەشەوە دوو پرسیار هەن: ئایا نوێنەرەکە بە پێی بۆچوونی خۆی یان بە پێی

---

[٢٢٦] تۆ رەنی، سیاسة الحکم، ج١، ل٣٥٥.

[٢٢٧] بڕوانە پێشتر: (دیموکراسیی نیوە ڕاستەوخۆ) بۆ (لابردنی نوێنەر).

[٢٢٨] بڕوانە: د. عبدالحمید متولی، الوجیز، ل٢١٥ بە دواوە، د. إبراهیم درویش، الدولة، ل٣٢٦.

[٢٢٩] د. إبراهیم درویش، الدولة، ل٣٢٧، هەروەها د. محمد کامل لیلة، النظم السیاسیة، ل٥٤١.

خواستەکانی ناوچەکەی خۆی بڕیار لەسەر مەسەلەکان بدات؟ کە بڕیاری خۆشی دا ئایا چی رەچاو بکات: خواستەکانی ناوچەکە یان خواستی هەموو گەل[230]؟

هەڵبەتە ئەگەر هەڵبژاردن و دامەزراندنی پەرلەمان لەسەر ئەساسی بنەمای نوێنەرایەتی نەبێت، دیموکراسیی تووشی کێشەیەکی وا نابێت بەلام دانانی نوێنەرایەتی بە شتێکی بنچینەیی لە دیموکراسییدا پرسیاری وەکو ئەوانەی سەرەوە دێنێتە کایەوە.

پاش ئەم باسەش بەلام بە پێویستی نازانین باس لە پایەکانی نیزامی نوێنەرایەتی بکەین کە چەندن و چین و موناقەشەیان بکەین و ئەوەندە دەڵێین کە ئەمەی ئێستا باسمان کرد بریتیی بوو لە **بنەمای دووەمی دیموکراسیی کە پێی دەوترێت: بنەمای حکومەتی نوێنەرایەتی(مبدأ الحكومة النيابية)**.. لەبەر ئەوەش چیتر باسی ئەم بنەمایە ناکەین.

## کۆسپی سیانزەیەم: حوکمی کەمایەتی:

تا ئێستا باسی ئەو کۆسپانەمان کرد کە دێنە بەردەم (حوکمی گەل)، گرنگترین کۆسپیش لەبەردەم ئەم حوکمی گەلەدا بریتییە لەوەی کە دەسەلاتی راستەقینە لە دەوڵەتدا لە دەستی گەلدا نییە بەڵکو لە دەست کەمایەتییە. لە باسەکانی پێشووشدا هەندێك رووی ئەم حوکمی کەمایەتییەمان بینی. لەبەر گرنگێتیی دەوری کەمایەتییش بەشێکی تایبەتیی بۆ تەرخان دەکەین و یەك بە یەك ئەو هێزانە وەردەگرین کە حوکمی کەمایەتی پیادە دەکەن. پاش ئەوەش دەچینە سەر بنەماکانی تری دیموکراسیی.

---

[230]F. W. Coker. C. C. Rodee. Representation. Encycl. of the Social Sciences. vol. 13. p. 313.

# بەشی سێیەم

# دیموکراسیی حوکمی کەمایەتییە نەك حوکمی گەل

حوکمی کەمایەتیی لە دیموکراسییدا لە دوو لایەنەوە هەیە: لایەنی ئەو کەسانەی کە حوکم کراون (-گەل) ئەویش وەك باسمان کرد کە کەمێکی خەڵك دەبنە هۆی سەرکەوتنی پاڵێوراوەکە لە هەڵبژاردنەکەدا... دووەم لایەنیش لایەنی حاکمەکان و هێزەکانی تری وڵات کە بریتین لە کەمایەتیی خاوەن دەسەڵات. لایەنی یەکەمی حوکمی کەمایەتی لە هەندێك لە کۆسپە پێشووەکاندا باس کران دەمێنێتەوە لایەنی دووەم کە پێشتر چەند نموونەیەکمان لە بارەیەوە بینی و کە لێرەدا لە بارەیەوە دەدوێین.

**هێزەکانی کەمایەتیی بریتین لەمانەی خوارەوە:**

یەکەم- پەرلەمان و کەمایەتییەکەی ناو پەرلەمان.

دووەم- دەسەڵاتی بەجێهێنان.

سێیەم- حزبەکان.

چوارەم- کۆمەڵەکانی بەرژەوەندی یاخود کۆمەڵەکانی فشار.

پێنجەم- هێزە ئابوورییەکان.

شەشەم- هێزەکانی راگەیاندن.

سەرەتاش با ئەختێك باس لە مەسەلەی (دەسەڵات) بکەین:

# چڕبوونی دەسەڵاتو ململانە لە پێناویدا

تێگەیشتن لە دەسەڵات لایەنی زۆری دیموکراسیی و هەموو جۆرێکی تر حوکممان بۆ روون دەکاتەوە. هەر باسکردنێکی دیموکراسیش دوور لە باسکردنی مەسەلەی دەسەڵات کارێکی ناواقعییە.

دیاردەیەکی گرنگی دەسەڵات ئەوەیە کە ئەم دەسەڵاتە قبووڵی پەرشو بڵاوبوون نابێت بەڵکو هەمیشە رووەو چڕبوون دەچێت. ئەو سەردەمانەش کە دەسەڵات خۆی وەکو دەسەڵاتێکی گەل یان بەشێکی گەورەی گەل دەنوێنێت سەردەمێکی کورتو (إستثنائي)ن.

ئەنجامی چڕبوونی دەسەڵاتیش ئەوەیە کە دەسەڵات هەمیشە یان لە دەستی کەمایەتییدا دەبێت یان لە دەستی تاکە کەسدلو هەر باسێك لە بارەی حوکمی زۆرینەوە قسەیەکە دوورە لە واقع.

دیاردەیەکی تری دەسەڵات ئەوەیە کە دەسەڵات قبووڵی بۆشایی ناکات، واتە هەر دەبێت کەسێك یان کۆمەڵێك هەبن کە خاوەن دەسەڵات بن و ئەگەر بارودۆخێك بێتە پێشەوە کە تیایدا دەسەڵات نەمێنێت ان لاواز بێت یان بۆشاییەکی تێدا بکەوێت ئەوا زوو کەسێك یان کۆمەڵێك دەسەڵاتەکە دەگرنە دەست یان ئەو بۆشاییە پڕ دەکەنەوە.

دیاردەی سێیەمی دەسەڵات ئەوەیە کە لە پێناوی ئەم دەسەڵاتەدا ململانە روو دەدات ئیتر ئەگەر ململانەیەکی توندو تیژ بێت یان ململانەیەك بێت وەسیلەیەکی تر بگرێتە بەر. ئەم ململانەیەش لە پێناوی دەسەڵاتدا لە نزمترین ئاستەوە دەست پێدەکات تا دەگاتە ئاستی جیهانی (کە ململانەی نێوان هێزە نێو دەوڵەتییەکانە) ئەم کۆششە بۆ بەدەست کەوتنی دەسەڵات چەند هۆیەکی لە دوا دایە: بە دەست کەوتنی قازانجی

ئابووری، به دەست کەوتنی مەزنێتی، خۆپاراستن له خۆسەپاندنی هێزەکانی تـر، پیـادە کردنی بیروباوەڕێك... تاد.

دیاردەیەکی تری دەسەڵاتیش ئەوەیە کە **دەسەڵات هۆیەکی گەندەڵییە**[٢٣١].

لـە میانـەی ململانـە بـۆ دەسـتکەوتنی دەسـەڵاتو بـۆ پاراسـتنی... هـەموو رەوشـتێك دەخرێتە ئەو لاوەو هەموو وەسیلەیەك بەرەوا دەزانرێن بۆ بەدیـهێنانی ئامانجـەکان. ئـەو کەس و کۆمەڵـەش کـە بـەر لــە دەسـتکەوتنی دەسـەڵات گـەندەڵ نـەبوون لـە ٩٩٪ی حاڵەتەکاندا پاش دەسەڵات گەندەڵ دەبن. (مەکئایڤەر) دان بەوەدا دەنێت کە تەنانەت لە دیموکراسیشدا سیاسییەکان پـاش هـەڵبژاردنیان دەوڵەمـەند دەبن چونکـه لــە هــەموو نیزامەکاندا حوکم کردن کارێکی بە قازانجە[٢٣٢].

لە ئەنجامی ئەوانـەی سـەرەوە ئاسـاییە ئەگـەر کەمایەتی حوکـم بگرێتـە دەسـت چونکە کەمایەتی توانای کۆششی هەیە بۆ دەسەڵات، پاشان و کە ئـەو دەسـەڵاتەی گرتـە دەسـتو بـە پێـی بنـەمای (چڕبوونـی دەسـەڵات) بازنـەی حوکـم تەسـك تـر دەبێتـەوەو کەمایەتییەکە بچووکتر دەبێتەوە. ئەگەر لـە حاڵەتێکیشـدا جـەماوەر یـان کۆمـەڵێکی زۆر خەڵك حوکم بگرنە دەست هەر زوو بە پێی بنەمای چڕبوونەکە کەمایەتی حوکم بـۆ خـۆی زەوت دەکات.

ئەم دەسەڵاتەی کەمایەتی شتێکی شاراوە نەبووە لای بیریارانی رۆژئاوا.. سەرەتا جارێکی تر قسەی (روسۆ) دەهێنینەوە ئەویش کە ئەگەر واتای وردی وشەی دیموکراسیی وەربگرین دەبینین کە دیموکراسیی راستەقینە قەد نەبووەو قەدیش نابێت چونکە شتێکی نارێکە لەگەڵ نیزامی سروشتی کە ژمارە زۆرەکەی خەڵك حوکم بکاتو ژمـارە بچووکەکـە حوکم کراو بێت.

---

[٢٣١] لۆرد ئەکتۆن (١٨٣٤–١٩٠٢) لەم بارەیەوە دەڵێت: هەموو دەسەڵاتێك گەندەڵییەو دەسـەڵاتی رەهـا گەندەڵییەکی رەهایە، بڕوانە؛ د. بیرنز، الدیمقراطیة، ل٦٦.

[٢٣٢] مەکئایڤەر، تکوین الدولة، ل١٨٠.

هەروەها قسەی زانای ئەمەریکی (مەکنایفەر) دەهێنینەوە کە دەڵێت کەوا ڕاستی ئەوەیە کە هەموو گەل حوکم ناکات بەڵکو هەمیشە کەمایەتی حوکم دەکات.

ڕەخنە گرانیش لە دیموکراسیی ئەمەیان باشتر زانیوە. (گایتانۆ مۆسکا)ی ئیتالی (١٨٥٨-١٩٤١) دەبوت کەوا دانانی حکومەتەکان لە ناو قاڵبێکی دیاریکراوی وەك (پاشایەتی)، (ئەرستۆکراسی)، (دیموکراسیی) کارێکی سەخیفە چونکە تەنها یەك جۆر حوکم هەبووە ئەویش حوکمی کەمایەتی[٢٣٣].

(ڤیلفریدۆ پارەیتۆ)ی ئیتالی (١٨٤٨-١٩٢٣) کۆمەڵگەی کردبووە دوو چین: چینی هەڵبژاردەو چینی غەیری هەڵبژاردە، چینی هەڵبژاردەش دوو بەشە: هەڵبژاردەی فەرمانڕەواو هەڵبژاردەیەك کە حوکم ناکات. هەڵبژاردەی فەرمانڕەواش دوو بەشە: کۆمەڵێکی ناوەوە کە هێز پیادە دەکات (ئێستا پێشەوایانی حزبەکان)و کۆمەڵێکی دەرەکی کە دەسەڵاتی لە دەستدایە[٢٣٤].

ڕۆبێرتۆ میشیلز (١٨٧٦-١٩٣٦) لە لایەکی ترەوە یاسایەکی داڕشتبوو بەناوی (یاسای ئاسنینی حوکمی کەمایەتی) کە باس لەوە دەکات کە هیچ میولیەك نییە بۆ هیچ بزووتنەوەیەك یان حزبێك کە سەربکەوێت بە بێ ڕێکخستن، ئەم ڕێکخستنەش ناوێکی ترە بۆ ئۆلیگارشیەت (حوکمی کەمایەتی)[٢٣٥].

هەر دوو مۆسکاو میشیلز ئەوە بە درۆ دەخەنەوە کە ژمارەی خەڵك چەند زۆر بن حاکمەکان زۆر دەبن چونکە (مۆسکا) بۆ ئەوە دەچێت کە چەند ژمارەی دانیشتوان زیاتر بێت ئەوەندە ژمارەی ئەندامانی چینی فەرمانڕەوا کەم دەبێتەوە، (میشیلن)یش دەڵێت کە چەند قەبارەی حزبەکە گەورەتر بێت ئەوەندە زیاتر کارەکان بە بازنەیەکی تەسکی پێشەوایان‌و فەرمانبەران دەسپێردێن.

---

[٢٣٣] ئیدوارد بێرنز، أفکار ڤ صراع، ل٦٧.

[٢٣٤] سەرچاوەی سەرەوە، ل٦٥.

[٢٣٥] سەرچاوەی سەرەوە، ل٧١.

دوو نووسەرو بریاری بەریتانیش هـ. جـ. وێلـز (١٨٦٦-١٩٤٦)و بێرنـارد شـۆ دەیانوت کەوا خەڵك ناتوانن خۆیان خۆیان حوکم بکەنو هەردووکیان حوکمەتێکیان پەسەند دەکرد کە لە کەمایەتییەکی لێهاتوو پێك هاتبێت[٢٣٦].

جگە لە رەخنەگران؛ زۆر لە لایەنگرانی دیموکراسیی لە رۆژئاوادا دەزانن کەوا کەمایەتییەکی بەهێز چیی بۆ دەکرێت. (مەکئایڤەر) دەڵێت: کێشە ئەزەلییەکەی دیموکراسیی ئەوەیە کە دیموکراسیی تاقمە بە هێزەکانی لە شوێنی خۆیاندا بوەستێنێتو ولیان لێ بکات بنەما دیموکراتیەکان بپارێزن[٢٣٧].

وتمان چڕبوونی دەسەڵات لە هەموو ئاستەکاندا دەبینرێت بەر لە سەدەیەکیش (دو تۆکڤیل) تێبینی کردبوو کە نیزامی کۆنو نوێ رووەو چڕبوونێکی زیاتر هێزو ئاڵۆزبوونێکی زیاتر دەچێت[٢٣٨].

بەرزترین ئاست ئاستی جیهانییە. ئەوسا جیهان دوو جەمسەری تێدابووو پاشان یەکێکیان (کۆمەڵەی کۆمۆنیست) هەرەسی هێناو جیهان ئەمڕۆ یەك جەمسەر بە خۆیەوە دەبینێت کە ئەمەریکایە.

لە ناو نەتەوە یەکگرتووەکانیش چڕبوونی دەسەڵاتو حوکمی کەمایەتی هەیە. ئەنجومەنی ئاسایش کە بریتیە لە نوێنەری (١٥) دەوڵەت چەند دەسەڵاتێکی هەیە کە لەوانەی نەتەوە یەکگرتووەکان گەورەترن. لەناو ئەم (١٥) دەوڵەتەشدا تەنها پێنج دەوڵەت هەن کە ئەندامی هەمیشەیینو مافی هەڵوەشاندنەوە (ڤیتۆ)یان هەیە، لەناو ئەو پێنج دەوڵەتەشدا ئەمەریکا لە هەموویان بە هێزترەو هەندێك جار خواستی ئەو سەردەکەوێت.

---

[٢٣٦] سەرچاوەی سەرەوە، ل١٣٢-١٣٣.

[٢٣٧] مەکئایڤەر، تکوین الدولة، ل٢٧٢.

[٢٣٨] بڕوانە؛ رۆبێر پیلو، المواطن والدولة، ل٨٢.

له ئاستی یەکێتیی دەوڵەتیشدا چەند رواڵەتێکی دیاردەی چڕبوونەکە هەیە کە یەکێکیان ئەو دیاردەیەی کە تێبینی کراوە کەوا دەوڵەتە فیدرالییەکان رووەو ئەوە دەچن کە ببنە دەوڵەتی یەکگرتن[239]. دەوڵەتی فیدرالی بریتییە لە چەند ویلایەتێك کە هەر یەکێکیان پەرلەمان‌و دەسەڵاتی دیاریکراوی خۆی هەیە، لە کاتێکدا دەوڵەتی یەکگرتن دەوڵەتێکی خاوەن مەرکەزییەکی گەورەترە.

نموونەی تری چڕبوون ئەو هێزانەی ناو کۆمەڵگە کە لە لاپەڕەکانی داهاتوودا باسیان دەکەین‌و کە مەبەستی سەرەکیمانن. (لاسکی) باسی ئەم چڕبوونە لە دەستی چەند کەسێکدا لە ئەمەریکادا دەکات‌و دەڵێت کەوا ئەم شتە لەوێدا ئاشکرایە لە کاتێکدا لە بەریتانیادا دەشاردرێتەوە، لە فەرنساشدا بنەماکە هەیە هەرچەندە چەسپاندنەکە جیاوازە[240].

نموونەش زۆرە لەسەر ئەوەی دەسەڵات قبووڵی بۆشایی ناکات یەکێك لەوانە پەیوەندی نێوان سەرۆك وەزیران‌و پەرلەمان لە فەڕەنسا (بەر لە ساڵی ١٩٥٨). ئەو کاتە ئەگەر سەرۆك وەزیران بەهێزو خاوەن کەسایەتی بووایە دەیتوانی لایەنی بەهێزی بەلای دەسەڵاتی بەجێهێناندا (حکومەت) با بدات بەڵام ئەگەر بە پێچەوانەوە حکومەتەکە دوو دڵ بووایە هێزەکە دەچووە پاڵ پەرلەمان[241].

هۆیەکی دەست گرتنی کەمایەتی بەسەر دەسەڵاتدا ئەوەیە کە بایەخی خەڵکی بە سیاسەت بایەخێکی کاتییەو تەنها چەند مەسەلەیەك دەگرێتەوە نەك سەرجەم مەسەلەکانی سیاسەت لە کاتێکدا سیاسیەکان کاری سیاسییان کردۆتە پیشەیان[242].

---

[239] دکتۆر سعد عصفور، القانون الدستوري، ل٢٥٨ پەراوێز.

[240] هـ. لاسکی، الديمقراطية الأمريكية، ل١٨٨.

[241] P. Laroque, the Role of the Executive in the Modern State, France, in: International Social Science Bulletin, vol. 10, p. 216.

[242] بڕوانە: هـ. لاسکی، الديمقراطية الأمريكية، ل١٨٨.

بەواتایەکی تر بایەخ نەدانی خەڵك ڕێگە خۆش دەکات بۆ هەندێك کەس کە جڵەوی کارەکان بگرنە دەست.

بەم شێوەیە هەڵەی ئەو کەسانە دەردەکەوێت کە دیموکراسیی وەك بیروباوەڕو نیزامێکی مرۆڤانەو دۆستی جەماوە نیشان دەدەنو ئەو قسەیە ڕاست دەبێت کە (بیردێ) وتبووی ئەویش کەوا دامەزرێنەرانی دیموکراسیی وایان زانی کە دیموکراسیی نیزامی عەقڵە بەڵام لە ڕاستیدا دیموکراسیی بووە تاقیکردنەوەی هێز"[٢٤٣].

## یەکەم- پەرلەمان و کەمایەتی لە ناو پەرلەماندا

بینیمان چۆن هەموو گەل لە هەڵبژاردندا بەشداری ناکاتو چۆن دەنگی دەنگداران دابەش دەبن بەسەر چەند حزبێك بۆیە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا هەر حزبێك ڕێژەیەکی کەمی دەنگەکانی دەست دەکەوێت (٢٠٪، ٣٠٪، ...) کەواتە هەر حزبێك لەمانە نوێنەری کەمایەتییەکە.. واتە پەرلەمان لە دوو لاوە کەمایەتییە:

١- پەرلەمان کەمایەتییە چونکە ژمارەی ئەندامانی کەمن (١٠٠،٢٠٠،...، ٥٠٠، ٦٠٠ ئەندام).

٢- پەرلەمان نوێنەری کەمایەتییە چونکە هەر حزبێکی ناو پەرلەمان بەشێکی دەنگەکانی هێناوە.

بەڵام جگە لەمە لەناو پەرلەمان کەمایەتیی تر هەن.. جا لەبەر ئەوەی پێشتر باسی هەردوو خاڵی (١)و (٢)ی سەرەوەمان کرد؛ لێرەدا باسی تەنها کەمایەتیی ناو پەرلەمان دەکەین.

---

[٢٤٣] ج. بیردو، الدیمقراطیة، ل٤٨.

لە دیموکراسییە کۆنەکەی یۆناندا وەك (ئەرستۆ) باسی کردووە، چەند تاقمێك لەناو (ئەنجوومەنی هاولاتییان)دا دروست دەبوون و هەندێکیان لە دەوری پێشەوایەکدا کۆدەبوونەوە[244]، واتە دروست بوونی تاقمەکان لە هەر ئەنجوومەنێکدا شتێکی کۆنەو شتێکی چاوەڕێ کراوە چونکە ئەنجوومەن، گەورە بێت یان بچووك، کەسانێك لە خۆی کۆناکاتەوە کە لە هەموو شتێکدا وەك یەك بن بۆیە بەهۆی جیاوازی بیروبۆچوون و بەرژەوەندی و شێوەی کارکردن... تاد چەند تاقمێك سەرهەڵدەدەن.

وتمان کە هەر حزبێك لە ناو پەرلەماندا نوێنەری کەمایەتییەکە بەلام ئەم ئەندامانەی حزبەکە کە لە پەرلەماندان کەمایەتییەکی بچووکیان لە ناودا هەیە کە چەند ئەندامێکی خاوەن دەسەلاتی گەورەترن.

ئەندامانی حزبەکە کە لە ناو پەرلەماندان کۆنگرەیەکی ئامادەکار (مؤتمر تمهيدي) دەبەستن و ئەم کۆنگرەیە لیژنەی بەجێهێنان (اللجنة التنفيذية) هەڵدەبژێرێت کە بریتییە لە ژمارەیەکی کەمی ئەندامان. ئەم لیژنەیەش مافی ئەوەی هەیە هەڵوێستی حزب لە بارەی مەسەلەکان و هەڵبژاردنی وەسیلەکان دەست نیشان بکات. لە ئەمەریکادا ئەم لیژنانە پێیان دەوترێت (لیژنەکانی ئاراستە کردن) یان (لیژنەکانی دانانی نەخشەی سیاسیی)، لە بەریتانیاشدا (لیژنەی پێشەوایەتی) یان (وەزارەت) ئەگەر حزبەکە حزبی فەرمانڕەوا بێت، ئەگەر حزبەکەش حزبی نەیار (معارض) بێت لیژنەکە پێی دەوترێت وەزارەتی سێبەر (حكومة ياخود وزارة الظل)[245]، لە فەرنساشدا ناوی (دەستەی بەجێهێنەری حزب) لەو لیژنانە دەنرێت[246].

---

[244] مۆریس دیڤرجێ، النظم السياسية، ل١٨.

[245] وەزارەت یان حکومەت بریتییە لە سەرۆك وەزیران و وەزیرەکان لە کاتێکدا حکومەت یان وەزارەتی سێبەر حزبی نەیار پێکی دەهێنێت تا ئامادە بێت کاتێك لە دوارۆژدا حزبەکە حوکمی دەست بکەوێت.

[246] ئۆل، رەمزی، سياسة الحكم، ج٢، ل١١٣.

وەك كورتەیەكی باسەكانی سەرەوەش: پەرلەمان كەمایەتییە، حزبەكانیش لەناو پەرلەماندا كەمایەتیی كەمایەتین، لیژنەی بەجێهێنانیش دەبێتە (كەمایەتیی كەمایەتیی كەمایەتی).. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئاستێكی بەرزتر (یان نزمتر... نازانین ناوی چیی لێ بنێین) هەیە بۆ حوكمی كەمایەتیی كەمایەتی ئەویش ئەگەر حزبەكە حزبی حاكم بێت و وەزارەتی پێك هێنا ئەوا وەزیرەكان وەكو یەك دەسەڵاتیان نابێت. هەموو وەزیرەكان لە كۆبوونەوە ئاساییەكاندا بەشدار دەبن بەڵام لە كاری گرنگدا تەنیا ژمارەیەكیان دەور دەبینن. ئەم باسەش زیاتر بابەتی (دەسەڵاتی بەجێهێنان) دەگرێتەوە بۆیە بۆ ئەو بەشەی هەڵدەگرین.

نموونەیەكی تری كەمایەتیی ناو پەرلەمان (یانەی دەرەوە—النادي الخارجي)و (یانەی ناوەوە—النادي الداخلي) لە ناو ئەنجوومەنی پیرانی ئەمەریكیدا.

یەكەمیان بریتییە لە هەموو ئەندامانی ئەنجوومەنەكە، دووەمیشیان لە (٢٠) تا (٣٠) ئەندام پێك هاتووەو هەر چەندە ئەمانە دەستەیەكی نارەسمین بەڵام دەسەڵاتی راستەقینە لە دەستی ئەواندایە، بەڵگەش هەیە كە (یانەی ناوەوە) لە هەموو پەرلەمانێكی دیموكراتیدا هەبێت[٢٤٧].

كەمایەتییەكی گرنگی تری پەرلەمان بریتییە لە (لیژنە هەمیشەییەكان) هەر یەكێك لەم لیژنانە لە چەند ئەندامێكی پەرلەمان پێك هاتووەو ئەندامەكانیان بەپێی كورسییەكانی هەر حزبێك دەست نیشان دەكرێن، هەر لیژنەیەك تایبەتە بە كارێكی دیاری كراو، وەك لیژنەی دارایی و لیژنەی بازرگانی، لیژنەی كشتوكاڵ... تاد ناوی (هەمیشەیی) لەم لیژنانە دەنرێن بۆ ئەوەی جیا بكرێنەوە لەو لیژنە كاتییانەی كە بۆ مەبەستێكی كاتی دادەمەزرێن و پاشان هەڵدەوەشێن.. بەڵام ئەندامەكان لە ناو لیژنە هەمیشەییەكان تا سەر ئەندام نین بەڵكو ئەگەر هەڵبژاردن كرا و دابەشكردنی كورسییەكانی پەرلەمان گۆڕانی بەسەردا هات پێكهاتنی لیژنەكانیش گۆڕانی بەسەردادێت.

---

[٢٤٧] بڕوانە سەرچاوەی سەرەوە، ل١١٨-١١٩.

نموونه لەسەر لیژنەکان لیژنەکانی هەر یەکێك لە دوو ئەنجوومەنەکەی کۆنگرسی ئەمەریکی کە سەرۆکی هەر لیژنەیەك ئەندامی حزبی زۆرینەیە، ئەندامەکانیش بەپێی ڕێژەی هەر یەکێك لە دوو حزبەکە لە ناو ئەنجوومەنەکەدا دەست نیشان دەکرێت. لە وڵاتانی ترشدا لیژنەکان شێوازێکی تر وەردەگرن بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ئەو لیژنانە لە هەموو وڵاتێکدا دەسەڵاتێکی گەورەیان هەیە. کاری ئەم لیژنانەش بەزۆری ئەوەیە کە دیراسەی پرۆژەی یاساکان بکەن، هەر لیژنەیەکو بەپێی بابەتەکەی خۆی، بۆ نموونە ئەگەر پرۆژەی یاسایەکی تایبەت بە مەسەلەیەکی کشتوکاڵی پێشکەش بە پەرلەمان کرا، ئەو پرۆژەیە ڕەوانەی لیژنەی کشتوکاڵ دەکرێت ئەویش دیراسەی دەکاتو ئەو کەسانە بانگ دەکات کە پەیوەندییان بە مەسەلەکەوە هەیە. پاشان بڕیار دەدات ئەگەر پرۆژەکە ڕەفز بکات یان قبووڵی بکات یان بە دەستکارییەوە قبووڵی بکات... لە دوو حاڵەتی دووەمو سێیەمیشدا پرۆژەکە ڕەوانەی پەرلەمان دەکرێتەوە بۆ موناقەشەکردنی.

بەم شێوەیە دەبینین کە دەسەڵاتی ئەم لیژنانە لەسەر دوایەمین ناوەرۆکی یاساکان چەند گەورەیە بۆیە هەندێك کەس لە بارەی لیژنەکانی (ئەنجوومەنی نوێنەران)و (ئەنجومەنی پیران)ی ئەمەریکاوە ناوی (ئەنجومەنی سێیەم) لەو لیژنانە دەنێن[248].

(ویلسۆن)ی سەرۆکی پێشووی دەیوت کەوا کۆنگرس لەو ماوەیەی کە کار دەکات تەنها نمایشێکە بۆ خەڵك ئەگینا ئەو کونگرسەی کە بەڕاستی کار دەکات بریتییە لەو کۆنگرسەی کە لە ژوورەکانی لیژنەکاندایە[249]. هەروەها دەشوترێت کەوا حکومەتی ئەمەریکی حکومەتێکە لیژنە هەمیشەییەکانی کۆنگرس بەڕێوەی دەبەن[250].

هەرچەند ئەم لیژنانە تایبەتن بە کۆنگرسو پێویستە کارەکانیان لەو ئاستەدا بهێڵنەوە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵیان داوە دەسەڵاتەکانیان بگەیەننە دەسەڵاتی

---

[248] بڕوانە سەرچاوەی سەرەوە، ل١٠٤.

[249] W. Wilson. Op. Cit, p. 69.

[250] Ibid, p. 55.

(بەجێهێنان)، بۆ نموونە باسی ئەوە کرابوو کە لە کۆنگرسدا چەند یاسایەك دەرچوویـوون کە لیژنەکانی کۆنگرس بەشدار دەکەن لەو بڕیارانـەی کە تایبـەتن بـە کـاری فەرمانبـەرە ئیدارییەکان[251] (کە سەر بە بەجێهێنانن). کۆنگرس هـەروەها هـەوڵی دابـوو کـە لیژنـەکان دەستیان هەبێت لە کارەکانی دەسەڵاتی بەجێهێنان ئەویش لە رێگەی داولکردنی راپـۆرت نووسین‌و پرس کردن بە لیژنەکان لە لایەن ئەو دەسەڵاتەوە، تەنانەت هەندێك جار دەبێت رەزامەندی لیژنەکان وەربگیرێت[252].

ئەم لیژنانە جگە لـە دەسـەڵاتی گـەورەیان، کـاری نـاپەولش دەکـەن، بـۆ نموونـە ئەندامەکانی لیژنەکان بەر لەوەی بڕیارێك بدەن ئەوەیان لا گرنـگ دەبێـت کـە بزانـن کـام لایەن دەرچوونی یاساکەی مەبەستەو کـام لایـەن ئـەو یاسـایەی پـێ قبـووڵ نییـە، پـاش زانینی ئەمەش هەردوو لا دەخەنە تەرازوو[253]، واتە بڕیار بۆ ئەو لایەنە دەدەن کە بـەهێزە یان کە بەرژەوەندی خۆیان دابین دەکات.

دیارە کەمێك لیژنە هـەن کـە کـاری رەواو پـاك دەکـەن بـەڵام (لیـدەرەر) دەڵێـت: رۆژنامەکان یەك دێر لە کارەکانیان باس ناکەن[254].

ئـەم لیژنانـە لـە نـاو هـەموو پەرلـەمانێکدا هـەن هەرچـەندە رەنگـە پێکـهاتن‌و وەسیلەکانیان جیاواز بن. لە بەریتانیادا کارو (إمتیازات)ی لیژنەکانی پەرلەمان لە دەستی

---

[251] Public Adminstration Review, vol. 16, no. 1, p. 74.

ئەویش لەم سەرچاوەیە وەرگیراوە:

C. P. Cotter, J. M. Smith, in, the Western Quarterly, June, 1957.

دوو نووسەرەکە چەند نموونەیەك لەسەر ئەمانە دەهێننەوە.

[252] Ibid.

[253] دیفید ك. کۆیل، النظام السیاسي في الولایات المتحدة، ل١٦٦.

[254] و. لیدەرەر، أمة من غنم، ل١١٥. ئینجا لیدەرەر دەپرسێت: ئایا گوناهی رۆژنامەگەرییە یان گونـاهی ئەندامانی ئەو لیژنەیەیە کە بە وردی‌و بە پاکی کار دەکەن لە جیاتی خۆ نواندن؟ یان ((ئایا ئێمە تەنـها بایەخ بە شانۆییە سیاسییە هەزلیەکان دەدەین؟)).

حکومەتدان[255]. بەشێوەیەکی گشتیش ئەگەر یەکگرتنو (ضبط)ی حزبی لە وڵاتەکەدا گەورەتر بێت (وەکو بەریتانیا) ئەوا دەسەڵاتی لیژنەکان کەمترە[256].

· جگە لە لیژنەکان کەمایەتیی تر هەن وەکو ئەو کۆمەڵانەی کە بۆ مەبەستێکی دیاریکراو دروست دەبن، بۆ نموونە ژمارەیەك ئەندامی کۆنگرس کۆمەڵێکیان دروست کرد (کتلة) کە تایبەتە بەکاروباری کشتوکاڵ، ئەم کۆمەڵە توانی دەست بگرێت بەسەر دوو کۆنگرس (٦٦)و (٦٧) –واتە بۆ ماوەی چوار ساڵ– لە بیستەکانی ئەم سەدەیەدا[257]. ئەم (کتلة)یە کە (یەکێتی جووتیاران) دروستی کردبوو دەنگی بۆ ئەو یاسایانە دەدا کە یەکێتییەکە پێشکەشی دەکردن‌و چاودێریی ئەندامانی لیژنەکانیان دەکردو کاریان دەکردە سەر لیژنەکان[258].

کاتێك خەڵك باس لە (کەمایەتی لە پەرلەماندا) دەکەن مەبەست لێی حزبەکانی کەمایەتییە، واتە ئەو حزبانەی کە کورسیی کەمیان هەیە، بەڵام مەبەستی ئێمە لە (کەمایەتی) لە هەموو باسەکانی سەرەوەدا شتێکی تر بوو. مەبەستی ئێمە ئەوەیە کە تەنانەت لە ناو (حزبی زۆرینە)دا کەمایەتییەك هەیە کە دەسەڵاتی گەورەی لە دەستدایە هەروەها مەبەستمان لە جۆرە کەمایەتییەکانی تر بوو.

بەڵام ئەگەر باسی کەمایەتی بە واتا باوەکەی بکەین دەڵێین کەوا ئەوانیش نموونەیەکی دەسەڵاتدارێتی پیشان دەدەن هەر چەندە ئەم دەسەڵاتەیان سنووردارە.

کەمایەتییەکان بەو واتایە دەتوانن خۆیان بسەپێنن ئەویش بە رلوەرێوی‌و بە تەگەرە دانان‌و دروستکردنی کێشە. یەکێکیش لە وەسیلەکانیان دواخستنی بڕیارە Filibuster. لە ئەنجوومەنی پیرانی ئەمەریکادا هەر ئەندامێك دەتوانێت بە ئارەزووی خۆی زۆر قسە بکات‌و موناقەشەی پرۆژەی یاساکان بکات ئەویش بە مەبەستی ئەوەی کە

---

[255] W. Wilson, Op. Cit, p. 78.

[256] رمزی، سیاسة الحکم، ج٢، ل١٠٧–١٠٨.

[257] لێکرو رۆش، منهج السیاسة الأمریکیة الداخلیة، ل١٢٨–١٢٩.

[258] سەرچاوەی سەرەوە، ل١٢٩.

ئەو كاتە تەواو بێت كە بۆ مەسەلەكە تەرخان كراوە.. لەبەر ئەوەش ئەندامانی حزبو كەمايەتی چەند سەعاتێكی دوورو درێژ قسە دەكەن[٢٥٩]، بۆ ئەم مەبەستەش شتێكی ئاساییە ئەگەر ئەندامەكە لە وتارەكەيدا بەشێكی كتێبێكی خواردن دروست كردن يان ئينجيل يان كتێبێكی مەشقی سەربازی بخوێنێتەوە[٢٦٠].

ئەمەو چەند كارێكی تری حزبی كەمايەتی، حزبی زۆرينە ناچار دەكەن خواستەكانی ئەم حزبە تا رادەيەكی دياری كراو رەچاو بكاتو بەم شێوەيە حزبی كەمايەتی دەسەڵاتێك بۆ خۆی دەپچڕێت.

***

دەمێنێتەوە باسی چەند كێشەيەكی سەرەكاری پەرلەمان بكەين يەكێك لەوانە ئەوەيە پەرلەمان ناچار دەبێت پشت ببەستێت بە ژمارەيەكی زۆری فەرمانبەران ئەويش لەبەر دوو هۆ؛ يەكەميان ئەوەيە كە پەرلەمان كەمايەتييە بۆيە هەموو كارەكانی پێ ناكرێت، دووەميش ئەوەيە زۆربەی ئەندامانی پەرلەمان لێهاتوو (پسپۆڕ) نين.

ئەم چينە بيرۆكراتييەش كە پەرلەمان پشتی پێوە دەبەستێت لە فراوان بووندايە. ساڵی (١٩٤٧) لە ئەمەريكادا (٢٠٣٠) فەرمانبەری وا هەبوون بەڵام ساڵی (١٩٧٩) بوونە (١٠٦٧٩) واتە لە (٣٠) ساڵدا ئەم فەرمانبەرانە ٣٠٠٪ زيادیان كرد[٢٦١]. ئەمەش بە هۆی زياد بوونی ئەو مەسەلانەی كە پێويستييان بە پسپۆڕییە. ئەم زياد بوونەش ئيمكانيەتی موناقەشەی بە سوودی ناو پەرلەمان كەم دەكاتەوە[٢٦٢]،چونكە ئەمانە زۆر لە كارەكانی ئەندامانی پەرلەمان بەڕێوە دەبەن.

---

[٢٥٩] ديڤيد كۆريل، النظام السياسي... ، ل١٦٩، هەروەها ئێرنست گريفيت، نظام الحكم... ، ل٤٤.

[٢٦٠] رەنی، سياسة الحكم، ج٢، ل١٠٩.

[٢٦١] رەنی، قنوات السلطة، ل١٧١.

[262]Pierre Laroque, Op. Cip. p. 217.

ژمارەی زۆری ئەو فەرمانبەرانەش کێشە بۆ (حوکمی گەل) دروست دەکات چونکە ئەو فەرمانبەرانـە لـە لایـەن خەڵکەوە هەڵنـەبژێردراون لەبـەر ئـەوە مەسئولیەتیان نییـە لەبەردەم خەڵکدا بەڵکو تەنها پەرلەمان لێیان بەرپرسیارە.

بەم شێوەیەش پەرلەمان وەك کەمایەتی بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ هۆیەکی لاواز کردنی دەسەڵاتی گەلە، بە واتایەکی تر پەرلەمان چونکە کەمایەتییە هەموو کارەکانی پێ ناکرێت بۆیە پشت دەبەستێت بە فەرمانبەران، ئەمانیش مەسئول نین بەرامبەر گەل.

کێشەیەکی تر بۆ دەسەڵاتی گەل لە ئاستی پەرلـەماندا بریتییـە لـە کـاری نهێنی؛ خەڵکی رێگەیان پێ دەدرێت کە بچنە ناو پەرلەمانەکان و تەماشای موناقەشاتەکانی بکەن بەڵام کاری راستەقینە (وەك زانیمان) لە لیژنەکاندا دەکرێت. بەڵگەیـەکیش لەسـەر ئـەوە دیمەنێکی دووبارە بـووی دوو ئەنجوومەنکـەی کۆنگرس: لـە ئەنجوومەنکەدا لـە کـاتی وتاری ئەندامێك دەبینیت کە زۆری کورسییەکان بەتاڵن، ئەو ئەندامانەش کە ئامادەن یان شت دەخوێننەوە (لە جیاتی گوێ گرتن) یان قسە لەگەڵ یەکتر دەکەن.. تەنها کەمێکیان گوێ دەگرن. کە کاتی دەنگدانیش دێت و زەنگەکان لێ دەدرێن ئەندامەکان پۆل پۆل دێنە ژوورەوە بۆ ئەوەی دەنگ بدەن. دوای ئەوە یەکسـەر دەچنـە دەرەوە، ئەمـەش بەڵگەیـە لەسەر ئەوەی کە کارەکان لە دەرەوەی هۆڵی دوو ئەنجوومەنکە دەکرێن واتە لـە پشـتی پـەردەوە، وەك وتراویشـە؛ هۆڵـی دوو ئەجومەنکـە بریتـین لـەو بـازاڕەی کـە ئـەو کـەلو پەلانەی تێیدا دەفرۆشرێن کە لە شوێنی تردا دروست کراون[٦٦٣].

جگـە لەمـەش کارەکـانی تـری ئـەو ئەندامانـە نهێنین، شـتێکی ئاسانیشـە ئەگـەر زانیاریی زۆرت دەست بکەوێت لە بارەی لیژنەکان و ئـەندامانی لیژنـەکان و مێـژووی ژیـانی ئەندامانی کۆنگرس ئەویش لە رێگەی کتێـبی سـاڵانەی کۆنگـرس (رابـەری کۆنگـرس)[٦٦٤]. بەڵام قەد ناکرێت –وەك (لیدەرەر) دەڵێت– ناوی ئەندامانی کۆنگرسـت دەسـتبکەوێت..

[٦٦٣] د. کۆیل، النظام السیاسی.. ، ل١٦٠–١٦٢.

[٦٦٤] ه. زینەر هاورێکانی، نظام الحکم في الولایات المتحدة، ل٢١٠.

خۆیان‌و ژنەکانیان‌و دەستەو دایەرەکەیان کە لەسەر حیسابی حکومەت‌و بە ناوی بەدوادا چوونی مەسەلەکان گەشت بە ناو هەموو جیهاندا دەکەن.. (لیدەرەر) هەروەها دەڵێت: پار (ساڵی ١٩٥٩) تەنها بۆ (هۆنگ کۆنگ) کە شوێنێکی سیاحییە- زیاد لە هەزار کەسایەتی گەشتی وایان کردبوو"[٢٦٥].

گەورەترین نهێنیش لە کارەکانی لیژنەکاندایە. (ویلسۆن) دەڵێت کەوا گەل ئاگاداری موناقەشاتی لیژنەکان نییە"[٢٦٦]. زۆربەی کۆبوونەوەکانیش نهێنین. بۆ نموونە ساڵی (١٩٧١) ٣٦٪ی کۆبوونەوەکان نهێنی بوون، ساڵی (١٩٧٢)ش رێژەکە بووە ٤٠٪ بەڵام هەندێك لیژنەی گرنگ هەن کاری نهێنی تر دەکەن، بۆ نموونە ساڵی (١٩٧١) لیژنەی (مخصصات)ی دارایی لە ئەنجومەنی نوێنەراندا ٩٢٪ی کۆبوونەوەکانی بە نهێنی سازدا"[٢٦٧].

وەك وتیشمان هاوڵاتی دتوانێت ئامادەی موناقەشاتی پەرلەمان ببێت بەڵام ئاسان نییە بۆی راپۆرتەکانی لیژنەکانی دەستبکەوێت[٢٦٨]، بێگومان لەوەش زەحمەت تر ئامادەی موناقەشاتی لیژنەکان بێت.

ئەم کارە نهێنییەی ناو پەرلەمانیش بەڵگەیەکی ترە کە دیموکراسیی رێگەی زۆرە بۆ خەڵەتاندنی گەل، خوێنەر لە بەشێکی تری کتێبەکەدا نموونەی تری نهێنی لە حوکمدا دەبینێت‌و زیاتر لەمە دڵنیا دەبێت.

---

[٢٦٤] و. لیدەرەر، أمة من غنم، ل١٠٨.

[266]W. Wilson. Op. Cit. p. 71.

[٢٦٥] ه. شیللەر، المتلاعبون بالعقول، ل٧٣-٧٤.

ه. زبنكو هاوریكانی، نظام الحكم والسیاسة.. ، ل٢١٠.

دوایەمین کێشە کە لێرەدا باسی بکەین‌و کە لە راستیدا یەکەم مەترسی بوو کە دیموکراسیی خوازان دەریانبڕیبوو بریتییە لە مەترسیی ئستبدادی پەرلەمان.

ئەو پەرلەمانەی کە گوایە نوێنەری گەلە دەتوانێت ببێتە دیکتاتۆرێکی خۆسەپێنەر. (ویلسن) باسی حاڵی زەمانی خۆی دەکات (کۆتایی سەدەی نۆزدە) کە چۆن بەپێی دەستووری ئەمەریکی هاوسەنگی لە نێوان دەسەڵاتەکاندا هەیە بەڵام راستی ئەوەیە کە سەروەری بۆ کۆنگرسە[269]. ویلسۆن دەڵێت: هەمیشە مەرکەزێکی دەسەڵات هەیە، لە لای ئێمە (= ئەمەریکای ئەو کاتە) بریتییە لە کۆنگرس هەرچەندە کتێبەکان باسی هاوسەنگیی دەسەڵاتەکان دەکەن[270]. ئەم حاڵەتەش هەروا لە فەرەنسادا بینرابوو ئەویش بەر لە دەستووری ساڵی (١٩٥٨).

ئیستیبدادی پەرلەمان تەنها ناڕاستەی دەسەڵاتی بەجێهێنان نەکرابوو بەڵکو ناڕاستەی هەموو گەل دەکرێت. بڕیارە کۆن‌و نوێکان لەم ئستبدادەی پەرلەمان ترسا بوون، بۆیە لەم بارەیەوە دەوترێت کە دیکتاتۆرییەتی پەرلەمانی خراپترین جۆری دیکتاتۆرییەتە لە جیهاندا[271] خراپی دکتاتۆریەتی پەرلەمان لەوە دایە کە دیکتاتۆریەتەکەی خۆی لە پشتی دروشمی حوکمی گەل‌و سەروەریی میللەتدا دەشارێتەوە.. واتە دیکتاتۆریەتێکە شەرعیەت بەو دکتاتۆریەتە دەدات.

بەڵام بەهەر حاڵ سەردەمی ئستبدادی پەرلەمان سەردەمێکی کورتەو دەبێت زوو رێگە چۆڵ بکات بۆ چەند هێزێك کە لە خۆی شیاوترن بۆ پیادە کردنی یاسای (حوکمی کەمایەتی)...

---

269 W. Wilson, Op. Cit, p. 28.

270 Ibid, p. 30f.

271 لێلی‌و رۆش، منهج السیاسة...، ل٤١.

# دووەم —دەسەڵات بەجێهێنان

# (السلطة التنفيذية)

پەرلەمان هەر خۆی لە مەیداندا نییە بەڵکو هێزێکی تر هەیە کە وەك وتمان لەو شیاوترە بۆ پیادەکردنی حوکمی کەمایەتیو دەستگرتن بەسەر دەسەڵاتی گەورەدا ئەویش دەسەڵاتی بەجێهێنان،

دەسەڵاتی بەجێهێنان یەکێکە لەو هێزانەی کە حوکمی کەمایەتی پیادە دەکەن. دەسەڵاتی سەرەکیش لەم بەشەدا لە دەستی کۆمەڵە کەسێکی کەمدایە ئەوانیش سەرۆك وەزیرەکان (ئەگەر نیزامەکە سەرۆکایەتی بێت) یان سەرۆك وەزیرانو وەزیرەکان (ئەگەر نیزامەکە پەرلەمانی بێت). ئەم دەستە بچووکەش دەسەڵاتێکی گەورەی هاتۆتە دەست، کە لەوە گەورەترە کە بۆی دانرابوو.

لە هەندێك وڵاتدا هەوڵ درابوو ئەم دەسەڵاتە بێ هێز بکرێت، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ولەیەکی مێژوو لە بارەی ئەو پادشا یان ئەو دیکتاتۆرەی کە وردە وردە دەسەڵاتە زۆرەکان بۆ خۆی دەبات. بەڵام هەر مێژوو خۆی سەلماندی کە ئەم بیرکردنەوەیە چەند لە واقع دوورە ئەویش چونکە بارودۆخی ناوەوەی وڵاتو لەمە گرنگتر: پەیوەندییەکانی وڵاتەکە بەدەرەوە دەسەڵاتێکی بەهێزی بەجێهێنان دەکەنە داواکارییەکی پێویست. پێشتریش هۆکانی فەشەل هێنانی دیموکراسیی کۆنی یۆنانمان هێنایەوە کە هۆیەکیان (لاسکی) باسی کردبوو ئەویش رێگە نەدان بە دروستکردنی دەسەڵاتێکی بەجێهێنانی وا کە چالاکانە لە بواری پەیوەندییەکانی دەرەوەدا کار بکات.

دەسەڵاتی بەجێهێنان ئەمڕۆ لە جاران بە هێزترە، هۆیەکیش لە پشتی ئەم بەهێزکردنە، هەیە ئەویش مامەڵە لەگەڵ دەستووری وڵاتدا ئیتر بەچاك کردنی دەستوور

تا دەسەڵاتێکی گەورەتر بەم بەشە ببەخشێت وەکو فەڕەنسا (١٩٥٨) یان ئیسرائیل (١٩٩٦) یان بەهۆی بە کار هێنانی ئەو دەسەڵاتەی کە دەستوور بەخشیویەتیو کە پێشتر وەکو پێویست بە کار نەهێنرابوو ئەویش وەکو ئەمەریکا.

بەڵام لە راستیدا مامەڵە کردن لەگەڵ دەستووردا تەنها ئەنجامە بۆ هۆی تر، کە هۆی جەوهەرین ئەوانیش وەکو:

١- سەردەمەکەمان کە سەردەمی ململانەی جیهانی سەختەو سەردەمی خێرایی یە (عصر السرعە) رێگە بە هەبوونی دەسەڵاتێکی بێ هێزی بەجێهێنان نادات. هەندێکیش لە هۆکانی خوارەوە ئەمە روون دەکەنەوە.

٢- خواستی سیاسییەکان بۆ بەهێز کردنی ئەم دەسەڵاتە.

٣- خواستی گەل: دەسەڵاتی بەجێهێنان زیاتر لە پەرلەمان سەرنجی خەڵك رادەکێشێت چونکە سەرۆکی ئەم دەسەڵاتە تاکە کەسێکە(سەرۆکی کۆمار یان سەرۆك وەزیران)، لە کاتێکدا پەرلەمان ژمارەیەکی جۆرلو جۆری کەسانە. وتیشمان کە خەڵك هەمیشە حەز بە هەبوونی پێشەوایەك دەکەن، چەندیش دەسەڵاتی ئەو پێشەوایە گەورەتر بێت ئەوەندە زیاتر دەبێتە جێگەی سەرنج و(جانبية)، سەرنجی خەڵکیش لەمە زیاتر دەبێت ئەگەر ئەو پێشەوایە خاوەن کەسایەتییەکی بەهێز بێت. بۆ نموونە سەرچاوەیەکی پەنجاکانی ئەم سەدەیە دەڵێت کە ئەمەریکییەکان چیتر گوێ نادەنە سەرۆکی لەسەر خۆ بەڵکو سەرۆکێکی بەهێزو بە توانایان دەوێت [٢٧٢]. نموونەیەکی تریش فەرەنسای ساڵی (١٩٥٨) کە ٨٠٪ی دەنگدەرەکان وتیان (بەڵێ) بۆ ئەو دەستوورەی کە جەنەراڵ دیگۆل خستبوویە بەردەمیان بۆ ئیستفتاء، ئەو دەستوورەی کە دەسەڵاتێکی

---

[٢٧٢] کلنتۆن رۆسیتەر، النظام الرئاسي في الولايات المتحدة، ل ١٢٤.

بەخشی بەسەرۆك كۆمـار كـه هیـچ پادشـایەك خـەونی پێـوه نـەدیبوو تەنانـەت نـاپلیۆنی یەكەم (واتە ناپلیۆن بۆناپارت)[٢٧٣].

لێرەدا ئیشكالیەتێكی تری دیموكراسـیی دەبینیـن: خەڵكەكـە سـەرۆكێكی بـەهێز بەشی بە جیهێنانیان دەوێـت ئەمـەش هـێزی دەسـەڵاتی جـەماعی كـەم دەكاتـەوە، ئـەم بەهێزكردنـەی بـە جیهانیانیش ئـەنجامێكی نـا دیموكراتـی تـره لـە چـاو بـەهێز كردنـی پەرلەمان. گەل خۆی (حوكمی گەل) لاوازتر دەكات.

٤- هۆی چوارەمی بەهێزكردنی دەسەڵاتی بەجێهێنان كەسـایەتیی سـەرۆكی ئـەم دەسەڵاتەیە: بۆ نموونە وتراوە كە كەسایەتیی سەرۆكی ئەمـەریكی هۆیـەكی زیـاد بوونـی دەسەڵاتەكەیەتی[٢٧٤].

٥- ئاڵۆز بوون‌و زۆر بوونی كارەكانی دەوڵەت كە لە ئەنجامێكی زۆر بـوون‌و ئـاڵۆز بوونی كارەكانی سەردەم خۆی. ئەمەش وا پێویست دەكات دەوڵەتەكە ببێتە دەوڵەتێكی (ئیجابی) واتە بەكار فێركردن‌و تەندروستی‌و زەمانەتی كۆمەڵایـەتی‌و كاروبـاری تـری‌وڵات هەڵسێت‌و چیتر وەك دەوڵەتی (سلبی) نەمێنێتەوەو كارەكـەی تەنـها كۆكردنـەوەی بـاج‌و دامەزراندنی سوپا وشتی لەم بابەتە نەبێت. بـەپێی (لاسـكی) ئـەم گۆڕانـە بـۆ دەوڵـەتی ئیجابی گرنگترین گۆڕانكارییە لەسەرەتای سەدەی بیستەوە[٢٧٥].

ئەم گۆڕانەش یەكێكە لە هۆكانی بەهێز بوونی سەرۆكایەتیی ئەمەریكی[٢٧٦].

---

[273]Pierre Courtade, The Referendum in France: Results and Prospects .in; International Affairs.11.1958.p. 34.

[274]Clinton Rossiter, The President and Presidency, Amrican Heritage, vol. 7, no 3. p. 31.

ئەم باسە كورتەیەكی بەشێكی كتێبی نووسەر (النظام السیاسی في الولايات المتحدة)یە ل ٥٥ بەدواوە.

[٢٧٥] هـ. لاسكی، حقوق الانسان، ل ٤.

[276]Clinton Rossiter.Op. Cit. , p. 30.

٦- ئەنجامێکی ئاڵۆز بوونی کارەکانی دەوڵەت ئەوەیە کە ئیدارییەکان لەجاران زیاتر ئەهەمیەتیان زیاد دەکات. وتمان ئیدارییەکان ئەو فەرمانبەرانەن کە خەڵك هەڵیان نەبژاردوون بەڵو دادەمەزرێنرێن. ئەمانە ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر دەبن و دەورێکی گەورەتر دەبینن. پێشتریش زانیمان چۆن لە کۆنگرسی ئەمەریکا لەماوەی (٣٠)ساڵدا ٣٠٠٪ زیادیان کردووە. زیاد بوونی ژمارەی ئەمانە لە بەشی بەجێهێناندا گەورەترە چونکە دەزگاکانی ئەم بەشە زۆرترن.

تایبەتییەکی ئەم ئیدارییانە ئەوەیە کە لە کاری خۆیاندا دەمێننەوە لە کاتێکدا کەسایەتییە هەڵبژاردراوەکان زوو دەگۆڕێن. تایبەتییەکی تریش ئەوەیە کە هەریەکێکیان لەیەك مەسەلە پسپۆڕە، ئەم شارەزا بوونەش دەورێکی گەورەی لەم مەسەلەیەدا پێ دەبەخشێت[٢٧٧]. بەر لە سەدەیەکیش (گوستاف لوبۆن) تێبینیی ئەوەی کردبوو کە چەند یاسای زۆرتر دەربچن ئەوەندە ژمارەی فەرمانبەران زۆر دەبن (بۆ چەسپاندنی ئەو یاسایانە)و دەسەڵاتی ئەمانیش زیاتر دەبێت تا دەبنە ئاغای ڕاستەقینەی وڵاتە شارستانییەکان[٢٧٨]. لەبەر ئەمە هەندێك ڕەشبین هاواریان لێ هەڵساوە لەو دەسەڵاتە گەورەیەی ئیدارییەکان و ناوی (حوکمی ئستبدادی نوێ)یان لەو دەسەڵاتەی ئیدارییەکان ناوە[٢٧٩]. دیارە ئەمانە حسابیان بۆ باقی هێزەکانی دەوڵەتیان نەکردووەو مەترسییەکیان لە ڕادە بەدەر گەورە کردووە.

جێگەی مەبەستی ئێمە لەم دیاردەیە ئەوەیە کە دەسەڵاتی بەجێهێنان کە ئەم ژمارە زۆرەی فەرمانبەرانی لەژێر دەستدایە دەبێتە خاوەن دەسەڵاتێکی گەورەتر.

---

[٢٧٧] ڕەنی، سیاسة الحکم، ج ٢، ل ١٨٩.

[٢٧٨] گوستاف لوبۆن، روح الجماعات، ل ١٨٥.

[٢٧٩] ڕەنی، سیاسة الحکم، ج ٢، ل ٢٠٤ هەرچەندە نووسەر دەڵێت: بەلای کەمەوە ئێستا کاتی ئەمە نەهاتووە.

هەرچەندە ئەم فەرمانبەرانە لەسەر حسابی دەسەلاتی بەجێهێنان گەورە دەبن بەلام ئەم دەسەلاتە بۆ مونافەسە کردنی دەسەلاتەکانی تر بەکاریان دەهێنێت[280].

٧- دەوری قەیرانەکان: تیۆرێك هەیە کە باسی لە بەهێز بوونی دەسەلاتی بەجێهێنان لەدەولەتی دەستووریدا بەهۆی روودلنی قەیرانەوە، هەتا ئەگەر ئەم بەهێزبوونەش بەشێوەیەکی کاتیبێت[281]. قەیرانەکان لە ئەمەریکادا وایان لە خەلك کرد رووبکەنە پێشەولیەکی تاك[282]، بۆ نموونەقەیرانە ئابوورییە گەورەکەی سالی (١٩٢٩) بەدواوە، لە فەرەنساشدا خواستی چارەسەرکردنی کێشەی جەزائیر وای لە خەلکەکە کرد دەستوورەکەی سالی(١٩٥٨) پەسەند بکەن. ئێمەش لەو بروایە داین کە قەیرانەکان نەك هەر گۆران بەسەر دەسەلاتەکانی ولاتدا دەهێنن بەلکو بۆیان هەیە سەرجەم نیزامی دیموکراتیش بگۆرن‌و نیزامێکی تر بهێننە کایەوە هەروەك حالەتی ئیتالیای فاشی‌و ئەلمانیای نازی.

٨- پەیوەندی نێوان ولاتان: بواری دەرەوە زیاتر پێویستی بە دەسەلاتێکی بەهێز هەیە کە بە خێرایی‌و چالاکانەو بێ دوو دلی کاربکات. (ویلسن) باس لە سەرۆکە کۆنەکانی ئەمەریکا دەکات کە چۆن لە رێگەی پەیوەندییەکانی دەرەوەوە دەوری خۆیان بینی‌و چۆن لە کاتی ئەودا وەزعەکە گۆرا[283]، (رۆسیتەر)یش دەلێت کەوا دەتوانین

---

[280] رەنگە بوترێت:ژمارەی زۆری فەرمانبەران لەگەل (حوکمی کەمایەتی) دا نارێکە بەلام:

١-فەرمانبەران چەند زۆر بن هێشتا کەمایەتین.

٢- فەرمانبەران لەژێر دەست کەمایەتی‌دا (= دەسەلاتی بەجێهێنان) کار دەکەن.

٣- هەتا ئەگەر ببنە دەسەلاتیی سەر بەخۆ ئەوا لەناو ئەوانیشدا کەمایەتی سەر هەلدەدات چونکە هەموویان وەکو یەك گرنگو بەدەسەلات نین.

[281] رەنی، سیاسة الحکم، ج ٢، ل ١٥٦.

[282] P. Courtade, Op. Cit., p. 33.

[283] . W. Wilson, Op., Cit. p. 45.

تیۆرێك لەم بارەیەوە دابنێن ئەویش: زیاد بوونی پەیوەندیی گەلێك بەگەلانی ترەوە واتای زیاد بوونی دەسەڵاتی دەستەی بەجێهێنان دەدات[284].

یەکێکیش لە رووەکانی پەیوەندییەکانی دەرەوە ململانەی سەربازیو چەکسازییە کە لە هەموو بوارێك زیاتر پێویستی بەکاری خێراو بە دەسەڵاتی زۆرە، لەسەردەمی مووشەکی نێوان کیشوەرەکانو هێزی ئەتۆمیدا کارو موناقەشاتو بڕیارەکانی پەرلەمان وەکو ڕۆیشتنی کیسەڵ دەبێت.

٩- پەرلەمان هۆیەکی ترە: کۆنگرسی ئەمەریکی ئایا بەهۆی بێ توانایی یان بە هۆی کارەکانییەوە بێت دەوری خۆی بینیوەلە بە هێزکردنی سەرۆکایەتیی ئەمەریکی[285].

یەکێك لە تایبەتییەکانی پەرلەمان ئەوەیە کە بۆ ماوەیەکی دیاریکراوی ساڵەکە لەکاردا دەبێت کە ئەم ماوەیە (خولی پەرلەمانی) ی پێ دەوترێتو بریتییە لە (٢٣٢) ڕۆژ لە کۆنگرسی ئەمەریکییداو کە درێژترین ماوەیە، لەبەریتانیاشدا ماوەکەی (١٨٠) ڕۆژە، ماوە لەمە کەمتریش هەیە لە وڵاتانی تردا ئەمە لە کاتێکدا بەجێهێنان بە درێژایی ساڵ کاردەکات[286]. ئەم کارە بەردەوامەی بەجێهێنانیش واتای مامەڵەی ڕۆژانەیە لەگەڵ کاروباری وڵاتو ئەمە هۆیەکی ترە بۆ گەورەبوونی دەسەڵاتەکانی.

١٠- دەوری حزبەکان: هەبوونی یەك ڕێزیو مەرکەزییەت لەناو حزبەکاندا هۆکارێکی ئەم زیاد بوونەن[287]. ئەگەر حزبی حاکم زۆرینەی کورسییەکانی پەرلەمانی هەبێت، ئەو حکومەتەی کە پێکی دەهێنێت ئازادییەکی گەورەتری هەیە چونکە لە هەموو

---

لە چاپی پانزەمی کتێبەکەشیدا (ساڵی ١٩٠٠) تەئکید دەکات کە دەبێت دەسەڵاتی گەورە لە بواری پەیوەندییەکانی دەرەوەدا لە دەستی بە جێهێناندا بێت (ل٢٢).

[284] ڕۆسیتەر، النظام الرئاسي، ل ٧٠.

[285] C. Rossiter,Op. Cit. ,p. 31.

[286] بڕوانە دکتۆر علي غالب ودکتۆر نوری لطیف، القانون الدستوري، ل ١٠٠ وڵاتیش هەیە کە پەرلەمانەکەی بە درێژایی ساڵ کار دەکات بەڵام ئەمە حاڵەتێکی دەگمەنە.

[287] رەنی، سیاسة الحكم، ج ٢، ل ١٥٦.

کێشەیەك لەگەڵ پەرلەمانداو ئەگەر حاڵ بکاتە دەنگدان لەو پەرلەماندا حکومەتەکە زۆرینەی دەنگەکانی مسۆگەر کردووە چونکە هی حزبەکەی خۆیەتی، ئەمەش بەمەرجی هەبوونی یەك ریزیو مەرکەزییەت. بەهەمان شێوەش ئەگەر نیزامەکە(سەرۆکایەتی) بێت چونکە سەرۆك گێشەی نابێت لەگەڵ پەرلەمان.

حزبەکان بەشێوەی تریش ئەو دەسەڵاتە بەهێز دەکەن. دەبوایە حزبەکان مەسەلە تەمومژاوییەکان بۆ جەماوەر روون بکەنەوە بە هۆی موناقەسەکانی نێوان خۆیان لە هەڵبژاردندا ئەمە دەبێتە کارێکی زەحمەت، حزبەکانیش یان بایەخێکی کەم بەمە دەدەن یان هیچ بایەخێکی پێ نادەن بۆیە ئەرکی ئەم کارە دەچێتە ئەستۆی دەسەڵاتی بەجێهێنان[٢٨٨]، خەڵکیش روو دەکەنە ئەو دەسەڵاتەو ئەمەش ئەهەمییەتێکی زیاتری بۆ دروست دەکات.

***

زۆر لەسەر هۆکانی بەهێز بوونی دەسەڵاتی بەجێهێنان رۆیشتین، ئێستاش با چۆنیەتیو رادەی ئەم بەهێز بوونەو هەندێك مەسەلەی تر بزانین.

هەرەسی دەورەی پەرلەمانو زیادبوونی کارو سەربەخۆیی بەجێهێنان حاڵەتێکە پێی دەوترێت قەیرانی پەرلەمانی (ألأزمة البرلمانية)[٢٨٩].

بەجێهێنان دەسەڵاتەکانی گەورەتر دەکات، پەرلەمانیش هەوڵ دەدات دەسەڵاتەکانی خۆی نەدۆڕێنێت، باربۆخی ناوەوەو دەرەوەی وڵاتیش ... بڕیار لەسەر ئەم ململانەیە دەدەن کە ئەنجامەکە بەزۆری سەرکەوتنی بەجێهێنانە.

نموونەی ململانەی رۆژانەی ئەم دوو بەشە بەریتانیایە کە بەپێی دەستوور پەرلەمان دەتوانێت حکومەت ناچار بکات دەست لەکار بکێشێت بەڵام لە رووی

[288]J. Meynaud, The Role of the Excutive in the Modern State , International Social Science Bulletin,Vol. 10 no. 2,p. 177.

[٢٨٩] رمزي،سياسة الحكم، ج٢، ل ٩٠.

عەمەلییەوەو لەبەر ئەوەی سەرۆك وەزیران مافی ئەوەی هەیە (لە ڕێگەی پادشاوە) پەرلەمان هەڵبوەشێنێتەوەو هەڵبژاردنێکی تر بەئەنجام بدرێت.. پەرلەمان ناچار دەبێت خۆی بەدەستەوە بدات[290]، ئەویش چونکە مەسرەفی هەڵبژاردنەکان زۆرن و کەس ئەوە مسۆگەر ناکات کە جارێکی تر هەڵبژێردرێتەوە[291].

دەسەڵاتی سەرۆك وەزیران لە بەریتانیادا ئەوەندە گەورەیە کە (ویلسۆن) ئەوسا دەیوت کەوا پرسیارەکە ئەوە نییە پەرلەمان بەتەمایە چی بکات بەڵکو گلادستۆن (سەرۆك وەزیران) چی بکات[292]. لەبەر ئەوەش کاتێك (ویلسۆن) مامۆستای زانکۆ بووو بەر لەوەی ببێتە سەرۆکی ئەمەریکا دەیویست نیزامی سیاسیی ئەمەریکا بگۆردرێت و ببێتە نیزامێکی پەرلەمانی بۆ ئەو دەسەڵاتێکی بەهێزی بەجێهێنان دابمەزرێت (هەرچەندە دوایی وازی لەم هەوڵە هێنا)، بەڵام ئەوەی کە (ویلسۆن) ویستی لە ڕێگەی گۆڕینی دەستوورەوە بەئەنجامی بهێنێت سەرۆکە ئەمەریکییەکان لە ڕێگەی دەستوور خۆیەوە بە ئەنجامیان هێنا (هەرچەندە کێشەکانی تر مانەوە کە جێگەی ڕەخنەی ویلسۆن بوون).

بەکار هێنانی ئەو(صلاحیات)ەی کە دەستوور داونی بە سەرۆك بە پاڵ بارودۆخی قەیران... تاد سەرۆکایەتییان بەهێز کرد.

دەسەڵات و هەیبەتی سەرۆکایەتی ئەمەریکی لەبەرزبوونەوەدا بوو هەرچەندە بەرزی و نزمی زۆری تێ دەکەوت[293]. (رۆسیتەر) دەڵێت کە کاتێك ئەم دەسەڵاتە دەگاتە ئاستێکی نوێ ئیتر لەو ئاستە دانابەزێت هەتا ئەگەر دوای ئەوەش سەرۆکێکی بێ هێز

---

[290] هـ. لاسكي، اصول السياسه، ج ١، ل ١٣٤. هەروەها ولیام رۆبسن، النظام الحكومي في بريطانيا العظمى، ل ٢٤.

[291] و. رۆبسن، سەرچاوەی سەرەوە.

[292] W. Wilson, Op. Cit. P. 58.

[293] C. Rossiter, Op. Cit. ,p. 29.

بێتە سەر حوکم[٢٩٤]. هەیکەلی دەرەوەی سەرۆکایەتیش وەکو ئەوەی ساڵی(١٧٨٩) کە یەکەم سەرۆك (جۆرج واشنتن) بووە سەرۆکی ئەمەریکی ماوەتەوە بەڵام سەد ئەوەندە لەجاران گەورەتر بوون[٢٩٥].

ئەم قسانە هی پەنجاکانە، بە پێی سەرچاوەکانی حەفتا کانیش ئەمە راستە، لە راپۆرتی لیژنەیەکی کۆنگرسدا (ساڵی ١٩٧٢) باسی زیاد بوونی دەسەڵاتەکانی سەرۆك لەسەر حسابی کۆنگرس کراوە[٢٩٦]. بەڵام بەپێی سەرچاوەیەکی سەرەتایی هەشتاکاندا هێزی سەرۆك لەناوەڕاستی حەفتاکاندا کەم بۆتەوە[٢٩٧]. بەڵام ئەمە بەهۆی سەرۆك (جیمی کارتەر)ەوە (١٩٧٦-١٩٨٠) بوو کە بە سەرۆکێکی بێ هێزوو دوو دڵ ناسراوەو بەم وەسفەوە چۆتە ناو مێژووی سیاسیی ئەمەریکا لە کاتێکدا سەرۆکەکەی دوای خۆی واتە (رۆناڵد ریگان) بەشێوەیەکی تر بوو.

با ئاگاداری ئەو راستییەش بین:

ئێمە باسی گەورە بوونی دەسەڵاتی سەرۆك بەرامبەر کۆنگرس دەکەین کە ئەمە راستییە، بەڵام دەسەڵاتی سەرۆك بەرامبەر هێزەکانی تری وڵات بەو شێوەیە گەورە نەبووە. هێزە ئابوورییەکان، کۆمەڵەکانی فشار... ئەوەندە بەهێزن کە زۆر جار سەرۆك ناچار دەکەن بەکارێك هەڵسێت کە خۆی نەیدەویست. بۆ نموونە (رۆسیتەر) باسی خاوەن کارەکان دەکات کە چۆن توانیویانە پاشە کشێ بکەن بەسەرۆك لە هەڵوێستەکەی خۆی بەڵکو وای لێ بکەن بیر لەخۆ کوشتن بکات[٢٩٨]. واتە ئێمە لە روانگەی گەورە بوونی

---

[294]Ibid, p. 31.

[٢٩٥] لەو باسەی(رۆسیتەر) یشدا وێنەی سەرۆکە ئەمەریکییەکان هەیە، هەر یەکێکیان بە پێی دەسەڵاتەکەی وێنەکەی ئەوەندە گەورەیە. Ibid.

[٢٩٦] هز شیللەر، المتلاعبون بالعقول، ل ٦٨.

[٢٩٧] بڕوانە رەنی، قنوات السلطة، ل ١٧٢.

[٢٩٨] ك. رۆسیتەر، النظام الرئاسي في الولايات المتحدة، ل ٤٦.

دەسەڵاتەکانی سەرۆك لەچاو جاران باسی لە مەسەلەکە دەکەین، هەروەها لەچاو کونگرس نەك لەچاو هێزەکانی تر.

سەرۆکی ئەمەریکی بریتییە لە: سەرۆکی دەوڵەت + سەرۆکی حزبەکەی خۆی+ سەرۆك وەزیران+ سەرکردەی باڵای هێزە چەکدارەکان+ دیپلۆماسی یەکەمی وڵات[299]...

بۆیە هەندێك مێژوونووس دەڵێن کەوا لویسی چواردەمی پادشای فەرەنسا (١٦٤٣-تا١٧١٥حوکمی کردووە) - کە دەسەڵاتێکی ئەوەندە رەهای هەبوو کە وتبووی: دەوڵەت منم- دەسەڵاتی کەمتری هەبووە لە سەرۆکی ئەمەریکی[300]. بێ گومان ئەم قسەیە زێدەرۆیی زۆری تیادا هەیە.

دەسەڵاتی سەرۆکی فەرەنسی زۆر لەوەی سەرۆکی ئەمەریکی گەورەترە. لەفەرەنسای ئەو ساداو لەبەر هەندێك تەجروبەی مێژوویی دەسەڵاتی بەجێهێنان بێ هێز کرابوو. سەرۆك کۆمار دەسەڵاتێکی کەمو رەمزیی هەبوو، سەرۆك وەزیرانیش سەرۆکی حکومەتێك بوو کە بە زۆری لە ئیئتلافی چەند حزبێك پێك هاتبوو بۆیە زوو حکومەت هەرەسی دەهێنا[301]. بەڵام دەستووری (١٩٥٨) کە دیگۆل پێش کەشی کردبوو هێزێکی گەورەیدا بە سەرۆك کۆمارو قورسایی بەجێهێنانی لە سەرۆك وەزیرانەوە گواست بۆ سەرۆك کۆمارو لە دەسەڵاتی یاسادانەوە (پەرلەمان) گواست بۆ بەجێهێنان.

پاشانو بەپێی ئیستفتای(١٩٦٢) دەستوورەکەی دەستکاری کرا وا کە دانانی سەرۆك کۆمار بە هەڵبژاردنێکی گشتی بەئەنجام بهێنرێت[302]. ئەوەش لە جیاتی جاران کە ئەنجومەنی نیشتمانی سەرۆکی هەڵدەبژارد. ئەمەش هێزێکی گەورەتری بە سەرۆك

---

[299] C. Rossiter, Op. Cit. ,p. 28f.

[300] گاستۆن بوتول، سوسیولوجیا السیاسة، ل ١٣٦.

[301] دیگۆل لە یاداشتەکانیدا دەڵێت کە لەماوەی (١٢) ساڵدا (تا١٩٥٨) هەقدە سەرۆك وەزیر بیست وچوار وەزارەتیان پێك هێنا واتە (معدل) شەش مانگ بۆ یەك حکومەت.

[302] Gaston Defferre ,De Gaulle and After, Foreign Affairs, 44, no. 3, p. 437.

بەخشی چونکە ئەو کەسەی کە خەڵك بەدەنگدان هەڵیدەبژێرێت پێویستە هەرخەڵك خۆیان‌و بەدەنگدان لایەرن‌و چیتر لەژێر رەحمەتی پەرلەماندا نابێت.

دیارە هێشتا دیگۆل بەو دەسەڵاتە دەستوورییانە رازی نەبوو چونکە لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەگەریدا (ساڵی ١٩٦٤) وتبووی کەوا بە پێچەوانەی دەستوور هەموو دەسەڵاتە مەدەنی‌و سەربازییەکان، تەنانەت قەزاییەکانیش لە سەرۆك کۆمارەوە دەردەچن[٣٠٣].

لەبارەی هەڵبژاردنی سەرۆکی فەرەنسییەوە، نووسەرێکی فەرەنسی بۆ چوونە باوەکە رەت دەکاتەوەو دەڵێت کەوا ئەم هەڵبژاردنە لە لایەن گەلەوە نەبووە هۆی بە هێزبوونی سەرۆکی فەرەنسی بەڵکو بە پێچەوانەوە سەرۆکایەتی خۆی بەهێز بوو بۆیە هەڵبژاردنەکە پەسەند کرا[٣٠٤]، ئەمەش کە زیاتر دیاردەی گەورە بوونی دەسەڵاتی سەرۆك (واتە دەسەڵاتی بەجێهێنان) دەسەلمێنێت.

سەرۆکی فەرەنسی لە بواری (بەرگری) و(کاروباری دەرەوە) دا زۆر بەهێزە هەروەها دەسەڵاتێکی گەورەی هەیە لە بوارەکانی تردا[٣٠٥]. جگە لە هەموو ئەو دەسەڵاتانە برگەی (١٦) ی دەستوور دەڵێت کە لە بارێکی نا ئاساییدا سەرۆك بەو کارانە هەڵدەستێت کە پێویستن، بۆیە وترلوە کە ئەمە رێگە بە سەرۆك دەدات هەرکاتێك بریار بدات بەشێوەیەکی کاتی پەرلەمان لەکار بخاتو دەسەڵاتی دیکتاتۆرێك بگرێتە دەست[٣٠٦].

---

[303] Ibid.

[304] Guy Corcassonne, Ve = IIIe + de Gaulle, Le Point, 1179, 22/4/1995, p. 58.

[305] Le, Point, 1179,p. 55.

[306] G. Defferre, Op. Cit. ,p. 438.

بەکورتی سەرۆکی فەرەنسی زۆر لەسەرۆکی ئەمەریکیو سەرۆك وەزیرانی بەریتانیو موستەشار (=سەرۆك وەزیران)ی ئەڵمانی بەهێزترە؛ سەرۆکی فەرەنسی پادشایەکە کە تەنها واقعە سیاسی زۆرەملێی لێ دەکات[307]. بۆیە نووسەرێك لە کاتی هەڵبژاردنەکانی ساڵی(١٩٩٥) ی سەرۆکایەتی دەڵێت کە ئەو سەرۆکەی کە هەڵدەبژێردرێت هەموو ئەو ئامێرانە چاوەڕوانی دەکەن کە دەیکەنە ((پادشایەکی کۆماری))[308].

ساڵی (١٩٩٦) لە ئیسرائیلدا بە هۆی چاك کردنی دەستوور لەجیاتی ئەوەیسەرۆك وەزیران لە حزبی زۆرینەی پەرلەمانەوە دەست نیشان بکرێت، سەرۆك وەزیران لەوە بەدواوە بەشێوەیەکی راستەوخۆ لەلایەن گەلەوە هەڵدەبژێردرێت ئەمەش هێزێکی گەورەی وا پێ بەخشی کە هیچ سەرۆك وەزیرێکی پێشوو نەیبووە[309].

هەوڵدان بۆ بە هێزکردنی دەسەلاتی بەجێهێنان سەرجەم ئەندامانی ئەم دەسەلاتە دەگرێتەوە نەك تەنها سەرۆکی دەسەلاتەکە. کاتی خۆی بۆ نموونە وەزیرەکانی سەرۆکی ئەمەریکی تەنها راوێژکاری سەرۆك بوون بەلام دوایی تر بوونە هاوبەشی کاری[310].

عەسکەرییەکانیش کە لە ژێر فەرمانی بەجێهێناندا کار دەکەن دەسەلاتی خۆیان هەیە. لە ئەمەریکادا (دەستەی ئەفسەرانی هێزە چەکدارەکان) پارەیەکی بێ ئەندازە

---

[307]Denis Jeambar, Les Vrais Pouvoirs du Président, Le point, 1180, 22/4/1995, p. 54.

[308]D. Jeambar, La France. de France... et un Président, Le point, 1180, 29/4/1995,p55.

بەلام وەك نووسەر دەڵێت: خۆی لە وەزعی لویسی (١٦) دا دەبینێتەوە زیاتر لە لویسی (١٤) (هەمان سەرچاوە)... یەکەمیان پاش شۆڕشی (١٧٨٩) بووە پادشایەکی دەستووری لە کاتێکدا دووەمیان پادشایەکی رەها بوو.

[309] بڕوانە گۆڤاری المشاهدالسیاسی، ژمارە ٣٢، ٢٧/١٠-١٧٢/١٩٩٦ ل ١٤.

[310]W. Wilson ,Op. Cit,. p. 49f.

لەسەر پیشە سازی سەرف دەکات، ئەمەش دەسەلاتێکی گەورەی پێ بەخشیوە لە مەیدانی پیشەسازیو ژیانی سیاسی میللەت[٣١١]. بیریاری ئەمەریکیش (س. رای میلز).. (١٩١٦–١٩٦٢) وتبووی کەوا بەر لە(١٩٤١) – سالی بەشدار بوونی ئەمەریکا لە جەنگی دووەی جیهانی– دەستی جەنەراڵەکان کەمتر دڕێشت بەلام دوای ئەوە دەستیان گرت بەسەر لوتکەی هێزدا. ئەوان لە چەند مەسەلەیەك پرسیان پێ دەکرێت کە زۆر لەمەسەلە عەسکەرییەکان دوورن، ٨٥٪ ی ئەو پارانەش کە بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی لای ئەوانەوە دەردەچێت. (رایت میلز) دەڵێت کە لە هەموو جیهاندا میرانی جەنگ دەست بەسەر دەسەلاتدا دەگرن[٣١٢].

ئەم دەسەلاتەی عسکەرییەکانو وەزیرەکان بەلگەیەکی ترە لەسەر رێگەنەدان بەدروست بوونی بۆشایی لە دەسەلاتدا ... دەسەلاتی ئەم دوو تاقمەش لە ئەنجامی لاوازیی سەرۆکی دەسەلاتی بەجێهێنانە. بەم شێوەیە مەرکەزی هێز لەناو ئەم دەسەلاتەدا دەگۆڕێت بەلام دەسەلاتەکە لە هەموو حاڵەتەکاندا وەکو هێزێکی کەمایەتی دەمێنێتەوە.

ژمارەی کەمی ئەندامانی بەجێهێنان مەسەلەیەکی پێویستە بۆ ئەوەی بە هێز بێت. (لاسکی) دەڵێت کەوا بە تەجروبە دەرکەوتووە کە پێویستە ئەنجوومەنی وەزیران لە ژمارەیەکی دیاری کراو تێپەڕ نەکات (بۆ نموونە لە ١٢ زیاتر) ئەگینا پتەویی خۆی لەدەست دەدات[٣١٣].

بەلام ئەگەر ژمارەی وەزیرەکان لەمە زۆرتریش بێت ئەوا دەسەلات لە ناویاندا وەکو یەك دابەش نەکراوە بەلکو چەند وەزیرێك دەسەلاتێکی گەورەتریان هەیە، ئەمەش زیاتر لە کاتی جەنگدا دەبینرێت کاتێك (حکومەتی جەنگ) پێك دەهێنرێت. لە بەریتانیادا کابینەی جەنگی (لۆید جۆرج) ی بەریتانی سالی ١٩١٦ (کاتی جەنگی یەکەمی جیهانی)

---

[٣١١] هیوبرت هەمفری، في سبيل البشرية، ل ١٥٩–١٦٠.

[٣١٢] ئێدوارد بێرنز، افكار في صراع، ل ٣٢٤–٣٢٥، لە کتێبی رایت میلز: هەڵبژاردەی هێز، (١٩٥٧).

[٣١٣] هـ. لاسكي، مدخل الى علم السياسة، ل ٩٧.

تەنها پێنج کەس بوو، لەجەنگی دووەمیشدا کابینەکەی (چێرچل) پێنج تـا حـەوت کـەس بوو[314] کە ئەمانە کابینەی راستەقینە پێك دەهێنن لـە کـاتێکدا وەزیرەکـانی تـر لـە کـارە تایبەتییەکانی خۆیان بەرپرسیارن[315]. بەڵام ئەمە تەنها کاتی جەنگ ناگرێتەوە؛ بۆ نموونە ئێستاو لە هەموو بارێکدا (ئەنجومـەنی ئـەمنی قـەومی) ی ئەمـەریکا کە بریتیـە لـە ژمارەیەك لێپرسراو تەنها چەند وەزیرێکی گرنگ لە خۆ دەگرێت.

لەناو وەزیرەکاندا هەندێکیان گرنگێتیی تایبەتیان هەیـە، بـۆ نموونـە لەسـەرەتای دامەزراندنی ئیسرائیلیەوە چەند کەسێکی کەمی وەزیران خاوەن بڕیاربوون[316]. بەڵام لەمە زیاترو لە پەنجاکانی ئەم سەدەیەوە تـا حـەفتاکان‌و بـەپێی رۆژنامـە نووسـی ئیسـرائیلی (یهوشع بن فـورات) وەزیـری دارایـی (بنحـاس سـابیر) بـە تەنـها خـۆی دەسـەڵاتێکی زۆر گەورەی گرتبووە دەست[317]، لەگـەڵ ئەوەشـدا دەهـۆڵ بـۆ ئیسـرائیل لێ دەدرا کـە گوایـە ئاوەدانیی دیموکراسییە لەناو بیابانی دیکتاتۆریەتی عەرەبیدا.

***

دەسەڵاتی بەجێهێنان نەك هەر لە بوارێکی خۆیدا دەستی دەڕوات بەڵکو هـەروەها بۆ بوارەکـانی تریش پـەل هاویشـتووەو کە تایبـەتن بـە دەسـەڵاتی یاسـادان وەکـو دەستنیشانکردنی بودجەو یاسادانان.

بەجێهێنان بۆ خۆی یاسا یان بڕیار دەردەکات کە بەزۆری (لائحە)ی ئیدارییان پـێ دەوترێت. ژمارەی ئەم بڕیارانە زۆر لەو یاسایانە زۆرتـرن کـە پەرلـەمان دەریان دەکـات.

---

[314] J. W. Grove, The Role of the Excutive in the Modern State, The United Kingdom, in, International Social Science Bulletin, 10, no. 2, p. 232.

[315] ولیام رۆبسن، النظام الحکومی..... ، ل ٢٨.

[316] یهوشع بن فورات، مراکز القوی في اسرائیل، ل ١٨، بەدواوە.

[317] بڕوانە سەرچاوەی سەرەوە، ل ٥٣ بەدواوە. کتێبەکەش کە بریتییە لە ژمارەیەك وتار لـە رۆژنامـەی (یدیعوت احرونوت) ساڵی (١٩٧٢) بڵاوکرابووەوە.

پەرلەمان ساڵانەی نزیکی(٨٠) یاسا دەردەکات لە کاتێکدا فەرمانو بڕیارەکانی بەجێهێنان (٣٠) ئەوەندەی ئەم ژمارەیە[٣١٨].

ساڵی (١٧٨٩) ش لە ئەمەریکا کە تازە کۆنگرس دامەزرا، یەکەم سەرۆکی ئەمەریکی(جۆرج واشنتن) ٢٧ یاساو٣ فەرمانی پەسەند کرد، بەڵام زیاد لە سەدەو نیوێک سەرۆك(ئایزنهاوەر).. (٢٠٠) یاسای گشتیو (٤٩٠) یاسای تایبەتو ٦٥ فەرمانی بەجێهێنانو ٤٢ بەیاننامەی ئیمزا کرد[٣١٩]. ئەمەش بە هۆی فراوانبوونی ئەمەریکا[٣٢٠] و زۆر بوونی کارەکانی دەوڵەت، واتە چاوەڕێی دەکرێت ڕۆژ بەڕۆژ ئەم یاسایانەی بەجێهێنان زیاد بکەن.

جگە لەم زیاد بوونەی قەبارەی یاساکان، بەجێهێنان تا رادەیەك گەورە دەستپێشکەریی هەیە لە یاساکانی پەرلەماندا.. لە سیزامی پەرلەمانیدا حکومەت پێشنیاری یاسا دەکاتو پێشکەشی پەرلەمانی دەکات پەرلەمانیش یان بە کەمێك دەستکارییەوە رازی دەبێت یان رەفزی دەکاتو ئەو کاتە قەیرانی وەزاری بەرپا دەبێت، لە ئەمەریکاشداو هەرچەندە بەجێهێنان ناتوانێ دەستپێشکەریی هەبێت لە یاسادانانداا بەڵام دەوری گەورەی لەمەدا هەیەو سەرۆك دەتوانێت سەرنجی کۆنگرس بکات بۆ هەندێك مەسەلە تا یاسا لە بارەیانەوە دەربچێت، هەروەها لە ڕێگەی ڤیتۆ دانان لەسەر یاساکانی کۆنگرس دەتوانێت لە یاسا داناندا دەوری چالاك ببینێت[٣٢١].

---

[٣١٨] هـ لاسکی، اصول السیاسة، ج ١، ل ١٦٦.

[319] Roy C. Macridis, The Role of the Excutive in the Modem State, The United States. in: International Social Science Bulletin. 10. no. 2, p. 246, n. 1.

[٣٢٠] ئەمەریکای کاتی (واشنتن) تەنها (١٣) ویلایەت بوو.

[321] W. J. Shepard. Legislative Assembleies ,Encycl. of the Social Sciences. Vol. 9. p. 358.

گرنگیتیی بڕیارەکانی دەسەڵاتی بەجێهێنان لەوەدایە کە کاتێك بڕیارەکان سیفەتێکی یاسادانان (تەشریعی) یان هەبێت دەسەڵاتێکی گەورەتر بەجێهێنان دەبەخشن چونکە بەم پێیە بەجێهێنان دەتوانێت ئەو یاسایە دەربکات کە خۆی مەبەستێتیو بەبێ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ پەرلەمان. ئەگەر ژمارەی ئەو بڕیارانەش زۆر بن ئەوا مەرکەزی قورسایی‌ی یاسادانان لە پەرلەمانەوە (دەسەڵاتی یاسادانان) دەگوازرێتەوە بۆ بەجێهێنان.

بەم شێوەیە بەجێهێنان بوارێکی سەرەکیی دەسەڵاتی یاسادانان داگیردەکات... ئەمەش گونجاوە بۆ ئەم سەردەمی خێراییەی کەتیایدا دەژین چونکە:

١-یاساکانی بەجێهێنان خێراو بەکەمترین موناقەشە پەسەند دەکرین.

٢- ناڕەزایی‌و کێشە بەر لەپەسەند کردنیان کەمترە لەچاو ناڕەزایی‌و کێشەکانی ناو پەرلەمان.

٣- پاش دەرچوونی یاساکەدەتوانرێت بەئاسانی دەستکاری بکرێت یان لابرێت.

ئەم کارانەش ئاسانترن ئەگەر بەجێهێنان سەر بە حزبی حاکم بن، واتە یەك حزب لە حکومدا هەبێت نەك حکومەتی ئیئتلافی.

بوارێکی سەرەکیی تری پەرلەمان کە بەجێهێنان دەستێکی باڵای تیادا هەیە بریتییە لە بودجە. بودجە ئەمڕۆ بۆتە لیستێکی لەڕادەبەدەر گەورە بۆیە لەجیاتی ئەوەی وەکو جاران پەرلەمان دەستنیشانی بکات ئێستا دەستنیشان کردنی لە ئەستۆی بەجێهێناندایە، پەرلەمانیش موناقەشەی دەکاتو پاشان ئیمزای دەکات.

لەفەرەنسادا کاتێك دەستنیشانکردنی بودجە کارێکی پەرلەمان بوو تەنها (١٢) بودجە نێوان ساڵانی (١٨٧٥)و(١٩٤٠) لەکاتی خۆیاندا لەبارودۆخێکی ئاساییدا دەنگیان لەسەر درا[٣٢٢]، واتە لەماوەی (٦٥) ساڵدا تەنها(١٢) بودجە لە کۆی (٦٥)بودجە لە کاتی خۆیاندا پەسەند کران. هەروەها نێوان (١٩٤٦) و(١٩٥٨) هەرجارێك دەنگدانەکە چەند

---

[٣٢٢] جاك دۆنديۆ دو فابر، الدولة، ل ٣٠٦.

مانگێك دواكەوتو چەند جارێكیش هەموو ساڵەكەی برد[٣٢٣]. لەبەر ئەوەش بوو دەستووری (١٩٥٨) ی ئەو وڵاتە دەستپێشكەریی پەرلەمانی لەبارەی مەسرەفەكانەوە لابرد[٣٢٤].

بەم شێوەیە بەجێهێنان دەستی خستۆتە سەرەكی ترین كاری پەرلەمان؛ واتە (یاسادانان) و(بودجە)و ئەمە بەڵگەیەكی ترە كە حوكمی كەمایەتی حوكمێكی عەمەلی ترە چونكە بەجێهێنان لە پەرلەمان زیاتر كەمایەتیی پێوە دیارە، ئەنجامی ئەمەش ئەوەیە كە پەرلەمان رۆژ لەدوای رۆژ دەیسەلمێنێت كە لەگەڵ سەردەمدا ناگونجێتو ئەو پەرلەمانەی كە چارەسەرێكی عەمەلی بوو بۆ ئەنجوومەنی (هاوڵاتیان) كە لە دیموكراسیی راستەوخۆدا هەبوو (كە نەك هەر عەمەلی نییە بەڵكو بۆ ئێستا دەزگایەكی خەیاڵییە) ... ئەو پەرلەمانەش هەروا دەركەوت كە عەمەلی نییەو بەجێهێنان لەو عەمەلی ترە وحوكمو دەسەڵاتی راستەقینە حوكمو دەسەڵاتی كەمایەتییە.

بەڵام بێگومان بەجێهێنان تاكە پاڵەوانی مەیدان نییە بەڵكو هێزی تر هەن كە بەشێكیان سەلماندوویانە كە زۆر لە بەجێهێنان بەهێزترن.

---

[٣٢٣] سەرچاوەی سەرەوە.

[٣٢٤] سەرچاوەی سەرەوە.

# سێیەم- حزبەکان

حزبەکان بەهەمان شێوە کەمایەتین، لەناو کەمایەتیەشدا کەمایەتییەکی تر هەیە کە پێشەوای حزبو هەندێك ئەندامی بە دەسەلاتن.

راوو بۆچوون لەبارەی حزبو حزبایەتی لەناو دیموکراسییخوازاندا یەك نییە چونکە کێشەی ئەوە هەیە: ئایا حزبەکان نوێنەری خەلکەکەن یان نا؟ ئایا حزبەکان ئامێرێکی باشن یان دەزگایەکی گەندەلن؟

ئەو کەسانەی کە هەبوونی حزبەکان پەسەند دەکەن وایان بڕوایە:

١- بەزۆری رای رێکخراو (الرأی المنظم)ە کە کار دەکاتە سەرئاماجی حکومەت[٢٢٥]، لەبەر ئەوە حزبەکان پێویستن.

٢- حزب جەماوەر پەروەردە دەکاتو لەبارەی سیاسەتەوە وریای دەکاتەوەو رای گشتی دەجوولێنێت ... هتد[٢٢٦].

٣- نیزامی حزبیش ئەو بناغە پێویستەیە بۆحکومەتی نوێنەرایەتی[٢٢٧]، ئەویش چونکە نیزامی نوێنەرایەتی پێویستی بە حزبەکانە تا بەرنامەی خۆیان بخەنە بەردەم جەماوەرو خەلکەکە لەسەر ئەو ئەساسە دەنگیان بۆ بدەن.

٤- بەپێی (میشیلز) ی رەخنەگر لە دیموکراسیی: دیموکراسیی بەبێ رێکخستن نابێت رێکخستنیش کاری حزبەکانە[٢٢٨].

---

[٢٢٥] هارۆلد لاسکی، مدخل الى علم السیاسة، ل ٨١.

[٢٢٦] ر. مەکئایفەر، تکوین الدولة، ل ٢٦٤.

[٢٢٧] لاسکی، مدخل... ، ل ٨٤ هەروەها H. Laski. Democracy , Op. Cit., p. 81+The British Parliament , p. 5. ئەویش بەپێی زانای مێژووی دەستووری (والتەر باجەت) W. Bagehot.

[٢٢٨] دکتۆر عبد الحمید متولی، الوجیز في النظریات، الانظمة السیاسیة، ل ٢٣٢، پەراوێز.

لەوەش زیاترو بەپێی شاتشنایدەر Schattschneider: حزبە سیاسییەکان خۆیان دیموکراسییان دروست کردو حزبەکان وەکو دڵ وان بۆ حکومەتی نوێ (کتێبێکیشی لەم بارەیەوە نووسیوە)[329].

رەخنەکانیش لە حزبەکان زۆرن وەکو:

١-قسەیەکی زیدەڕۆیە ئەگەر بوترێت کەوا حزبەکان بەراستی نوێنەری رای گشتینو بە تەجروبە دەرکەوتووە کە ئەمە راست نییە[330].

٢- هەرچەندە حزبەکان کۆڵەکەی دیموکراسین بەڵام جێگەی گومانو رەخنەن چونکە:

أ) کەمایەتی دەستیان بەسەردا دەگرێت، ئەم کەمایەتییەش بەزۆری بۆ بەرژەوەندیی خۆی کار دەکات.

ب) خۆیان لە پشت بنەما دیموکراتییەکان دەشاردەوە.

ج) مونافەسەی یەکتر دەکەن.

د) ئەندامی حزبەکە کار بۆ بەرژەوەندیی حزبەکەی دەکات هەتا ئەگەر لەگەڵ بەرژەوەندیی جەماوەردا نەگونجێت......[331]

٣- لەو رەخنانەش خراپتر قسەی (بارتیلومی) یە: حزبەکان نامەتی دیموکراسین[332].

٤- لە هەمووشیان خراپتر قسەی(لۆرد هالیفاکس)ە بەر لە سێ سەدە کە دەبوێ باشترین جۆرە حزب تا رادەیەك پیلانە[333] (دژی میللەت).

---

[329] گۆستن رەنی، سیاسة الحكم، ج ٢، ل ١.

[330] دکتۆر عبد الحميد متولي، الوجيز.. ، ل ٢٢٦.

[331] بڕوانە: دکتۆر محمد كامل ليلة، النظم السياسية، ل ٦٧٨ بەدواوە.

[332] دکتۆر عبد الحميد متولي، الوجيز... ، ل ٢٠٥.

[333] H. Laski, Democracy, Op. Cit., p. 81.

پەسەندکردن‌و رەخنەگرتن لە حزبەکان دوو شتی دژ بەیەك نین ئەگەر پێوانەکە دیموکراسیی بێت ئەویش چونکە لە لایەکەوە حزبەکان کۆڵەکەی دیموکراسین و لە لایەکی ترەوە نافەتی دیموکراسین... ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ نیزامی دیموکراتی خۆی.

دیموکراسیی پێویستی بە حزبەکانە چونکە ئەگەر هەڵبژاردن بە لیست بێت (بە پێی نیزامی ڕێژەیی بێت یان نیزامی زۆرینە) ئەوا تەنها حزبەکان دەتوانن لیست دابەزێنن، تەنانەت ئەگەر لیستەکە هی کۆمەڵە کەسێکیش بێت کە خۆیان بە حزب ناو نانێن (کە ڕەنگە شتی‌وا قەد روو نەدات) ئەوا کۆبوونەوەیان لە لیستێکدا بۆ خۆی کارێکی حزبییە. ئا لێرەدا وشەی (حزب) لە فەرهەنگی ئیسلامیدا مەسەلەکەمان زۆر بۆ روون دەکاتەوە. لە ئیسلامدا مەرج نییە(حزب) وەکو حزبەکانی ئەمڕۆ ڕێکخستن‌و بارەگاو پەیڕەوو پرۆگرامی نووسراویان ... هەبێت بەڵکو حزب بریتییە لەهەر کۆمەڵێك کە لە دەوری مەسەلەیەك یان بیروباوەڕی تایبەتی کۆبێتەوە.

لە لایەکی ترەوە ئەگەر جۆری هەڵبژاردن بە نیزامی زۆرینەو نیزامی فەردی بێت، واتە لەهەر ناوچەیەکدا یەك کەس دەربچێت‌و پێویست بە دابەزینی لیستی حزبێك ناکات، ئەوا دیسان لەناو پەرلەماندا ئەو کەسانەی کە هاوبەرژەوەندین‌و هاو بیرکردنەوەن دەبنە کۆمەڵێك‌و کۆمەڵەکان لەناو پەرلەماندا پەیدا دەبن بەڵکو تەنانەت لەکاتی هەڵبژاردنیشدا ئەو کۆمەڵانە دروست دەبن لەبەر یەك چوونی بەرنامەی ژمارەیەك پاڵێورلو. لە دیموکراسییە کۆنەکەی یۆنانیشدا کە پێویست بە هەبوونی حزبی وەکو ئەوانەی ئەمڕۆی نەدەکرد کۆمەڵی جۆراوجۆر لەناو(ئەنجوومەنی هاولاتییان) دا دروست ببوون.

ئنجا با بەرەو مەبەستی سەرەکیمان بچین ئەویش سەلماندنی ئەوەی کە حزبەکان یەکێکن لە دەزگاکانی کەمایەتی.

زانراوە کە بەشێکی کەمی خەڵك ئەندامن لە حزبەکاندا، ئەمەش بۆ خۆی یەکێکە لە ئاستەکانی کەمایەتیی حزب. لە ئەمەریکا ئەو جۆرە ئەندامێتییە نییە کە لە وڵاتانی تردا هەیە بەڵکو ئەندامێتی بەوە دەبێت کە دەنگدەرەکە ناوی خۆی بنووسێت کە بۆ

فلانە حزب دەنگدەدات، بەلام لەم حالەتەشدا هەروا کەمایەتی بەدی دەکرێت چونکە ئەندامە رەسمییەکانی حزبەکە هەن کە کەمن و کە باشتر رووی کەمایەتی ئاشکرا دەکەن ... واتە حزب وەکو کەمایەتی لە ئەمەریکادا باشتر دەبینرێت.

ئەوانەی کە حزب هەلدەسوورێنن پێیان دەوترێت مەکینەی سیاسی یان ئامێری سیاسی Political Machine کە دەزگایەکی تایبەتە بەچەند پێشەوایەکی کەم و حوکمی کەمایەتی لەناو خودی حزبدا پیادە دەکەن.

لە ئەمەریکادا هەر شارێك ئامێرێکی سیاسی هەیە تەنانەت (لادێ)ش ئامێری خۆی هەیە[٣٣٤]. سیاسییەکان زیاتر بایەخ بەوە دەدەن کە رێکخستنەکەیان (کامل) بێت و سەرکەوتووانە کاربکات[٣٣٥]، کۆنترۆل کردنی (ئامێرەکە) ش لایان گرنگترە لە چارەسەر کردنی کێشەکانی حکومەت[٣٣٦]. بە واتایەکی تر دەستەی کەمایەتیی حزب بەرژەوەندییەکانی حزب دەخەنە پێش بەرژەوەندیی ولات.

جگە لە ئامێرەکە بازنەیەکی تەسکتری کەمایەتی لە حزبدا هەیە ئەویش سەرۆکی حزبەکە. سالی(١٩١٩) دەستەیەکی حزبی پارێزگارانی بەریتانیا راپۆرتێکیان نووسی کە ئەوەی تیادا هاتووە کەوا قبوول کردنی سیاسەتی حزب مافێکی تایبەتیی سەرۆکە، سەرۆکیش مافی قبوول کردن یان رەفز کردنی ئەو بریارانەی هەیە کە کۆنگرەی سالانەی حزب دەریان دەکات[٣٣٧]. ئەم قسەیە هی پەنجاکانە لەم دواییەشدا رەخنە لە (تۆنی بلێر)– سەرۆکی حزبی کرێکارانی بەریتانیا– گیرا کە پشت بەچەند راوێژکارێکی خۆی لەناو حزبدا دەبەستێت[٣٣٨].

---

[٣٣٤] هـ. لاسکی، الدیمقراطیة الامریکیة، ل ١٨٩.

[335]Roy F. Nichols, It happens every Four Years, Op. Cit., p. 24.

[336]Ibid.

[٣٣٧] کریم مسعد، الدیمقراطیة البریطانیة، ل ٢٥–٢٦.

[٣٣٨] گۆڤاری المشاهد السیاسی، ژمارە ٣١، ١٣–١٩/تشرینی یەکەمی ١٩٩٦، ل ٦٦.

(لاسکی) ش لەبارەی ئەمەریکاوە دەڵێت کە دوو حزبەکە لەدەوری کەسەکاندا کۆدەبنەوە نەك لەدەوری فیکرەکاندا[339]. دیارە کە سەرۆکی حزب کەسی یەکەمەو زیاتر لەدەوری ئەودا کۆدەبنەوە هەرچەندە لەوە دەچێت چەند کەسێکی پشت پەردە هەن کە لەو بەهێزتر بن.

ئەگەر باسی حزب لە پەرلەماندا بکەین دەبینین کە بازنەیەکی تەسکی کەمایەتی لەوێدا هەیە. ئەندامانی پەرلەمان دەسەڵاتێکی تایبەتییان هەیە بەسەر سەرجەم حزبدا، نموونەش لەسەر ئەوە دوو حزبە گەورەکەی بەریتانیا. لەناو پەرلەمانتارەکانیشدا دەستەیەکی بچووکتر هەیە کە باسمان کردبوو ئەوەمان وتبوو کە لە پەرلەماندا هەر حزبێك (لیژنەی بەجێهێنان) ی هەیە کە دەستەیەکی کەمەو دەسەڵاتێکی گەورەی هەیە، ئەم لیژنەیەش حکومەت پێك دەهێنێت (لە نیزامی پەرلەمانیدا وەکو بەریتانیا) ئەگەر حزبەکە لە حوکمدا بێت لە کاتێکدا حزبە نەیارەکەی ناو پەرلەمان حکومەتی سێبەر (حکومة الظل) پێك دەهێنێت[340].

لەزۆر وڵاتدا بازنەکانی کەمایەتی شێوەیەکی تر وەردەگرن، بۆ نموونە سەرکردایەتی هەیە وەك دەستەیەکی دەسەڵاتدار لەناو حزبدا بەڵام سەرووی ئەوە مەکتەبی سیاسی هەیە کە ژمارەیەکی کەمی ئەندامی لەخۆگرتووە، لەناو ئەم مەکتەبەشدا کۆمەڵێکی بچووکتر هەر هەیە کە دەستی باشتر دەڕوات.

بەکورتی: جۆری رێکخستنی حزب بەهەر چۆنێك بێت ئەو حزبە هێزێکی کەمایەتی پێك دەهێنێت. سەرەتا حزب خۆی کەمایەتییە لەچاو جەماوەردا، چالاکەکانی حزبەکەش کەمایەتین لەچاو سەرجەم ئەندامانو لایەنگرانی حزبەکە، لەناو ئەم چالاکانەشدا بازنەیەکی تری کەمایەتی هەیە، لەناو ئەم بازنەیەشدا بازنەیەکی تر هەیە.. تاد، ئیتر لەناو

---

[339] هـ. لاسکی، الدیمقراطیة الامریکیة، ل ١٠٧.

[340] بڕوانە بۆ ئەمە دکتۆر حسان شفیق العاني، الانظمة السیاسیة المقارنة، ل ٨١و ٨٣ سەرۆکی هەردوو حزبەکەش لە لایەن ئەندامانی پەرلەمانەوە هەڵدەبژێردرێن (هەمان سەرچاوە).

ئەو بازنانەشدا حزب چۆن خۆی وەك نوێنەری جەماوەر دەزانێت؟ هەتا ئەگەر نوێنەری جەماوەریش بێت ئایا دەتوانین بڵێین کەوا جەماوەر بەراستی لەرێگەی حزبەکانەوە حوکم دەکات ؟ ئێمە بینیمان کە تەنانەت ئەندامانی حزبەکەش حوکم ناکەن. کێشەیەکی گەورەی دیموکراسیی لەم بارەیەوە ئەوەیە دیموکراسیی (= حوکمی گەل) پێویستی بەحزبەکانە (=دەزگای کەمایەتی) بۆ ئەوەی کار بکات.

ئەگەر باس لە گەندەڵیی حزبەکان بکەین دەڵێین کەوا حزبایەتی (وەکو هەموو جۆرە دەسەڵاتێکی‌تر) لەگەڵ گەندەڵیدا هاوجووتە، ئەمەش کێشەیەکی گەورەی تری دیموکراسییە: دیموکراسی پێویستی بە ئامێرێکی گەندەڵە بۆ ئەوەی کار بکات.

## دوو هۆی سەرەکی هەیە بۆ گەندەڵ بوونی حزبایەتی:

١-سروشتی دەسەڵات: کە فەسادی بەدواوە دێت.

٢- موناقەسەی نێوان حزبەکان.

لەنیزامی یەك حزبیدا هۆکاری یەکەمیان دیاترە لە کاتێکدا لە فرە حزبیدا هەردوو هۆکارەکە هەن. نیزامی یەك حزبی لەمەدا لە دیموکراسیی بردۆتەوە.

نموونە لەسەر گەندەڵیی حزبەکان ئەوەندە زۆرن هەموو کەس دەیانزانێت.

جەنەراڵ (دیگۆل) باسی پێش کودیتای (١٩٥٨)ی کردووە کە چۆن حزبەکانی پەرلەمان خەریکی گەمەو (مناوەرات) ی سیاسی بوونو سێ جار وڵاتیان رووەو کارەسات برد؛ یەکەم جار ساڵی (١٩٤٠) کە ئەڵمانیا فەرەنسای داگیر کرد، دووەم جاریش (١٩٥٨) کە پشێوی رووی کردە وڵات، پاشان ماوەی پێش (١٩٦٢). دیگۆل لە وتارێکیدا بۆ میللەتی فەرەنسی وتبووی کە ئەم رووداوانە سەلماندیان کەوا حزبە کۆنەکان نوێنەری

میللەت نین[٢٤١]. کاری ئەم حزبانەو نیزامی پەرلەمانی... وای لە وڵاتەکە کردبوو ناوی (پیاوە نەخۆشەکەی ئەوروپا) ی لێ بنرێت.

سەرجەم ئەم حزبانەش دژی ئیستفتای (١٩٦٢) ی فەرەنسا وەستان (بۆ بڕیار دان لەسەر ئەوەی کە سەرۆك کۆمار راستەو خۆ لە لایەن خەڵکەوە هەڵبژێردرێتو وەك وتمان ئەمە سەرۆك بەهێز دەکات) بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئیستفتای دیگۆل ٦٢٪ ی دەنگەکانی دەستکەوت.

حزبەکانیش ئەگەر دیموکراتی بوونایە دەبوایە بەمە رازی بن بەڵام دیگۆل دەڵێت ئەمانە چەند((دیموکراسیخوازێك)) بوون کە خواستی گەل بەهیچ دەزانن ئەمەش بەڵگەیە لەسەر کاری گیانی حزبی لەسەر مرۆڤ[٢٤٢].

## هەندێك لە رووەکانی گەندەڵی حزبەکان ئەمانەن:

١-هەر حزبێك لاواز بوونو ئەگەر بکرێت نەمانی حزبەکەی تری مەبەستە ... ئەمەش لە رۆژهەڵاتدا زۆر جار بە ساکاریو ئاشکرایی دەکرێت لە کاتێکدا لە رۆژئاوادا ((مۆدێرنانە)) پیادە دەکرێت، واتە قسە دروست کردنو هەڵبەستنی تۆمەتو ناشیرین کردنی وێنەی حزبەکەی تر... هەموو ئەمانەش لە رێگەی قانوونییەوە لەگەڵ مقدارێکی یەك جار گەورە لە دووڕوویی‌و خەڵەتاندنو باسکردنی دیموکراسیو ئازادیو فرە حزبی... ئەگەر هەوڵەکەش بە ئاشکرایی نەکرێت ئەوا مەسەلەکە ملکەچ بوونە بە واقع هەروەها بەهۆی بەهێزیی هەر حزبێك کە بۆ خۆی دەسەڵاتە یان هێزێکی دیاری کراوی لەپشتەوەیە. ئەم هەوڵانەش بەروونی لە ئەمەریکادا دیارن کە رێگە دەگرێت لە دروستبوونی حزبێکی سێیەمی بەهێز.

---

[٢٤١] بروانە: الجنرال دیغول، مذکرات الأمل، التجدید ١٩٥٨-١٩٦٢، ل ٣٦١.

[٢٤٢] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٣٦٠ بۆ مەسەلەی ئیستفتای (١٩٦٢) بروانە ل ٣٣٢ بەدواوە.

جیاوازییەکی گرنگیش هەیە بۆ لەناو بردنی حزب لە رۆژهەلاتو لە رۆژئاوادا ئەویش ئەوەیە کە حزبەکان لە رۆژئاوا تاکە هێزی دەسەلاتدار نین لەبەر ئەوە نەك هەر لەناوبردنی حزبێکی گەورە کارێکی زەحمەتە بەلکو هەروەها کارێکی بێ سوودە.

٢- حزبەکان میللەتو حکومەت لاواز دەکەن، ئەم عەیبەی حزبەکانیش لە عەیبەکانی تردا بەرجەستە دەبێت.

٣- حزبەکان میللەت پەرتەوازە دەکەن.

٤- نیزامی دەستکەوتەکانی شەڕ(نظام الغنائم) The Spoils System شتێکی ناسراوە لە رۆژئاوادا بە تایبەتی لە ئەمەریکادا. حزبی سەرکەوتوو دەسەلات وەك دەستکەوتێك تەماشا دەکاتو وەزیفەو کار دابەش دەکات بەسەر لایەنگرانی خۆی، گرنگیش نییە ئەگەر لێهاتووبن یان نە[٢١٣]. تەنها لە (نیویۆرك)داو بە پێی سەرچاوەکانی چلەکانی ئەم سەدەیە باشترین (٢٠٠٠) وەزیفەی حکومی هەیە کە لەژێر دەستی سەرکەوتوودایە[٢١٤]. هاولاتیانیش لەوە بێزارن کە هەندێك کەس لە جێگەی گرنگی وادا دامەزراون لەکاتێکدا شایەنی ئەوەن بخرێنە نزیکترین بەندیخانە[٢١٥] هەمووش دەزانن کە ئەمە شتێکی خراپە بەلام سەرۆك کۆمار (بۆ نموونە) کە هەلدەبژێردرێت ناچارە حزبەکەی رازی بکاتو بایەخ بە داواکارییەکانی بدات[٢١٦].

٥- حزبەکان بەپێی بەرژەوەندی هەلوێست وەردەگرنو هەلوێست دەگۆڕنو بەبێ گوێدان بە هەقو ناهەق. بۆ نموونە لە ئەمەریکادا ململانە هەیە نێوان دەسەلاتی ویلایەتەکان لە لایەکو دەسەلاتی مەرکەزی (فیدراڵی) لە لایەکی تر. ویلایەتەکان

---

[٢١٣] بروانە: م. دیڤرجێ، النظم السیاسیە، ل ١٠٠. هـ. لاسکی، الدیمقراطیة الأمریکیة، ل ١٢٨، ١٤٠. هـ. زینلۆ هاورێکانی، نظام الحکم والسیاسە... ، ل ٣٦١.

[٢١٤] هـ. لاسکی، الدیمقراطیة الأمریکیة، ل ١٩٩.

[٢١٥] کلنتۆن رۆسیتەر، النظام الرئاسی... ، ل ١٩-٢٠.

[٢١٦] سەرچاوەی سەرەوە.

دەیانەوێت زۆرترین دەسەڵاتیان هەبێتو حکومەتی مەرکەزی کەمترین دەسەڵات بۆ خۆی کۆبکاتەوە. ئەو حزبەش کە لە حوکمدا نییە باسی مافی ویلایەتەکان دەکات، جا ئەگەر حزبی حاکم لە هەڵبژاردنی داهاتوودا سەرنەکەوتو حزبەکەی تر حوکمی دەست کەوت هەڵوێستەکان دەگۆڕێنو ئەوەی کە دوێنێ باسی مافی ویلایەتەکان دەکرد ئەمڕۆ چونکە خۆی لە حوکمە لایەنگری دەسەڵاتی مەرکەزی دەکات، هەمان شتیش بۆ حزبی حاکم کە لە هەڵبژاردنەکاندا دۆڕاوەو حوکمی لەدەست دەرچوو[247]. بۆ نموونە لە (١٨٥٦)ەوە تا(١٩٣٢) حزبی کۆماری لە ئەمەریکادا بانگەشەی دەکرد بۆ مەرکەزییەت بەڵام ماوەی (١٩٣٣)تا(١٩٥٣) کاتێك لە حوکم دوور بوو پشتگیریی لە مافەکانی ویلایەتەکان دەکرد[248].

لە بەریتانیاشدا حزبی لیبرال تا حزبێکی سەرەکی بوو گوێی نەدەدایە چاك کردنی نیزامی هەڵبژاردن بەڵام دوایی کە بووە حزبی سێیەم بیری لە جۆرە نیزامێك کردەوە بەڵکو ئەم جارە بە کەڵکی بێت[249]. هەڵبەتە نموونەکان یەکجار زۆرن لەسەر هەڵوێست گۆڕین کە ئەگەر مرۆڤ بگەڕێت بە ئاسانی بەدییان دەکات.

٦- بە مەبەستی سەرکەوتن لە هەڵبژاردندا حزبەکان ناچارن نیفاقو دوو ڕوویی بکەنو گەل بخڵەتێنن.

٧- حزبەکان بەرنامەی خۆیان دەکەنە قوربانی دەستکەوتنی دەسەڵات.

حزبەکان بۆ ئەوەی دەسەڵات بگرنە دەست (سەوا)و(موعامەلە) دەکەن لەسەر حسابی بەرنامەکەیان[250]. لەناو گەمەی دیموکراتیدا پێویستە حزبەکان (سەوا) ی زۆر بکەنو کەمتر بایەخ بە (مبدأ) بدەن.

---

[247] بڕوانە: م. دیڤرجێ، النظم السیاسیة، ل ١٠٠.

[248] ئۆستن ڕەنی، سیاسە الحکم، ج ٢،ل ٢٩٤.

[249] H. F. Gosnell,Propotional Representation,Op. Cit. ,p. 543.

[250] نقولا حداد، الدیمقراطیة، ل ٥٧.

٨-(لاسكی) لەبارەی مونافەسەی حزبییەوە باسی سەرکەوتنی کەسانێك دەكات کە بێ مێشکن ئەویش تەنها لەبەر ئەوەی کە بە ئاسانتر پێشەوڵکان دەستیان بەسەردا دەگرن لەچاو ئەوانەی کە کێشە دروست دەکەن[٢٥١]. یان بەولتەیەکی تر گەمژەی گوێڕایەڵ باشترە لە لێهاتوویەك کە موناقەشە دەکات، لەبەر ئەوەش کە موناقەسە لە حزبدا هەیە پێشەوڵکان گەمژە گوێڕایەڵەکە هەڵدەبژێرن.

٩- (ئامێری سیاسی) کە باسمان کرد بە شێکی سەرەکییە لە گەندەڵی.

(کۆیڵ) لە پەنجاکاندا دەیووت کەوا پۆلیس (کە لە زۆر شاردا دەزگایەکی گەندەڵە) پشتگیری لە ئامێرەکە دەکات[٢٥٢]. نموونەیەکی تر لە فەسادی ئامێرەکە ئەوەیە کە ئامێرەکە بریتییە لەو کەسانەی کە سیاسەت پیشەیانەو کارێکی ئاسانە لایان کە ئەو (هاوی) یانە پان بکەنەوە کە دێنە ناو مەیدانی سیاسەت[٢٥٣]، واتە ئەو کەسەی تازە دەستی داوەتە سیاسەت بەئاسانی لە لایەن ئامێرەکەوە لە مەیداندا دوور دەخرێتەوە.

١٠- ئەم ئیحتیکار کردنەی کاری سیاسی رۆژ بەرۆژ گەورەتر دەبێت چونکە مەسرەفی بەڕێوەبردنی حزبو مەسرەفی هەڵبژاردن رۆژ لە دوای رۆژ گەورەتر دەبێت. ئەندامانی حزبەکەش ناتوانن واز لە حزبەکە بهێنن هەتا ئەگەر سیاسەتی حزبەکەشیان بەدڵ نەبێت، لەبەر ئەوە یا بەبێ قەناعەتەوە لەناو حزبەکە دەمێننەوە یان خۆیان لەگەڵ حزبەکە دەگونجێنن یان ئەوەشە گۆشەگیر ببن، چارەسەری سێیەمیش ناخۆشترین بڕیارە.

---

[٢٥١] هـ. لاسكي، الديمقراطية الامريكية، ل ١٠٤-١٠٥.

[٢٥٢] ديليد كۆشمان كۆيل، النظام السياسي...، ل ١٠٨.

[٢٥٣] سەرچاوەی سەرەوە.

لە فەرەنسادا ئەندامانی حزبی سۆشیالیستو حزبی کۆمۆنیست لە گۆشەگیری دەترسان[٢٠٤]. لە بەریتانیاشدا ئەگەر ئەندامی پەرلەمان پشتی حزبەکەی نەگرێت خۆی تووشی(خۆکوشتنی سیاسی) دەکات یان بەلای کەمەوە لە حزب دوور دەخرێتەوە[٢٠٥].

هەر کارێك لە دەرەوەی حزبەکاندا (یاخود پێك هێنانی حزبێکی نوێ) کارێکی سەرکەوتوو بەرهەمدار نییە، تەنانەت ئەمەش لەوڵاتێکی بچووکی وەکو کوردستان دەبینرێت کە مەسرەفی کاری سیاسی تیایدا هیچ نییە لە چاو ئەو مەسرەفەی لە رۆژئاوادا پێویستە... بەواتایەکی تر نیحتکار کردنی سیاسەت لە رۆژئاوادا شتێکە وەسف ناکرێت.

١١- جیاوازییەکی کەم هەیە لە نێوان حزبەکاندا. ئەمە بە تایبەتی لە ئەمەریکادا دیارەو جیاوازییەکی وا نابینرێت نێوان بەرنامەی دوو حزبەکە تەنها لە حاڵەتی نا ئاساییدا نەبێت یان کاتێك مەسەلە ئابوورییەکان راستەو خۆ بخرێنە ناو سیاسەت[٢٠٦]. بەڵام ئەگەر جیاوازی نێوان حزبەکان کەم بێت ئەی بۆ چی حزب وا زۆر بووە؟ مەسەلەکە ئەوەیە کە پێشەوا زۆر هەنو ئەمان بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆیان کار دەکەن[٢٠٧]، لەبەر زۆریی پێشەواکانیش حزب زۆر دەبێت.

١٢- ئەگەر هەر ماوەیەك حزبێك بێتە سەر حوکمو سیاسەتی خۆی پیادە بکات، هەر حکومەتێك کارەکانی حکومەتی پێش خۆی هەڵدەوەشێنێتەوە[٢٠٨] ئەگەر ئەمەش بە فرلوانی پیادە بکرێت وڵات تووشی پشێوی دەبێت.

---

[٢٠٤] سارتر، روسی، رۆزنتال، محاورات في السياسة، ل ١٩.

[٢٠٥] ئێرنست گریفیث، نظام الحكم في الولايات المتحدة، ل ١٣٨.

[٢٠٦] ر. مەکئایفەر، تكوين الدوله، ل ٢٦٩-٢٧٠.

[٢٠٧] نقولا حداد، الديمقراطية.... ، ل ٧٢.

[٢٠٨] سیریل جۆد، الحريه في القرن العشرين، ل ٥٧.

١٢- مەترسی گەورەش لەمەدا لەسەر دەوڵەتە بچووکەکانە چونکە ئەوم گۆڕانی حکومەتو سیاسەتە جگە لەوەی کە مایەی زیاد کردنی بێ هێزییە هەروەها ڕێگە دەکاتەوە بۆ دەوڵەتە گەورەکان کە دەست بخەنە ناو کارو باری وڵاتەکە.

لە ڕاستیدا دەست تێ وەردانی دەوڵە تە گەورەکان لە ڕێگەی حزبەکانەوە سەرجەم نیزامو کاری حزبی دەگرێتەوە بەڵکو تەنانەت زۆر جار ئەو دەوڵەتانە خۆیان حزبێکی نوێ دروست دەکەن لە وڵاتێکی بچووکداو بۆ مەبەستێکی دیاریکراوی خۆیان.

هێشتا ماوە لە بارەی حزبەکانەوە بوترێت بەڵام ئەو شتانەی کە ماون جێیان دەهێڵین بۆ خوێنەر چونکە خۆی لەوڵاتەکەی خۆیدا دەیانبینێتو هەر ئەوەندە دەڵێین کەوا ئەگەر لە خەڵك (خەڵکی هەر وڵاتێکی جیهان) بپرسین کە ئایا فرە حزبییان پێ خۆشە وەڵامەکەیان (نەخێر) ە بەڵام فرە حزبی تەنها داواکاری ئەو کەسانەیە کە لە کاری حزبیدا سەرقاڵن یان لایەنگری حزبێکن. بەم جۆرە (فرە حزبی) داوا کاریی چەند تاقمێکە نەك گەل....

# چوارەم -کۆمەڵەکانی فشار
# (کۆمەڵەکانی بەرژەوەندی)

وتراوە کە زاراوەی کۆمەڵەکانی فشار(جماعات الضغط) Presure Groups هەڵەیەو زاراوەی کۆمەڵەکانی بەرژەوەندی (جماعات المصلحة) Interest Groups راسترە. زاراوەی دووەم بە دوو واتا بەکار دێت: یەکەم بە واتای (کۆمەڵەکانی فشار)، دووەمیش بە واتای جۆرێك لە کۆمەڵەکانی فشار بەڵام شێوەیەکی کاتی هەن و پاش ...ی هێنانی ئەنجامەکە نامێنن[359].

ئەم کۆمەڵانە هێزێکی تری کەمایەتین .... ئەم کۆمەڵانە خزمەتی بەرژەوەندییەکانی کەمایەتییەك دەکەن، لەناو خۆشیاندا کەمایەتی کاروبارەکانیان بەڕێوە دەبەن.

کۆمەڵەکانی فشار بۆ خزمەتی کەمایەتییەکی ئاینی یان نەتەوەیی یان بۆ خزمەتی کرێکاران یان سەر مایەداران یان جووتیاران ... تاد دروست دەبن و فشار دەخەنە سەر بەشەکانی حوکم و هەوڵ دەدەن کە رای خەڵکی بۆ لای خۆیان رابکێشن. بە پێی نووسەرێکیش ... دروست بوونی کاری فشار (لۆبی کردن) Lobbying بە هۆی کەم و کورتی لە نیزامی نوێنەرایەتی دروست بووە. لەم نیزامەدا هەندێك مەسەلەی گرنگ بایەخی یان پێ نادرێت بۆیە فشار سەر هەڵدەدات[360]. ئەمەش تا رادەیەك راستە بەڵام جگە لەم هۆیە هۆی تر هەن.

---

[359] دکتۆر ابراهیم درویش، الدولة... ، ل ٣٩٨.

[360]E. Pendleton Herrying , Lobbying. in; Encycl. of the Social Sciences. vol. 9. p. 568.

زۆریەی بۆچوونەکان لەبارەی ئەو کۆمەڵانەوە رێکن لەسەر ئەوەی کە زۆربەی کات زیان بە بەرژەوەندیی گشتی دەگەیەنن‌و خواستی زۆرینــەی خــەڵك دەخەنــە ئــەو لاوە[٣٦١]. (جان مێنۆ) لە کتێبەکەیدا (کە لــە بــارەی ئــەم کۆمەڵانەیــە) دەڵێــت کــە قــەد کۆمــەڵێکی فشارمان نەبینیوە کە کار بۆ بەرژەوەندیی گشتی بکات[٣٦٢].

ئەم کۆمەڵانە لە هــەموو وڵاتــانی رۆژئــاوادا هــەن بــەڵام جۆرو شــێوەی کاریــان لــە وڵاتێکەوە بۆ ئــەوەی تــر دەگۆڕێــت. یــەکێك لــە هۆکــانی دەرکــەوتن‌و دروستبوونیشــیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بۆشاییانەی کە لە دەسەڵاتدا دروست دەبن. هــەر بــۆ نموونــە باســی ئەوە کراوە کە لەگەڵ پاشەکشێی حزبی سیاسی وەکو پێشەوایەکی رای خەڵکی، ژمارەی کۆمەڵەکانی فشار زیادی کردوە[٣٦٣]. وتیشمان کە دەسەڵات بۆشــایی قبــوول ناکــات‌و هــەر بۆشاییەك دروست ببێت زوو پڕ دەکرێتەوە.

کۆمەڵــەکانی فشــار نایانــەوێت وەکــو حزبــەکان دەســەڵات بگرنــە دەســـت‌و بچنــە جێگەی حزبەکان بەڵکو تەنها دەیانەوێت کار بکەنە سەر دەسەڵاتداران[٣٦٤].

کۆمەڵەکان دەڵێن کەوا کار بــۆ تــەنها بەرژەوەندییــەکانی خۆیــان دەکــەن نــەك بــۆ شتی تر، بــەڵام (مێنــۆ) دەڵێــت زۆربــەی کــات ئیدیعــای کۆمەڵــەکان کــە گوایــە دوورن لــە سیاسەت بریتیە لە فێڵێکــی تــەواو[٣٦٥]. کۆمەڵــەکان ناچــارن خۆیــان بخەنــە نــاو کاروبــاری سیاسی، لە لایەکی تریشەوە هەندێك کۆمەڵ لەوانــە مەبەســتی ســەرەکییان مەبەســتێکی سیاسییە.

---

[٣٦١] بۆ نموونە بڕوانە: لیلی ورۆش، منهج السیاسة.. ، ل ١١٧، رۆبێر پیللو، المواطن والدولة، ل ١٨١.

[٣٦٢] جان مێنۆ، الجماعات الضاغطة، ل ٩٤.

[٣٦٣] لیلی ورۆش، منهج السیاسة... ، ل ١٣١.

[٣٦٤] جان مینۆ، الجماعات الضاغطة، ل ٣٦.

[٣٦٥] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٤٦.

## جۆرەکانی ئەو کۆمەڵانە زۆرن[٣٦٦]:

١-کۆمەڵەکانی خاوەن کارەکان (رجال الأعمال) کە دوو جۆرن: یەکەمیان دیفاع لە پیشە سازی بە شێوەیەکی گشتی دەکەن، دووەمیشیان دیفاع لە پیشەسازییەکی دیاریکراوی دەکەن. نموونە لەسەر ئەو کۆمەڵانە: کۆمەڵەی میللی بۆ خاوەن کارگەکان(NAM) کە لە شەستەکاندا سەدان هەزار دۆلاری سەرف کرد دژی هەندێك بڕیاری حکومی، هەروەها ژووری بازرگانی ویلایەتە یەکگرتووەکان، یەکێتی پیشە سازییەکانی بەریتانیا....

٢-کۆمەڵەکانی کرێکاران وەکو نەقابەکانو یەکێتییەکانیکرێکاران. ئەمانە لە ئەمەریکادا پەیوەندییان نییە بە حزبەکانەوە، لەبەریتانیاشدا پەیوەندیان بە حزبی کرێکارانەوە هەیە، لە فەرەنساشدا پەیوەندییەکەیان بەحزبەکانەوە پتەوترە.

٣-کۆمەڵە کشتوکاڵییەکان: کە ئەوانیش یان دیفاع لە کشتو کاڵ بە گشتی دەکەن وەکو (یەکێتی بەرێوەبردنی کێڵگەکان لە ئەمەریکادا) کە یەکێکە لە بەهێزترین کۆمەڵی فشاری ئەمەریکی (بەپێی سەرچاوەی ئەو کاتە)، یان ئەوەشە دیفاع لە بەرهەمێکی دیاریکراو دەکەن وەکو (یەکێتی میللی هەرەوەزی بۆ بەرهەم هێنەرانی شیر)....

ئەم جۆرە کۆمەڵانەی کشتوکاڵ لە پەرلەماندا بە هێز دەبن ئەگەر لادێ نوێنەری زۆری هەبێت لەو پەرلەمانەدا.

٤- کۆمەڵە پێشەییەکان وەکو ئەوانەی پارێزەرانو ئەندازیارانو پزیشکان....

٥- کۆمەڵەکانی جەنگاوەرە دێرینەکان: وەکو کۆمەڵەی (فەیلەقی ئەمەریکی) کە بەپێی ساڵانەی شەستەکان ئەندامانی زیاد لە سێ ملیۆن کەس بوون.

٦- کۆمەڵە ئاینییەکان: وەکو: (تیپی رەوشتە ئاینییەکان)،(کۆنگرەی میللی بۆ خۆشگوزەرانی کاثولیکەکان) ... لە ئەمەریکادا.

---

[٣٦٦] بڕوانە لەبارەیانەوە، ئۆستن رەنی، سیاسە الحکم، ج ٢، ل ٤٨-٥٦ جۆرەکانی سەرەوەشمان بە ئەلی لەو سەرچاوە وەرگرتووە.

٧- ئەو کۆمەڵانەی کە تایبەتن بە رەگەزێکەوە وەکو کۆمەڵەی میللی بۆ چاک کردنی باروبۆخی مرۆڤە رەنگدارەکان (NAACP) کە یەکێکە لە کۆمەڵەکانی رەشپێستەکانی ئەمەریکایە، یان کۆمەڵەکانی جولەکە وەکو کۆمەڵەی سووکایەتیی کردن بە کورانی سەردەمی کۆن (بنای بریث B,nai B,rith)...

٨- کۆمەڵە چاکخوازەکان (جماعات الاصلاح) ە: وەکو کۆمەڵەی دژلیەتی کردنی بارەکان Anti-Saloon League لە ئەمەریکادا کە سالی (١٨٩٣) دامەزرابوو کە توانیبووی چاککرنی هەژدەیەمی دەستوور بەدی بهێنێت بۆ قەدەغە کردنی دروستکردن و فرۆشتنی مەشرووبەکان(دوایش بە چاککردنی دەستووریی ژمارە (٢١) قەدەغە کردنەکە لابرا). ئەم کۆمەڵەش بۆ ماوەی (٣٠) سال دەسەلاتێکی گەورەی هەبوو بەسەر ئەندامانی کۆنگرس و ئەندامانی ئەنجوومەنەکانی ویلایەتەکاندا.

## ئاستەکانی کارکردنی ئەم کۆمەڵانە ئەمانەن:

١-لەسەر پەرلەمان.

٢- لەسەر دەسەلاتی بەجێهێنان.

٣- لەسەر قەزا.

٤- لەسەر رای گشتی.

٥- لەسەر دەزگاکانی حوکمی خۆجێیی.

٦- لەسەر حزبەکان.

کارکردن لەسەر قەزا شێوەیەکی ناراستەوخۆی هەیەو بە وریاییەوە دەکرێت[٢٦٧] چونکە فشاری راستە وخۆ لەم مەیدانەدا خەلك دووردوژنێت.

کار کردن لەسەر پەرلەماندا چەند شێوەیەکی هەیە. لە هەلبژاردنەکانیشدا حزبەکان لە ئەمەریکادا ئەو کەسانە دەپالێون بۆ کۆنگرس کە دەتوانن پشت

[٢٦٧] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٢٣٨و٢٤٠.

بەدەنگەکانی ئەو کۆمەڵانە ببەستن، بۆیە کۆنترۆڵ کردنی یاسادانان لە دەستی حزبەکانەوە چۆتە دەستی کۆمەڵەکان[268]

کۆمەڵەکان زیاتر هەوڵ دەدەن کار بکەنە سەر لیژنەکانی پەرلەمان وەك لە پەرلەمان خۆی چونکە گەمارۆدانی لیژنەکە (کە ئەندامانی کەمن) ئاسانترە لە گەمارۆدانی پەرلەمانەکە[269]

هەرچەندە وتراویشە کە کۆمەڵەکان لایەنگرانی خۆیان نانێرن بۆ هەڵبژاردنەکان[270] بەڵام بڕوا ناکەین ئەمە بە شێوەیەکی رەها راست بێت بە تایبەتیش ئەگەر کۆمەڵەکە بتوانێت ئەمە بکات. بێ گومان دامەزراندنی لایەنگرانی کۆمەڵەکە لە کاری حکومیدا ئاسانترەو بەرهەمی زیاترە.

کۆمەڵەکان هەوڵ دەدەن یاسایەك دەربچێت یان رێگە لە دەرچوونی یاسایەك بگرن بەڵام ئەگەر ئەم جەنگەیان لە پەرلەماندا دۆڕاند ململانەکە دەگوێزنەوە بۆ بەڵنی بەجێهێنان بۆ ئەوەی بەجێهێنان لەرێگەی کارو بڕیارەکانییەوە یاسا نەگونجاوەکە لەکار بخات ئەگەر شەڕەکەشیان لەوێشدا دۆڕاند روو دەکەنە دادگا بۆ ئەوەی شەڕەکە بگەڕێتەوە پەرلەمان تاکو یاساکە دەستکاری بکرێت یان لابرێت، لەو کاتانەشدا هێزەکانی راگەیاندن بەردەوام لەکاردا دەبن[271].

ئەگەر باسی ئاستی(رای گشتی) ش بکەین کە کۆمەڵەکان کاری تێ دەکەن ئەوا کۆمەڵەکان بە پێویستی نازانن کە قەناعەت بە خەڵك بکەن ئەگەر لە ململانەکەیاندا سەرکەوتوو بووبن، بەڵکو لە هەندێك حاڵەتیشدا باشترە بۆیان ئەگەر دەست کەوتەکانیان

---

[268] لیڤی‌و رۆش، منهج السياسة، ل ١٣٢.

[269] رۆبیر پیللو، المواطن‌و الدولە، ل ١٧٩.

[270] بۆ نموونە بڕوانە: هـ. زینك‌و هاورێکانی، نظام الحكم والسياسة في الولايات المتحدة، ل ١٣٥ هەروەها لیڤی‌و رۆش، منهج السياسة... ، ل ١١٩.

[271] بڕوانە: لیڤی‌و رۆش، منهج السياسة... ، ل ١٢٥ دوو نووسەرەکە زیاتر باسی ئەمەریکا دەکەن.

لە خەڵك بشارنەوە، بەلام ئەگەر ناچار بوون بەئاشكرایی شەڕ بكەن ئەوا پێویست دەكات كە رووبكەنە خەڵكو كاریان تێ بكەن[٣٧٢].

هەندێك كۆمەڵیش لە هەندێك مەسەلەی دیاریكراودا بەخەستی كاردەكەنە سەر خەڵك بۆ ئەوەی قەناعەتێكیان بۆ دروست بكەن یان شتێك لە مێشكیاندا لابەرن بەبێ ئەوەی مەسەلەی یاسایەك لە ئارادا هەبێت وەك كۆمەڵانی جوولەكە كە هەوڵی بەردەوامیان هەیە بۆ جوان كردنی وێنەی جوولەكەو ئیسرائیلو بۆ پیشاندانی جوولەكە وەك میللەتێكی زوڵم لێ كراوو بۆ ئەوەی ئەو راستییە لە یادی خەڵكی بەرن كە ئەوا خاكی میللەتێكی تریان داگیر كردووە، بە كورتی بۆ ئەوەی زەمینە بۆ كارەكانیان خۆش بكەن.

لەئاستی حزبەكاندا كۆمەڵەكان لایەنگرانی خۆیان لەناو حزبدا دەپاڵێون[٣٧٣]، هەروەها لە هەندێك وڵاتدا كۆمەڵەكان بەشداری دەكەن لە نووسینی بەرنامەی حزبەكە[٣٧٤]. لە كاتی هەڵبژاردنەكانیشدا حزبەكان بایەخ بە كۆمەڵەكان دەدەن كە كۆمەكیان بدەن زیاتر لە بایەخدانیان بە كۆمەكی تاكەكان[٣٧٥].

فشار لەسەر بەجێهێنان كارێكی رۆژانەیە، تەنانەت هەوڵیش دەدرێت كۆمەڵەكان راستەوخۆ لە چالاكیی حكومەتیدا بەشدار بكرێن، بۆ نموونە لە(سوید) نوێنەری رێكخراوەكان بانگ دەكرێن بۆ لێكۆڵینەوە لە هەندێك مەسەلە، لە ئەمەریكاشدا دانیشتنیان بۆ ساز دەكرێت تا رای خۆیان دەربڕن لە كاتی توێژینەوە لە مەسەلەیەكی دیاریكراودا، لە فەرەنساشدا ئەنجوومەنی ئابووری هەیە[٣٧٦] كە دەزگایەكی رەسمییە بۆ هەندێك لەو كۆمەلانە.

---

[٣٧٢] جان مینۆ، الجماعات الضاغطة، ل ٧٨.

[٣٧٣] ئو رەنی، سیاسة الحكم، ج ٢، ل ٦١.

[٣٧٤] جان مینۆ، الجماعات الضاغطة، ل ٤٤.

[٣٧٥] لیلیو رۆش، منهج... ، ل ١٣١.

[٣٧٦] J. Meynaud, The Executive in the Modern State , Op. Cit,p. 191.

لەبارەی فشار لەسەر ئاستی حوكمی خۆجێیی (محلی) واتەشارەوانییەكان، ویلایەتەكان، ناوچەكان ... تاد قسەی (لیزمولان) دەهێنینەوە كە باسی (بەلجیكا) دەكاتو دەڵێت كە كاری كۆمەڵەكان لەو ئاستەدا راستەوخۆترە لەچاو ئاستی هەموو وڵات (= حكومەت، پەرلەمانی مەركەزی)و (بولوا) كە ئەم قسەیەی (مولان) دەهێنێتەوە دەڵێت كە هەرچەندە ئەم وێنەیە رواڵەتێكی تاریكی هەیە بەڵام راستەو تایبەت نییە بە (بەلجیكا) بەتەنیا[277]. دەشڵێت كە وا دیارە هەبوونی ئەم كۆمەڵانە دەبێتە هۆی خنكاندنی دەربڕینی دیموكراتی لەو ئاستەداو لەوە ناچێت چارەسەرێك بۆ ئەمە هەبێت[278].

كاتی خۆی كۆمەڵەكان بەرتیلیان دەدا، خاوەن كارەكان لە مانگرتووەكانیان دەداو گازو تفەنگیان بەكار دەهێنا، كاری ساختەیان دەكرد.. بەڵام دەوترێت كەوا ئەمڕۆ ئەم جۆرەكانە ناكرێن، لەگەڵ ئەوەشدا (مێنۆ) دەڵێت كە كەمتر دەتوانرێت قەناعەت بەوە بكەین كە رێگە گەندەڵەكان نەمابنو لەجیاتی ئەوانە رێگەی نوێ هەبن وەكو: بەكار هێنانی زانیاری (بۆ قەناعەت كرد بە لێپرسراوان)و پەروەردە كردنو قەناعەت پێ كردن ... دەشڵێت كە مەسەلەكە زیاتر تێكەڵ كردنی هەردوو جۆرەكەیە[279].

كاری كۆمەڵەكان بە شێوەیەكی گشتی پێی دەوترێت لۆبی كردن Lobbying، بۆ كۆمەڵەكانیش وشەی لۆبی Lobby بەكاردێت، وشەكەش لە ئەسڵدا واتای (داڵان) دەدات، كۆمەڵەكانیش ئەوسا لەناو داڵانەكانی بینای كونگرسدا (كاپیتۆڵ) چاویان بە ئەندامانی كۆنگرس دەكەوتو هەوڵیان دەدا مەبەستی خۆیان بە جێبەهێنن، وشەی لۆبی كردنیش لەدوای ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەوە كەوتە بەكار هاتن[280].

شێوەكانی كاری كۆمەڵەكان بەكورتی ئەمانەن:

---

[277] Jean Boulouis. Local Government as a Basis... . Op. Cit. , p. 31.

[278] Ibid,p. 32.

[279] جان مێنۆ، الجماعات الضاغطة، ل ٥١.

[280] E. Pendleton Herring. Lobbying . Op. Cit. , p. 55.

١-قەناعەت كردن بە خەڵكو لێپرسراوان لە رێگەی بڵاوكراوەو كۆبوونەوە ... تاد، بۆ نموونە ((كۆمەڵەی ئابووری)) لە بەریتانیادا ساڵی (١٩٥٦) بیست ملیۆن نامیلكەی بڵاو كردبووەوە هەروەها (١٨) هەزار كۆبوونەوەی سازدلو (٢٣) هەزارو (٥٠٠) موناقەشەی وروووژاندبوو[٢٨١].

٢- هەوڵدان بۆ ئەوەی پرۆژەی یاساكە لە پەرلەماندا بە كۆرپەیی بمرێتو رووناكی نەبینێت.

٣- ئاڵوگۆڕ كردنی بەرژەوەندی Logrolling واتە پشتگیری كردنی ئەندامی پەرلەمان لە یاسایەك كە لای ئەو ئەندامە گرنگە، بەرامبەر بەمەش ئەندامەكە كۆمەكی كۆمەڵەكە دەكات. وشە ئینگلیزییەكەش واتای ((خل كردنەوەی پارچە تەختەكان)) دەدات. كۆمەڵەكان لەم بارەیەوە دەتوانن كۆمەكی زۆری ئەندامە تۆێكەی پەرلەمان یان ئەندامە كەم نرخەكە بدەن ئەویش بە ئامادەكردنی وتارەكانی، سازدانی بینینی كەسایەتییە گرنگەكان، پروپاگندە كردن بۆی[٢٨٢] ...

٤- پروپاگندە كردن بۆ ئەو پاڵێوراوەی كە لایەنگری كۆمەڵەكەیە. حزبەكەش بۆ خۆی كەسێك ناپاڵێوێت بۆ هەڵبژاردن ئەگەر بەوە ناسراو بێت كە دژایەتی كۆمەڵێكی بەهێزی ناوچەكە بكات[٢٨٣].

٥- مانگرتن: كە زیاتر نەقابەكان دەیكەن. هەندێك جار حاڵەتی پێچەوانە هەیە كە فشار كردن بریتییە لەوەی كە كارو (تعلیمات) بە ووردی بە جێبهێنرێن (نەك لەكار بوەستن). بۆ نموونە فەرمانبەرانی گومرگی فەرەنسا ساڵی (١٩٤٧) بۆ ماوەی دوو سەعات بەوردی تەعلیماتیان بەجێ دەهێنا، ئەمەش ناڕەزایییەكی گەورەی لای گەشتیاران دروست كرد[٢٨٤].

---

[٢٨١] جان مینۆ، الجماعات الضاغطة، ل ٢١.

[٢٨٢] هـ. لاسكی، الدیمقراطیة الأمریكیة، ل ١١٨.

[٢٨٣] تۆ. رەنی، سیاسة الحكم، ج ٢، ل ٦٣.

[٢٨٤] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٦٥.

٦- توندو تیژی: باسی بەکار هێنانی هێزمان کرد لە لایەن خاوەن کارگە کانەوە، نەقابەکانی کرێکارانیش هەندێك جار خەڵك دەکوژن‌و بۆمبا دەهاوێن[٢٨٥].

٧- پروپاگندەی جەماوەری: کە جۆرێکە لە قەناعەت کردن بە خەڵك (خاڵی یەکەمی سەرەوە). کۆمەڵەکان ساڵانە سەدان هەزار دۆلار سەرف دەکەن بۆ ((رۆشنبیر کردنی گەل))و دروستکردنی کەشو هەوایەکی گونجاو بۆ مەبەستەکانیان[٢٨٦]. لەبەر ئەمەش وتراوە کە کۆمەڵەکان رای گشتی دەشێوێنن[٢٨٧]. بەڵکو زۆر جاریش یاری بە ئایدیۆلۆجییا کانیش دەکەن[٢٨٨].

٨- هەوڵ دەدەن ئەوە پیشانی کۆنگرس بدەن(باسیش لە ئەمەریکایە) کە ئەو شتەی مەبەستیانە هەر ئەو شتەیە کە جەماوەر دەیەوێت[٢٨٩]. بە واتایەکی تر درۆ بەدەمی جەماوەرەوە دەکەن.

٩- فشار لە رێگەی ناردنی نامەو بروسکە وتەلەفۆن کردن بۆ ئەندامی پەرلەمانەکە کە هانی دەدەن دەنگ بدات لەسەر ئەو یاسایەی کە مەبەستی کۆمەڵەکەیە، یان بۆ ئەوەی ئەندامی پەرلەمان یان لێپرسراوەکە پاشگەز بێتەوە لە بریارێکیان. بۆ ئەم مەبەستەش نەك تەنها ئەندامانی کۆمەڵەکە نامە دەنێرن بەڵکو هەروەها هانی رێکخراوی تر دەدرێت کە بەشداری بکەن لەم هەڵمەتە[٢٩٠].

وتمان کۆمەڵەکانی فشار لە هەموو رۆژئاوادا هەن لەگەڵ چەند جیاوازییەکی نێوانیان، بۆ نموونە لە بەریتانیادا ژمارەو قەبارەیان گەورەترەو رێکخراوترو کاریگەر ترن، بەڵام لەبەرئەوەی مەرکەزییەت لە حزبەکانی بەریتانیادا هەیە کاری ئەم کۆمەڵانە

---

[٢٨٥] سەرچاوەی سەرەوە.

[٢٨٦] سەرچاوەی سەرەوە.

[٢٨٧] رۆبێر پیللو، المواطن والدولة، ل ١٨١.

[٢٨٨] جان مێنۆ، الجماعات الضاغطة،ل ٢٢.

[٢٨٩] لێلی ورۆش، منهج السیاسة... ، ل ١٣٠.

[٢٩٠] سەرچاوەی سەرەوە، ل ١٣٠.

زیاتر لەسەر بەشی بەجێهێنانە[391]. کۆمەڵەکان لە بەریتانیادا پەیوەندی پتەو لەگەڵ پیشەوانی حزبەکاندا دەبەستن، هەر ئەوەندەش بتوانن وەزیری خەزنەو وەزیری مەبەست (بۆ نموونە وەزیری پیشە سازی بۆ مەسەلەیەکی پیشەسازی) مسۆگەر بکەن ئیتر سەرکەوتن بەدەست دەهێنن بەڵام لە ئەمەریکادا دەبێت کۆمەڵەکان لەچەند بەریەکدا بجەنگێن، لەگەڵ لیژنەکانی دوو ئەنجوومەنەکەی کۆنگرس و لەگەڵ سەرۆك کۆمارو لەگەڵ وەزیری مەبەست ... تاد، بۆیە لە ئەمەریکادا زرمو هوری کۆمەڵەکان زۆرترەو کارەکەیان کەمتر مەحکەمە[392] ... ئەمەش بۆ خۆی تێبینییەکی گرنگە چونکە کۆمەڵەکان وەك هێزێکی کەمایەتی کە زیان بە دیموکراسیی دەگەیەنێت بە زۆری لە ئەمەریکادا ناوبانگیان دەر کردووە، بە واتایەکی تر: کۆمەڵەکانی فشار لە غەیری ئەمەریکاشدا هەن و کارێگەرترن و بەم شێوەیە سەرانسەری رۆژئاوایان گرتۆتەوە، ئەنجامێکی گرنگیش ئەوەیە، کە نیزامی حزبی هەر چەندە پتەو بێت ئەمە رێگە لە بەهێزبوونی کۆمەڵەکان ناگرێت.

لۆبییەکان دەتوانن خواستی حکومەت و خەڵك ملکەچ بکەن بۆ خواستی خۆیان، ئەمەش بەپێی رادەی بەهێزییان. یەکێك لە لایەنەکانی بە هێزی بریتییە لە ژمارەی ئەندامانی کۆمەڵەکە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دوو هۆکار هەن کە پێویستە رەچاو بکرێن: ژمارەی ئەندامە کارێگەرەکان لەناو کۆمەڵەکەدا، هەروەها چۆنێتی ئەندامێتی لە کۆمەڵەکەدا (سستە یان گوڕپڕاوە)[393]. بەڵام روو دەدات کە کۆمەڵەکە ژمارەیەك خەڵك بخاتە جووڵە کە لە ژمارەی ئەندامانی خۆی زیاترە[394]. هەروەها هۆکارێکی تری بە هێزیی کۆمەڵەکە بریتییە لە توانای دارایی[395]. هۆکاری تریش هەن کە یەکێکیان رێکخستنە[396].

[391] J. W. Grove, The Role of the Exeeutive in the Modern State, The United Kingdom, Op. Cit., p. 235.

[392] تۆ. رەنی، سیاسە الحکم، ج ٢، ل ٧٢-٧٣.

[393] جان مینۆ، الجماعات الضاغطة، ل ٢٢-٢٣.

[394] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٢٣.

[395] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٢٤.

نموونەیەك لەسەر كارێگەریی ژمارەی ئەندامان و دارایی و ڕێكخستن بریتییە لە كۆمەڵەكانی دڵۆپاندنی كحوول لەفەرەنسادا كە ژمارەی ئەندامیان لە (١٩٤٥) دەوە دەگەشتە دوو ملیۆن و نیو تا سێ ملیۆن و نیو ئەندام.[٢٩٧]

لە فەرەنسادا چەند بڕیارێك درا دژ بە كارهێنانی زۆری كحوول لەلایەن حكومەتی (ڤیشی) یەوە كە سەر بە ئەڵمانیا بوو (پاش داگیر كردنی فەرەنسا) بەڵام پاش جەنگ ئەو كۆمەڵانە توانییان ئەم بڕیارانە هەڵبوەشێنن[٢٩٨] ئەم هەوڵانەی كۆمەڵەكانی (دڵۆپاندنی كحوول) و(ڕەزە وانان) ش یەكێك بوون لە هۆكارە سەرەكییەكانی نەمانی سەرۆكی فەرەنسی (مەندیس – فرانس) لە حوكم[٢٩٩].

دیموكراسیی ڕێگەی بۆ ئەم كۆمەڵانە خۆش كردووە، واتە ((حوكمی گەل)) ڕێگە بە ((حوكمی كەمایەتی)) دەدات. هەرچەندە لە وڵاتێكی وەكو ئەمەریكادا یاسایەك ساڵی (١٩٤٦) دەرچوو بوو كە فەرمان دەدات كۆمەڵەكان خۆیان بنووسن و مەسرەفەكانیان ئاشكرا بكەن ... بەڵام زۆر كۆمەڵ خۆیان لەم یاسایە دەدزنەوە[٤٠٠] ئەم یاسایە بە تەواوی فەشەل هێنا[٤٠١]؛ دەوڵەتانی تریش ئیجرائاتی وایان كردبوو بەڵام كارێگەر نەبوون[٤٠٢].

هەر چەندە كۆمەڵەكان زیانیان زۆرە بەڵام شەرعیەتیان وەرگرتووە بەڵكو بووشنەتە دەزگایەكی سیاسی[٤٠٣]، لەوەش زیاتر بوونەتە جۆرێك لە پەرلەمان[٤٠٤]، لە

---

[٢٩٦] سەرچاوەی سەرەوە،ل ٢٥–٢٦.

[٢٩٧] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٧٤.

[٢٩٨] بڕوانە سەرچاوەی سەرەوە، ل ٧٤.

[٢٩٩] تۆ. ڕەنی، سياسة الحكم، ج ٢، ل ٥٠.

[٤٠٠] لیفی و رۆش، منهج.... ، ل١١٧.

[٤٠١] ڕەنی،سياسة الحكم، ج٢،ل٧٥.

[402]W. J. Shepard, Legislative Assemblies. Encycl. of the Social Sciences, 9, p. 361.

E. Pendleton Herring, Lobbying, Op. Cit., p. 568. [٤٠٣]

هەمووش خراپتر ئەوەیە کە(لێپرسراوێتی – مسؤولیة) یان نییە[١٠٥] واتە دەزگایەکی ڕەسمی نینو دەسەڵاتێکی ڕەسمییان نییە تا حساب پێشکەش بە حکومەت یان بە جەماوەر بکەن.

یە کێك لە زیانەکانیان ئەوەیە کە حکومەتیان ناچار کردووە دەسەڵاتی خۆی زیاد بکات وەك کاردانەوەیەكو وەك پاراستنێکی هاوسەنگی هێزەکان، ئەم زیاد کردنەی دەسەڵاتی حوکمیش لادانێکە لە دیموکراسیی[١٠٦].

نیزامی حزبی بۆ خۆی دەسەڵاتی کۆمەڵەکان زیاد دەکات ئەویش کاتێك چەند حزبێك هەبن لەیەك بچنو موناقەسەی یەکتر دەکەنو دەیانەوێت هەمان جۆرە لایەنگر بۆ لای خۆیان ڕابکێشن[١٠٧]، چونکە لەم حاڵەتەدا حزبەکان ناچارن پشت بەیەك جۆر کۆمەڵی فشار ببەستن، واتە ئەو جۆرە کۆمەڵە((بازاڕی دەبێت))و بەم حسابە((نرخی بەرز دەبێت)).

کۆمەڵەکان ژیانی سیاسیو ڕۆشنبیری ... گەندەڵ دەکەنو سیاسییەکان ناچار دەکەن درۆ بکەن(یان ڕاستر: لە جاران زیاتر درۆ بکەن)و دووڕوو بن(یان: دووڕووتر بن) ... بەکورتی؛ هەموو زیانەکانی کۆمەڵەکان لەژێر زیانێکی سەرەکیدا کۆدەبنەوە ئەویش زیان گەیاندن بە بەرژەوەندیی گشتی لە پێناوی بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵەکان.

کارەکانی لۆبیی جوولەکەش ناوبانگیان هەیەو زۆر کەس دەزانێت کە ئەم لۆبییە چۆن زیانێکی گەیاندووە بە بەرژەوەندییەکانی ڕۆژئاواو بەتایبەتی ئەمەریکا... لە ڕۆژهەڵاتدا بەتایبەتیو لە جیهاندا بە گشتی.

هەڵبەتە نموونەکان لەسەر ئەم زیان لەڕادە بەدەر زۆرنو ئێمە تەنها چەند نموونەیەك لەمانە دەهێنینەوە. یەکێك لەوانە جەنگی یەکەمی جیهانی کە باس لەوە

---

[١٠٤] هـ. لاسکی، الدیمقراطیة الأمریکیة، ل ١١٨.

[١٠٥] دکتۆر ابراهیم درویش، الدولة .... ، ل ١٠٧.

[١٠٦] بڕوانە: ئەلفرێد سوڤی، الرأي العام، ل ١٤٢–١٤٣.

[١٠٧] حاد مێنل، الجماعات الضاغطة،ل ٤٤.

کراوە کەوا جوولەکە دەوری هەبووە لە بەشداریکردنی ئەمەریکا لەم جەنگەدا دژ بە ئەڵمانیا هەرچەندە چارەکی گەلی ئەمەریکی بەرەگەز ئەڵمانی[108] بوون، ئەمەش وەك وتراوە بەهۆی کاری(لویس براندین)ی جوولەکە لەسەر سەرۆك(ویڵسۆن) کە ئەو کردبوویە سەرۆکی دادگای باڵا[109].

نموونەیەکی تر ئەو تیرهابە سیاسیو فیکرییەی کە جوولەکە کردوویەتیو دەیکات دژ بە هەرکەسێك یان هەر دەزگایەك کە رەخنە لە ئیسرائیلو تایبەتی لە جوولەکە وەکو گەلێك دەگرێت. کەسێك یان دەزگایەکی وەها یەکسەر تۆمەی(دژ بە سامییەت) یان دەخرێتە پاڵو دەیان وتارو هەزاران نامەو تەلەفۆنیان ئاڕاستە دەکرێت تا پاشگەز بنەوە.

تیرهابە سیاسیو فیکرییەکەی جوولەکە مێشکی خەڵکی رۆژئاوای بە جۆرێك لەبارەی کێشەی فەلەستین دروست کردووە کە هەر کەسێك خۆی دەچووە فەلەستینو راستییەکەی دەبینی سەری سووڕدەما لە شێواندنی راستییەکان. زۆر لەوانەش کە خاوەنی(انصاف)ن پاش سەردانی فەلەستین رایان لەبارەی جوولەکەو لە بارەی کێشەکە گۆڕیوە بەڵام تەنها کەمێکیان وێراویانە قسە بکەن. رۆژنامە نووسینی بەریتانی(مایکڵ ئادامز) دەڵێت کەساڵی(١٩٦٧) لە(قودس) دا زۆر لەکەسایەتیو پیاوانی ئایینیو خزمەتگوزارانیئەوروپیو فەرمانبەرانی نەتەوە یەککگرتووەکانی بینی کە دەیانزانی چۆن زوڵم لە فەلەستینییەکان دەکرێتو هەندێك جاریش لەمە تووڕە دەبوون بەڵام وەك دەڵێت هۆیەکی گەورە هەبوو کە ئەمان بێ دەنگ بن[110].

لۆبیی جوولەکە لە رێگە دوو کەناڵەوە کاری خۆی دەکات: کەناڵی دارایی؛ جوولەکە دەستێکی باڵایان هەیە لە بواری بانکەکاندا، کەناڵی دووەمیش دەزگاکانی راگەیاندنە کە دەزگای راگەیاندنی زۆریان هەیەو کە بە هۆیانەوە راستییەکان دەشێوێننو

---

[108] جۆن بیتی (؟)، الستار الحدیدی حول امریکا، ل ١٤.

[109] سەرچاوەی سەرەوە،ل ٣٢ بەدواوە.

[110] مایکڵ ئادامز، الاعلام المتمین، گۆڤاری آفاق عربیة، ژمارە ١١، تەمموز ١٩٧٩، ل ٣٠.

فشارێکی گەورە دەخەنە سەر ئەو کەسایەتی و نووسەرو دەزگایانەی کە دژ بەوان قسەو کار دەکەن.

جوولەکە کۆمەڵیان زۆرە، ئێستاش لەناو کۆمەڵەکانی جوولەکە لە ئەمەریکادا بە هێزترینیان(لیژنەی ئەمەریکی- ئیسرائیلی بۆ کارو باری گشتی - اللجنة الأمريكية - الأسرائيلية للشؤون العامة) کە زیاتر بەناوەکورتەکەی ئەیپاك AIPAC ناسراوە.

لە بابەتی(ئازادیی) لەم کتێبەماندا جارێکی تر باسی لۆبیی جوولەکە دەکەین و ئەوەندە بەسە لێرەدا(کە مەبەستمان باس لە کۆمەڵەکان وەك کەمایەتی) قسەی جوولەکەی دژ بە سەهیۆنیەت(ئەلفرێد لیلینثاڵ) بهێنینەوە کە دەڵێت کەوا هۆی زاڵ بوونی ئیرهاب دژی هەر کەسێك کە بە ئاشکرایی دژایەتیی ئیسرائیلیەت دەکات ئەوەیە(کەمایەتی) بەڵکو(کەمایەتیی کەمایەتی) ستەم دەکات[411].

***

کەواتە کۆمەڵەکانی فشار یەکێکن لە هێزەکانی کەمایەتی، لەوەش زیاتر کەمایەتیی کەمایەتین. ئەمان نەك هەر کەمایەتین لەچاو جەماوەردا بی‌ەڵکو هەروەها لەناو دەزگاکەی خۆشیاندا حوکمی کەمایەتی پیادە دەکەن. زۆر لەو کۆمەڵانە بە شێوەیەکی(نظری) بە پێی بنەماکانی دیموکراسیی کاردەکەن بەڵام لە راستیدا زۆربەی کارەکانیان بە هۆی دەستەیەکی ژمارە کەمی مەرکەزییەوە بەرێوە دەبرێن[412].

---

[411] ئەلفرید لیلینثاڵ، اسرائيل ذلك الدولار الزائف، ل ٢٣٩. سەبارەت بە لۆبیی جوولەکە بڕوانە کتێبەکانی لیلینثاڵ هەرچەندە لیلینثاڵ جوولەکە بوو کەچی تۆمەتی (دژ بە سامییەت)ی درابووە پاڵ! هەروەها بڕوانە کتێبەکەی (پۆل فندلی)بە ناونیشانی (ئەوانە وێرایان بەئاشکرایی قسە بکەن) کە لە ژێر ناونیشانی (من يجرؤ على الكلام) بۆ عەرەبی وەرگێڕدراوە. سەرچاوەش لەم بارەیەوە زۆرە.

[412] بڕوانە، ڕەنی، سياسه الحكم،ج٢،ل ٥٨ هەروەها، جان مینۆ، الجماعات الضاغطة،ل ٢٦.

# پێنجەم: هێزە ئابوورییەکان

بەشێکی هەرە گرنگ لە کۆمەڵەکانی فشار بریتین لەچەند هێزێکی ئابووری بۆیە باسەکەی پێشوو تا رادەیەك دەیانگرێتەوە. لەم بەشەشدا تیشکێکی زیاتر دەخەینە سەر کارێگەریی هێزە ئابوورییەکان وەکو لایەنێکی کەمایەتی.

سامان وەکو دەڵێن هێزە، سامانی زۆریش هێزێکی گەورەتر ە. لەوڵاتە دیموکراتییەکانیشدا ساماندارا‌ن بوونەتە یەکێك لە مەرکەزەکانی حوکمی کەمایەتی، وەك لە نموونەکانی تریشدا بینیمان وجودی کەمایەتییە بە هێزەکان نارێکە لەگەڵ حوکمی راستەقینەی گەلدا، بەڵام ئەم وجودەیان ئەنجامێکی چاوەڕێکراوی دیموکراسییەو دیاردەیەکە هەموو سەردەمێكو کۆمەڵگەیەك دەگرێتەوە. جگە لەم نارێکییە لەگەڵ نموونە خەیاڵییەکەی دیموکراسییدا، کەمایەتییەکان زیان بە دیموکراسیی دەگەیەنن، چەندیش هێزی ئەو کەمایەتییە گەورەتر بێت ئەوەندە مەترسییەکە لەسەر دیموکراسیی گەورەتر دەبێت.

لە ئەمەریکاداو بە پێی لیستەکانی باجی داهاتی ساڵی(١٩٢٨) ئەو کەسانەی کە داهاتی ساڵانەیان زیاتر لە هەزار دۆلار بوو لەماوەی حەوت ساڵدا لە(٦٧) کەسەوە بۆ(٥٠٠) کەس زیادی کرد بەڵام لەمانە تەنها(٢٤) کەسیان داهاتی هەریەکێکیان لە(١٠) ملیۆن دۆلار زیاتر بوو[١٠٣]. لەو کاتانەدا ٨٠٪ ی سەرمایەی ناو بانکەکانی ئەمەریکا لەدەستی تەنها(١٢) کۆمپانیای دارایی بوو[١٠٤].

سەرۆکی پێشوو(فرانکلین رووز ڤێلت) ساڵی(١٩٣٨) وتبووی کە قازانجی کۆمپانیاکان کە دابەش دەکرێت بەسەر(٣٠٠) کەسدا تەنها یەك کەس(٧٨) سەنت

---

[١٠٣] جۆن دیووی، الفرىية قديما وحديثا، ل ١٠١.

[١٠٤] سەرچاوەی سەرەوە،ل ٣٦.

وەردەگرێت لەهەر دۆلارێك(كە هەر دۆلارێك سەد سەنتە) لە كاتێكدا(٢٢) سەنتەكەی تر(٢٩٩) كەسەكەی تر وەری دەگرن[٤١٥]. لە شەستەكانیشدا كۆنە لێپرسراوێكی فەرەنسی دەیوت كەوا تەنها بودجەی یەك كۆمپانیای ئەمەریكی، ئەویش(جەنەراڵ مۆتۆرز) ئەوەندەی بودجەی فەرەنسایە[٤١٦].

لە بەریتانیاشداو لەماوەی نێوان(١٩٣١) تا(١٩٤٥) نیوەی سامانی بەریتانیا لەدەستی كەمتر لە ١٪ ی خەڵكەكەبوو[٤١٧].

سەبارەت بەسەرجەم جیهانیش؛ دەوڵەمەندترین ٢٠٪ ی دانیشتوانی زەوی ساڵی(١٩٦٠) ٧٠٪ ی داهاتی جیهانیان لەدەستدا بوو، پاش سی(٣٠) ساڵیش واتە ساڵی(١٩٩٠) ئەم ڕێژەیە بووە ٨٥٪ ی داهاتەكە[٤١٨].

چڕبوونی سەرمایە دیاردەیەك بوو لەسەدەی نۆزدەدا تێبینی كرا. بۆ نموونە ماركس تێبینی كردبوو(هەرچەندە ئەو بە رەهایی باسی كردبوو).

جگە لە گەورەبوونی هەر كۆمپانیایەیەك بۆ خۆی، زۆر جار دوو كۆمپانیا یان زیاتر كارەكانیان تێكەڵاو دەكەن هەر وەكو دوو كۆمپانیا گەورەكەی(فۆرد) ی ئەمەریكی و(فیات) ی ئیتاڵی كە ساڵی(١٩٩٠) بڕیاریان دابوو كارەكانیان لە بواری تراكتۆرو كەل وپەلی كشتوكاڵی تێكەڵاو بكەنو بەمە بایی زیاتر لە پێنج ملیار دۆلار ئامێر دەفرۆشن[٤١٩].

هەڵبەتە نموونەی زۆر لەسەر ئەم چڕبوونە هەیەو ئەوەندە بەسە بڵێین كە هێزە ئابوورییەكان دەوڵەتێكن لەناو خودی دەوڵەتدا. كار دەكەنە سەر حكومەتو جەماوەر بۆ

---

[٤١٥] هـ. لاسكي، الديمقراطية الامريكية، ل ٢٢١.

[٤١٦] Gaston Defferre, Op. Cit., p. 441.

[٤١٧] كريم مسعد، الديمقراطية البريطانية،ل٢ بۆ ژمارەی هەشتەكانی ئەم سەدەیەش لە ئەمەریكادا بڕوانە دكتۆر طەعبد العليم لە گۆڤاری (العربي) كوێتی، ژمارە ٤٤٥، كانوونی دووەمی ١٩٩٦ ل ١١١.

[٤١٨] محمود المراغي، لە گۆڤاری (العربي)ی كوێتی، ژمارە٤٤٥، كانونی یەكەمی ١٩٩٥، ل ٨٠.

[٤١٩] دكتۆر كامل احمد. لە گۆڤاری العالم، ژمارە ٣٣٩، ١١/٨/١٩٩٠، ل ٣٩.

پاراستنو زیاد کردنی سامانەکانیانو هەندێك جار راستەو خۆ خۆیان دەخەنە ناو کارو باری سیاسی.

ئەم هێزانە وەسیلەی جۆراو جۆریان هەیە بۆ بەدەست کەوتنو زیاد کردنی دەسەلاتی ئابووریو سیاسی. یەکێك لەو وەسیلانە ئیحتکارە کە چەکێکی کارێگەری لە دەستیاندا. بەپێی سەرژمێرییەکانی ساڵی(١٩٢٥) ی بەریتانیا زیاد لە ٩٠٪ پیشەسازییەکانی سووتەمەنیو شیری وشلو ئامێرەکانی پێلاو ... تاد ئیحتیکار کراون[١٢٠].

لە ئەمەریکاشدا کۆمپانیا ئیحتیکارییەکان دژ بە رێککەوتنی نوێ New Deal بوون، کە سیاسەتی سەرۆك(فرانکلین رووز فێلت) بوو لە ساڵی(١٩٣٢)ەوە بەدواوە. لەبەر ئەم دژایەتی کردنەش رووز فێلت نەیتوانی ئیحتیکار لەناو بەرێت. تەنانەت دەسەلاتی قەزاش دژی ئەم سیاسەتەی سەرۆك وەستاو بە کارێکی نادەستووریی زانی کە حکومەت دەست بخاتە کاروباری ئابووری [١٢١]یان بەواتەیەکی تر کارو باری سەرمایەدلاران.

ساڵی(١٩٦٢)ش روویەڕوو بوونەوەیەك بەرپا بوو لە نێوان سەرۆکی ئەمەریکی(جۆن کینێدی) – کە خۆشەویستی گەل بوو– و کۆمپانیا گەورەکانی پۆلا کە نرخەکانیان بەرز کردبووە، پاش فشارو هەڕەشەیەکی زۆر ی سەرۆك کۆمپانیاکان شەڕەکەیان دۆڕاند[١٢٢]. زانراویشە کە ساڵی(١٩٦٣) کینێدی کوژرا، پاشان کابرایەك گیرا کە گوایە ئەو بکوژەکەیە دوایی ئەمیشیان کوژرا. تا ئێستاش مەسەلەی کوشتنی کینێدی بە نهێنی ماوەتەوە، هەروەها پاش کوشتنی لە دەزگاکانی راگەیاندندا زۆر باسی پەیوەندییە جنسییەکانی دەکرا لەگەڵ ئافرەتانداو باسی(عەشیقە) کانی دەکرا بەجۆرێك کە لەگەڵ هیچ سەرۆکێکی تری ئەمەریکی کاری وا نەکراوە وەك چۆن هەوڵ درابێت وێنەکەی لای ئەمەریکییەکان ناشیرین بکرێت.

***

---

[١٢٠] کرم سعد، الدیمقراطیة البریطانیة، ل ٨٩-٩٠ بڕوانە نموونەی تری ئیحتیکار لەهەمان سەرچاوەدا.

[١٢١] بڕوانە؛ هـ. لاسکی، اصول السیاسه،جا،ل ٢٤.

[١٢٢] بڕوانە: لیڤی ورۆش، منهج السیاسة...، ل ٣٨-٣٩.

خاوەن کارگەکان(لۆبیی) ی خۆیان هەیە کە بەهێزترین لۆبییە، لە ئەمەریکاداو بە پێی سەرچاوەیەکی شەستەکان(٢٠٠) یەکێتی غەیری دارایی و(٥٠) یەکێتی دارایی هەیە، هەموو ئەمانەش(یەکێتی خاوەن پیشە سازیو خستنە کار) کۆیان دەکاتەوە[١٢٣].

ئاشکراشە کە ئەم کۆبوونەوەو خۆڕێکخستنەی کەمێك دەوڵەمەند ئاسانترە لە چاو خۆ ڕێکخستنی ژمارەیەکی زۆری کریکارانی هەژار[١٢٤]. کەواتە دەوڵەمەندەکان جگە لە سامانەکەیان کە هۆکارێکی گەورەی بەهێزییە هۆکارێکی تری بەهێزییان بەدەست کەوتووە ئەویش ڕێکخستن.

سەرمایەداران بەهۆی ئەم بە هێزییە دەستیان خستۆتە کاری سیاسی وولاتو بە بەجێهێنانی ئامانجە ئابوورییەکان نەوەستاون. دەستڕۆیشتنیش لەمەیدانی سیاسیدا ڕێگە خۆشتر دەکات بۆ زیاد کردنی سامان.

نموونە لەسەر کاری دەوڵەمەندەکان لە مەیدانی سیاسیدا زۆرە. یەکێك لەوانە(لاسکی) دەیهێنێتەوەو کەهی چلەکانی ئەم سەدەیەیە. (لاسکی) دەڵێت کەوا ڕەنگە ناخبەکانی ویلایەتی دێلاوەیر(لە ئەمەریکادا) دوو تۆێنەرەکەیان لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە بنێرن بۆ ئەنجومەنی پیران بەلام هەموو کەسێك دەزانێت کە سەرۆکی ڕاستەقینەی ئەم دووانە بریتییە لە بنەماڵەی مەزنی(دی پۆنت)[١٢٥].

سەرمایەداران بەدەست تێ وەردان لە کاروباری ولات ناوەستن بەڵکو هەموو وەسیلەیەکیش دەگرنە بەر بۆ بەدی هێنانی ئامانجەکانیان. (لاسکی) باسی وەسیلەکانی ڕۆکفێلەر Rockfeller * دەکات لە پێناوی مانەوەی وەك پێشەوایەکی پیشەسازیی

---

[١٢٣] سەرچاوەی سەرەوە، ل ١١٩–١٢٠.

[١٢٤] هـ. لاسكي،مدخل الى علم السياسة، ل ١١٠. لاسکی هۆکان دەڵێت کە چین.

[١٢٥] هـ. لاسكي، الديمقراطية الامريكية، ل ٢٣.

* ڕۆکفێلەری (باوك)و (کوڕ) هەیە کە هەردووکیان سەرمایەدار بوون، لاسکی لێرەدا مەبەستی لەباوکەکەیە (١٨٣٩–١٩٣٧) کە شای پیشە سازی نەوت بوو.

ئەوت لە بەرتیل دان و گەندەڵ کردن، دەشڵێت کەوا یاسا ئەگەرەیەك بوو کە دەبوایە خۆی لێ بدایە، (رۆکفێلەر) وێنەیەکی دەرکەوتووە لە کەژاوەی کەسانێك کە ئامادەن بەبێ رەحمو بەزەیی رێگەی خۆیان رووەو بەهێز بوون بکەنەوە[426].

***

یەکێك لە رووەکانی ناکۆکی نێوان سەرمایەداری و دیموکراسیی مەفهوومی بڕیارە سۆشیالیستەکان لەبارەی(دیموکراسیی ئابووری– الدیمقراطیة الأقتصادیة) دەری دەخات. ئەم دیموکراسییە جیایە لە واتا بەربڵاوەکەی دیموکراسیی کە بە(دیموکراسیی سیاسی) ناوی دەبەن.

ئەوسا دیموکراسیی زیاتی بە لیبرالیەتەوە پەیوەست بوو، بەڵام وەك(لاسکی) دەڵێت تەنها لە شۆڕشی فەرەنسییەوە(١٧٨٩) یە کسانی ئابووری بووە بەشێکی هەمیشەیی لە عەقیدەی دیموکراتی[427]. بەڵام هێشتا زۆری دەمێنێت تا(دیموکراسیی ئابووری) بهێنرێتە مەیدانی موناقەشەوە.

بەرهەم هێنانی زۆر گەشەسەندنی دەزگا دیموکراتییەکانی خێراتر کرد[428]، ئەویش بەهۆی فشاری سەرمایەداران کە دەیانویست وەکو چینی ئەرستوکراتی(بەگزادەکان) دەسەڵاتیان هەبێت، بەڵام لە هەمان کاتدا دیموکراسیی لای ئەوان وەسیلەیەك بوو بۆ زیاد کردنی سامانەکانیان[429]. دیموکراسییش رێگە لە مە ناگرێت، بەتایبەتی ئەگەر دیموکراسییەکی لیبرال بێت.

---

[426] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٤٢.

[427]H. Laski, Democracy, Op. Cit. p. 77.

[428]Ibid, p. 81.

[429] بۆڵدوین (لەزانکۆیەکی ئەمەریکی)دەڵێت: دیموکراسیی لای سەرمایەدارەکانی ئەمەریکا (سەدەی رابردوو) چەکێك بوو بۆ مافی بچراندن و پاراستنی سامان بۆ خۆیان بپوانە:د. ل. بۆڵدوین، الدیمقراطیة أمل الانسان الاکبر، ل ١١٢.

لیبرالییەکان(ئازادیخوازان) نەك هەر بانگەشە بۆ ئازادیی ئابووری دەکەن بەڵکو بۆ چوونی(دیموکراسیی ئابووری)ش دەشێوێنن، وەك لێکۆڵەرەوەیەکی عەرەبیش دەڵێت: لیبرالییەکان(دیموکراسیی ئابووری) بە(ئازادیی ئابووری) تەفسیردەکەن[420]، ئەویش چونکە(ئازادیی) چەمکی سەرەکییە لە بیرو بۆ چوونیانو دیموکراسیی ئابووری لەوکاتەدا هەیە کە تاکەکان ئازاد بن لە چالاکیی ئابووریو کە کەس دەست نەخاتە کاریان، لە کاتێکدا دیموکراسیی ئابووری(لای سۆشیالیستەکان) یەکسانی لە بواری ئابووریدا دابین دەکات.

بە پێچەوانەی بۆ چوونی هەردوو(دیموکراسیخوازان) و(مارکسییەکان): (ئازادیی ئابووری) و(یەکسانیی ئابووری) دژ بەیەکن چونکە ئەگەر وەکو مارکسییەکان بانگەشە بۆ یەکسانی ئابووری بکەین ئەو کاتە رێگە لە ئازادیی ئابووری دەگرین بەو واتایەی کە هەموو کەسێك ئازاد بێت سامان پەیدا بکاتو باس کردن لە ئازادیی ئابووری بە واتای ئەوەی چینی کرێکار کۆیلەی سەرمایەداران نەبێت بەس نابێت.

ئەگەر وەکو دیموکراسیخوازانیش باس لە ئازادیی ئابووری بکەین پێویستەچاوەڕێی نا یەکسانیی ئابووری بکەین چونکە بە هۆی ئازادیی ئابوورییەوە کەسەکان وەکو یەك خاوەن سامان نابن.

بەر لەدوو سەدەش ئەلکسەندەر هامڵتۆن – کە یەکێك بوو لەدامەزرێنەرانی دەستووری ئەمەریکی– وتبووی کەوا تائازادیی هەبێت نایەکسانی هەر دەمێنێت، نەبوونی یەکسانیش ئەنجامی ئەو ئازادییەیە[421]. ئەمەش یاسایەکە بۆ خۆی((نا یەکسانی ئەنجامێکی ئازادییە))، بۆ دابین کردنی هەردوو(یەکسانی) و(ئازادیی) ش پێویستە هێزێك هەبێت کە ئەو هێزەش دەوڵەتە، ئەو کاتەش لە جیاتی(یەکسانی)، (دادپەروەری) بەدی دێت چونکە یەکسانی، بەتایبەتی یەکسانی تەواو قەد بەدی نایەت. بەهەر حاڵ باسێکی

---

[420] دکتۆر محمد یحیی عویس، لە مستقبل الدیمقراطیة ومفاهیمها، ل٤٢٥.

[421] سۆڵ بادۆڤەر، معنی الدیمقراطیة، ل ١٣٤–١٣٥.

تری ئـــازادیی‌و یه‌کســـانی لـــه به‌شـــی(ئـــازادیی) دا ده‌که‌ینـــه‌وه‌و لـێره‌دا ده‌ڵێـین کـه مه‌به‌سته‌که‌مان باسکردنی دیموکراسیی ئـابووری بـوو کـه زۆر کـه‌س هـه‌بوو به‌تایبـه‌تی سۆشیالیسته‌کان، بانگه‌شه‌یان بۆ ده‌رکردو نه‌بوونی ئه‌م دیموکراسییه‌یان ده‌کرده ره‌خنه له دیموکراسیی رۆژئـاوا کـه ئه‌مـه ره‌خنه‌یـه‌کی راسته بـه‌ڵام وه‌ك وتمـان ده‌بێت دان بـه ئه‌نجامه‌که‌یدا بنرێت ئه‌ویش سنووردانان بۆ ئازادیی به تایبه‌تی ئازادیی ئابووری.

له روانگه‌ی ره‌خنه‌ش له دیموکراسیی سیاسیه‌وه ره‌خنه‌یه‌کی تر ســه‌ر هـه‌ڵده‌دات ئه‌ویش که سه‌رمایه‌داری‌و دیموکراسیی ته‌نها له‌و کاته‌دا پێکه‌وه ده‌ژین که بـه‌رژه‌وه‌ندیی سه‌رمایه‌داری پارێزراو بێت. (لاسکی) ده‌ڵێت که ئه‌گه‌ر دیموکراسیی سیاسی هـه‌وڵ بـدات موڵکایه‌تیی تایبه‌ت بکاته موڵکایه‌تیی گشتی(واته موڵکایه‌تی سه‌رمایه‌داره‌کان بدات بـه ده‌وڵه‌ت) ئه‌وا چینی سه‌رمایه‌دار ده‌سه‌ڵاتی ده‌وڵه‌ت خۆی به‌کار ده‌هێنێت بـۆ نه‌هێشتنی ده‌زگا دیموکراتییه‌کان[٤٣٢]، هه‌روه‌ها ده‌ڵێت که به پێـی ته‌جروبـه‌ی مـاوه‌ی پـاش جـه‌نگی یه‌که‌می جیـهانی(مه‌به‌ستی لـه ته‌جروبـه لـه‌گـه‌ڵ فاشـیه‌تدا) سـه‌رمایه‌داری وا بـه‌چاکتری ده‌زانێت که دیموکراسیی بکوژێت نه‌ك واز له ئیمتیـازاتی خـۆی بهێنێت[٤٣٣]. (مه‌کئایڤـه‌ر) یش ده‌ڵێـت کـه خۆمـاڵی کردنـی تـه‌واو(التـأميم التـام) ی موڵکـه‌کان مه‌ترسییه له‌ســه‌ر دیموکراسیی[٤٣٤].

بـێ گومـان لـه نـاو بردنـی دیموکراسـیی دوایـه‌مین چـه‌کی ســه‌رمایه‌داران نییه(ئه‌وانیش سوودێکی گه‌وره له دیموکراسیی وه‌رده‌گرن) به‌ڵکو به‌رله‌وه هه‌موو توانای خۆیان به‌کار ده‌هێنن بۆ پاراستنی ده‌ستکه‌وته‌کانیان ئـه‌ویش لـه رێگـه ده‌ستوورییه‌کان یـان یـاری کـردن بـه‌و رێگـه ده‌سـتوورییانه، بـۆ نموونـه رێگـه گرتـن لـه‌و حزبانـه‌ی کـه ده‌یانه‌وێت بناغه‌ی سه‌رمایه‌داری بگۆڕن وسۆشـیالیزم بـه‌دی بهێنن، ئه‌مـه‌ش لـه رێگـه‌ی

---

[٤٣٢] هـ. لاسكي، الدولة...، ل ١٥٤.

[٤٣٣] هـ. لاسكي، اصول السياسة، ج ١، ل ٢٥.

[٤٣٤] ر. مه‌کئایڤه‌ر، تكوين الدولة، ل ٤٣٣.

بەرەنگاری کردنی ئەو حزبانە لەناو پەرلەمان و حکومەتو لەناو جەماوەردا بە شێوەیەکی ڕواو ناڕوا.

(لاسکی) ساڵی(١٩٢٥) دەیوت کەوا هێشتا ئەو قسەیە بڵاوە کە کاری ئەنجوومەنی لۆردەکانی بەریتانیا(کە ئەنجوومەنی چینی ئەرستۆکراتیی وڵاتە) پاراستنی وڵاتەکەیە لە حکومەتێکی حزبی کرێکاران کە هەوڵ بدات بنەما سۆشیالیستەکان بکاتە یاسا، هەروەها هەموو پێشنیارەکانی حزبی پارێزگاران بۆ ئەوەیە کە تەگەرە بخاتە بەردەم یاسادان لە لایەن حکومەتی کرێکارانەوە[١٣٥]. هەروەها دەڵێت کە چەند ئیجرائێکی دەستووری دژ بە حزبی کرێکاران بەتەنیا کراون[١٣٦]. شتێکی چاوەڕێ کراویشە کە حزبی کرێکاران بەرەبەرە واز لە هەڵوێستەکانی بهێنێت، تا لەم دواییدا ئەم حزبە بە سەرکردایەتی(تۆنی بلێر) کە ساڵی ١٩٩٤ بووە سەرکردە ڕووەو ناوەڕاست ڕۆشتووە[١٣٧]، واتە لە(چەپ) دوور کەوتۆتەوە.

(لاسکی) هەروەها باسی وڵاتە سکەندنافییەکان(-سوید، نەرویج، ...) دەکاتو دەڵێت کە هەرچەندە لەو وڵاتانە حکومەتی سۆشیالیست پێک دەهێنرێت بەڵام هیچیان ناوێرن ئیجرائاتی سۆشیالیست بهێننە کایەوە[١٣٨].

لە ئەمەریکادا ڕێگەی توندو تیژتر بەکار هاتبوون. پاش هەردوو جەنگی جیهانی کۆمونیستەکان تووشی گرتنو سزادانو ڕاونان بوون(ئەمەش لەباباتی ئازادیدا باس دەکەین) ئەویش چونکە کارەکەیان لەگەڵ سەرمایەداریدا ناگونجێت ... پاش ئەوەشو ساڵی(١٩٦١) دادگای باڵا حوکمێکی نادەستووریی سەپاند بەسەر ئەندامێکی حزبی

---

[١٣٥] هـ. لاسکی، الدولة ....، ل ٢٧٨-٢٧٩.

[١٣٦] سەرچاوەی سەرەوە، ل ١٥٨.

[١٣٧] بڕوانە گۆڤاری المشاهد السياسي، ژمارە ٣١، ١٣-١٩ تشرینی یەکەم، ١٩٩٦، ل ٦٦.

[١٣٨] هـ. لاسکی، اصول السياسة، ج ١،ل ٢٥. ئاشنزانین ئێستا لەوێدا وەزعەکەیان چۆنە هەرچەندە ئاشکرایە کە ئەو وڵاتانە هێشتا سەرمایەدارانو نەبوونە سۆشیالیست.

کۆمۆنیست(شەش ساڵ زیندانی) گوایە هەوڵی داوە حکومەت بگۆڕێت هەرچەندە ئەمەی بەکار نەکردبوو بەڵکو بە قسە داوای ئەوەی کردبوو[139]. بەپێی یاساش دەبێت ئەو کەسە بەکردار هەوڵی تاوان بدات ئینجا بەتاوانبار بزانرێت بەڵام یاسای سەرمایەداران شتێکی ترە، هەر ئەو یاسایەی سەرمایەدارلنیش بوو کە سەردەمی تۆقاندنی(مەکارثی) ی هێنایە کایەوە(بڕوانە باسی ئازادیی).

بەپێی گۆڤارێکی ساڵی(١٩٣٤) زۆر زەحمەت بوو کەسێك جێگەی خۆی لەکاردا بکاتەوە ئەگەر بە ئاشکرایی دوژمنایەتیی سەرمایەداری بکات، هەروەها لە هەموو کارێکی حکومەتی دووردەخرێتەوەو تەنانەت لە کارە ناحکومەتییەکانیشدا تەگەرە دەخرێتە بەردەمی[140]. بێ گومان تا ئەمڕۆش ئەوە راستە کە ناگونجێت کرێکار یان فەرمانبەری لای سەرمایەدار دوژمنایەتیی سەرمایەداری بکات، لە لایەکی تریشەوە نەمانبیستووە فەرمانبەرێکی گەورەی حکومەت بیروبۆچوونی چەپڕەوانەی هەبێت. بانگخوازێکی دیموکراسیش دەڵێت: پێویستە بە رواڵەت نە خەڵەتێین چونکە ئەو کەسەی کە بترسێت کارەکەی لە دەست بدات بڕیتی نییە لەو هاوڵاتییەی کە یەکسانە لەگەڵ هاوڵاتییەکانی تر کە کتێبەکان باسی دەکەن بۆمان[141].

دیموکراسیی لەسایەی سەرمایەداراندا کرێکارانو هەموو چینەکانی(خوارەوە)ی کۆمەڵگە بەچەند شتێکی شکلی دەخەڵەتێنن. (سارتر) دەڵێت کە مافی هەڵبژاردن بڕیتییە لە گومراکردنی چینی کرێکارە، ئەوەش هەروەها گومراکردنە کاتێك داوای رادەربڕین لەو چینە بکرێت لەبارەی کێشە گرنگە کانەوە بەبێ ئەوەی پەیوەستێك بکرێت لە نێوان ئەم کێشانەو بارودۆخی ئەو چینە[142].

---

[139] لیڤی وروش، منهج السیاسة الامریکیة...، ل ٢٦٢.

[140] هـ. لاسکی، الدولة ...، ل ٢١٥.

[141] ئیلیسل بیرنز، الدیمقراطیة، ل ١٨٧.

[142] بڕوانە: سارتر، رۆسی، رۆزنتال، محاورات في السیاسة، ل ١٠٥.

نموونەیەکی تری خەڵەتاندن لەلایەن سەرمایەدارانەوە مافی ئافرەتانە کە –وەکو لاسکی دەڵێت– بۆتە داواکاریو یاسا دانی پیادا دەنێت ئەویش لەو کاتەوەی کە پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنان وایان پێویست کرد دان بەو مافانە بنرێت[443]. بەواتایەکی تر: سەرمایەداران پێویستیان بەکاری ئافرەت بوو بۆ ئەوەی هەمیشە ژمارەی کرێکاران زۆر بێتو جگە لە دابەزاندنی نرخی کار، سەرمایەداران لە مانگرتن نەترسن، هەروەها نرخی کاری ئافرەت لە هی پیاو کەمترە.... ئەمانەش هۆی باسکردنی((مافی)) کارکردنی ئافرەتن، ئەنجامی ئەم مافەش ئەوەیە((ماف)) ی تریان پێ ببەخشن. کە یەکێکیان ئەو مافە شکلییەی کە پێی دەوترێت(مافی دەنگدان)

نموونەیەکی سێیەمی خڵەتاندن، بایەخ دانە بە فێرکردنی هاوڵاتییان کە وەك دەڵێن پێویستە بۆ گەشەسەندنی دیموکراسییو کە بوو بە یەکێك لە کارەکانی دەوڵەت هۆکەش ئەوەیە کە پیشەسازی وای پێویست کرد کە کرێکاران خوێندەوار بن[444].

کەواتە گەشەسەندن یان هەرەس هێنانی دیموکراسیی تا رادەیەکی گەورە پەیوەستە بە بەرژەوەندییەکانی سەرمایەداران. مێژوو خۆشی تۆماری کردووە چۆن دیموکراسیی بۆ بەرژەوەندیی دەرەبەگەکانو سەرمایەدارەکان سەری هەڵدابوو. ئەو رووداوە گەورەیەی ئینگلتەرا: پەیمانی گەورە Magna Carta(١٢١٥ی زایینی) بریتی بوو لە ئیعتراف کردنی پادشا بە مافەکانی دەرەبەگەکان بەڵام هیچی تێدا نەبوو لەبارەی مافەکانی گەل[445]، رووداوە گرنگەکەی پاش ئەمەش شۆڕشی ئینگلیزی بوو(سەدەی ١٧) کە بەرگریی لە پەرلەمان دەکرد بەڵام لە پشتی ئەمەوە داواکارییەکەی بازرگانەکان بوو کە مافی بەشدار بوونیان هەبێت لەحوکمدا[446]، پاش ئەوەش چاککردنی ساڵی(١٨٣٢)

---

[443] بڕوانە: هـ. لاسکی، الدولة.... ، ل ١٢٨.

[444] سەرچاوەی سەرەوە.

[445] دیڤید کوێل، النظام السیاسی.... ل ٢٦٨.

[446] هـ. لاسکی، الدولة .... ، ل ١٢٩.

هاته کایەوە کە هەنگاوێکی گرنگی دیموکراسیی بوو بەڵام ئایا چۆن بڕیار لەسەر ئەم یاسایە درا؟ لەوکاتەدا لە لایەك برسیتی لەناو جووتیاراندا هەبوو، لەلایەکی تریش بێزاری هەبوو لە یاساکانی نەهێنانی گەنم لەدەرەوە ... ئەمانە بوونە هۆی سازدانی خۆپیشاندن لەلایەن جووتیاران و کرێکاران و پیشەسازان، دەسەڵاتدارانیش زانییان کە ئەوان((بەنیوە یان بەچارەکی هێزەکانیان ڕوو بەڕووی شۆڕشەکە دەبنەوە)) بۆیە چارەسەرەکە ئەوەیە سەرمایەداران بێنە ریزیانەوە تا واز لە شۆڕشەکە بهێنن، لەبەر ئەوە یاسای ساڵی(١٨٣٢) دەرچووو پیشەسازان چوونە ناو پەرلەمان، پاشان حکومەت بە فیشك بەرامبەر خۆپیشانداران وەستا[٤٤٧].

هەتاکو ساڵی(١٩١٩) ەش تەنها دوو چینی دەرەبەگو بورجوازی(هەروەها پیاوە گەورەکانی کەنیسە) نوێنەریان هەبوو لە پەرلەمانی ئینگلیزداو لەوە بەدواوە پەرلەمان بۆ هەموو چینێك کرایەوە. بەڵان ئایا بەراستی پەرلەمان کرایەوە یان خەڵك بە رواڵەت هەڵ خەڵەتاون ؟ وەڵامەکەی ئەوەیە کە هێزی سەرمایەداران بناسین، کە ناسیشمان دەزانین کەوا ئەم چینە بەراستی لە هەندێك(امتیازات) دەستی هەلگرتووە بەڵام هێشتا زۆری بۆ ماوەتەوە، ئەختێك دووڕوویی و ئیدیعای گەورە گەورەش بەسە بۆ شاردنەوەی ئەم راستییە. تۆ بڵێیت سەرمایەدارێك کە بەوردی حساب بۆ کارە ئابوورییەکانی بکات حسابە سیاسییەکانی((سەرپێیی)) بکات؟

مافەکانی هەڵبژاردن فراوانتر کران و گەلی تێدا بەشدار کرا بەڵام وەك باسمان کرد، مەسرەفی زۆر لە توانای سەرمایەدارە گەورەکاندایە، هیچ یاسا یەکیش بۆ سنووردانان بۆ مەسرەفی هەڵبژاردن ناتوانێت یەکسانی دابین بکات لە نێوان پاڵێوراوەکان ئەگەر مەسرەفەکەش بۆ یەك پاڵێوراو کەم بێت ئەوا بۆ ژمارەیەك پاڵێورلو زۆرتر دەبێت و بەم شێوەیە هیچ کۆمەڵێکی هەژار ناتوانێت لە سەرانسەری وڵات پاڵێوراوی هەبێت. کەواتە هەر لەسەرەتاوە دیموکراسیی لە ژێر کۆنترۆڵی تەواوی یان نیوە تەواوی سەرمایەدارییە.

---

[٤٤٧] سەرچاوەی سەرەوە، پێشەکیی وەرگێر کامل زهیری، ل ١١-١٢.

سەرمایەداران بەوە ناوەستن بەڵکو هەوڵیش دەدەن دەست بگرن بەسەر ئەندامانی پەرلەمان و فەرمانبەرانی حکومەتدا. لە توێژینەوەیەکی ئەنجومەنی پیرانی ئەمەریکاشدا باسی ئەوە کرا کە سەرمایەدارە دارییەکان لەبارەی هەموو ئەو کەسانە دەپرسنەوە کە پاڵێوراون بۆ کارە حکومییەکان بەڵکو شتێکی خراپ لەبارەیانەوە بدۆزنەوە ئەویش بە مەبەستی ملکەچ کردنیان[448].

سەرمایەداران هەروەها هەوڵ دەدەن دەست بگرن بەسەر حزبەکانیشدا، سەرمایەداران وای بە باشتر دەزانن پارە بۆ حزبەکان سەرف بکەن و کارێك نەکەن حزبەکان پێویستیان بەوان نەبێت[449].

یەکێکیش لە گەورە سەرۆکانی یەکێتییە ئەمەریکییەکان دانی بەوە دانابوو کە خۆی و خاوەنی کار هەوڵ دەدەن دەست بگرن بەسەر حزبەکاندا لە رێگەی گەندەڵ کردن و بەرتیل دانەوە[450].

دەسەڵاتی سەرمایەداران دەگاتە بواری فێرکردنیش، دوایی تریش لە بابەتی(ئازادیی)دا باسی دەکەین چۆن بە هۆی پارە سەرف کردن بۆ زانکۆ و پەیمانگەکان هیچ مامۆستایەك یان هیچ بیرو باوەڕێك جێگەیان نابێتەوە ئەگەر(رادیکاڵ) بن... بێ گومان(رادیکاڵ) بە پێی پێناسەی سەرمایەداران. (لاسکی) دارییەکانی ئەمەریکاو پیشەسازانی بەریتانیا دەخاتە ریزی(هتلەر) و(موسۆلینی)و دەڵێت کە لە قوتابخانەکاندا عەقلی نەوەکانی دوارۆژ ئامادە دەکرێت بۆ ئەوەی بە پەرستنیان قایل بن بەڵکو هەروەها بۆ ئەوەی ئەم پەرستنە بەسەریاندا بسەپێنرێت[451].

---

[448] ئەلبێرت کان، الخيانة العظمى، ل ١٤٥.

[449] دەیڤید کویل، النظام السياسي، ل ١٠٣-١٠٤.

[450] هـ. لاسکی، اصول السياسة، ج ٤، ل ٥٦.

[451] هـ. لاسکی، الدولة ...، ل ٣١٤.

(بیرنـارد شـۆ)ش قسـەی بـۆ ئەمەریکییـەکان کردبـوو وباسـی بانکـەکانی کردبـوو وتبووی کە بانکەکان بوونەتە هێزێکی وا کە بۆی هەیە ببێتە هێزێکی سیاسیی بـێ وێنـە، ئەوە ئەگەر نەبێتە هێزێکی ئایینی، هەر میللەتێکیش -بەپێی شۆ- واز لەم هێزە بهێنێت لە دەستی کەسانێکی نامەسئوولدا (...) ئەوا لە رووی سیاسەتەوە یان ئەزلە یان تا ئەو پەڕی شێتی شێتە[152].

لـەوە نـاچێت هیـچ لـەو مەترسیانە لـە کۆتـایی سـەدەی بیستەمی زاینییدا کـەم بوبێتەوە بەڵکو دەبێت چاوەڕێی گەورەبوونیان بکەین چونکە بەردەوام سامانەکان زیـاد دەبن و لەگەڵ ئەم زیاد بوونە ژمارەی سەرمایەدارە هەر گەورەکان کەمتر دەبێتەوە. هـەر یاسایەکیش دابنرێت بـۆ سـنووردانان لەبەردەم ئـەم هـێزەدا(ئەگـەر بتوانرێت یاسـای وا دابنرێت) تەنها مەرەکەبی سەر کاغەز دەبێت.

(لاسـکی) دەڵێــت کــە هــەر وەســیلەیەکی وەك(هــەڵبژاردن) و(ئیســتفتاء) و(دەستپێشخەری یان پێشنیار) و(مافی لابردن) ... بێ دەسەڵات دەمێننـەوە لەبـەردەم چڕبوونی موڵکایەتی و ناتوانێت سنووری بۆ دابنێت[153].

یەکێك لە سەرمایەدارانی ئەمــەریکا ئـەوەندە بـڕوای بـەخۆی هـەبوو کـە وتبـووی: گرنگ نییە دەسـەڵات لە دەستی کام حزب یان کام کەس بێت چونکە ئێمە نەسیاسین و نە بڕیاری کۆمەڵایەتین، ئێمـە دەوڵەمـەندین و ئەمـەریکا موڵکـی ئێمەیـەو لـە دەستماندایە، تەنها خـوداش دەزانێـت چۆن ئەمـە رووی دا بـەڵام نیازمانـە تـا بتوانـین ئـەم دەسـەڵات لەدەستی خۆماندا بهێڵینەوە[154].

---

[152] بێرنارد شۆ، البیمارستان السیاسی، ل ٣١.

[153] هـ. لاسكي، الديمقرطية الأمريكية، ل ٧١.

[154] دوايت ل. بۆلدوين، الديمقراطية لمل الأنسانية الأكبر، ل ١١٢.

## شەشەم — هێزەکانی راگەیاندن

هێزەکانی راگەیاندن مەرکەزێکی تری حوکمی کەمایەتین. دەزگاکانی راگەیاندن یان لە دەستی هێزەکانی تردان بەتایبەتی هێزە ئابوورییەکان، یان خاوەنی تایبەتییان هەیە کە راگەیاندن ئاکە، چالاکییانە یاخود چالاکیی سەرەکییانە.

نموونەکانی ئەم بەشەش هەڵدەگرین بۆ بەشی(ئازادیی)و لێرەدا تەنها ئەوەندە دەڵێین کەوا راگەیاندنی ئەمڕۆ چەند ئیمپراتۆرێکی هەیە کە ئیحتکار پیادە دەکەن. ئەم ئیمپراتۆرانە هەوڵ دەدەن راگەیاندن لەدەستی خۆیاندا کۆبێتەوەو لەمەدا دوو مەبەستیان هەیە:(قازانجی ماددی زۆر) و(دەسەلات).

ئەگەر بشزانین دەوری راگەیاندن چەند گەورەیەو بزانین کەوا ئەم دەزگایانە لە دەستی کەمایەتیدان ئەوکاتە بەئاسانی دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە هێزەکانی راگەیاندن هێزێکی تری کەمایەتینو بەدرۆ خستنەوەیەکی ترن بۆ دیموکراسیی کە گوایە حوکمی گەلە. راگەیاندن – وەك نووسەرێکی راگەیاندنی رۆژئاوایی دەڵێت– مەرج نییە چیتر خزمەتی دیموکراسیی بکات[١٥٥].

### دەسەلاتی راگەیاندنیش بە دوو جۆر دەبینرێت:

١– کارکردن لەسەر دەسەلاتداران و لەسەر هێزەکانی تری مەیدانەکە.

٢– کار کردن لەسەر جەماوەر.

بێ گومان ئەم دەزگایانە هەمیشە هەوڵ دەدەن بزانن جەماوەر حەز لە چی دەکات بۆ ئەوەی بڵاوی بکەنەوە یان پەخشی بکەن بەلام لە ناوەخنی ئەم رەچاو کردنەی ئارەزووی جەماوەر دەسەلاتی خۆیان دەسەپێنن و تەنانەت عەقڵی خەڵکەکەش دەسڕنەوە.

---

[١٥٥] بڕوانە: محمود المراغی. لە گۆڤاری العربی ی کوێتی. ژمارە ٤٤٥. کانوونی یەکەمی ١٩٩٥، ل ٥٩.

# چی لە حوکمی گەل دەمێنێتەوە؟

ئەمانە بوون هێزە سەرەکییەکانی کەمایەتی لەناو دیموکراسیی. درێژەشمان بەم بەشە؛(بەشی حوکمی کەمایەتی) دا چونکە لای ئێمە گرنگترین رووی دیموکراسییە بەڵکو جەوهەری هەموو حوکمێکیشە وپێکەوە لەگەڵ حوکمی تا کەسدا بەربڵاو ترین‌و درێژ خایەنترین جۆری حوکمن.

دەبێت رێزمان هەبێت بۆ ئەو یاسایەی کە جەوهەری نیزامەکانی حوکمە، ئەو یاسایەی کە هەرچەندە واقعییەو هەرچەندە کەسانێك هەبوون – راستەخۆ یان ناڕاستەخۆ– باسیان کردبوو بەڵام لەبەر نیفاق‌و ئیدیعای دیموکراسیی‌و ئازادیی .... پشت گوێ خراوە.

بۆچی دەسەڵاتداران ئەو راستییە پشت گوێ نەخەن کە ئەوەی هەیە حوکمی کەمایەتییە نەك حوکمی گەل؟ بەرژەوەندیی دەسەڵاتداران لەوەدا نییە کە جەماوەر بزانێت کە هەڵ خەڵەتاون‌و ئەوەی بە حوکمی گەلی دەزانن راستییەکەی حوکمی کەمایەتییە ... نەخێر.. هیچ کام لە دەسەڵاتدارەکان نایانەوێت ئەو راستییە بزانرێت.

(رەنی) دەڵێت کە هەندێك کەس موبالەغە دەکەن‌و دەڵێن کە نیزامە دیموکراتییەکان بریتین لە دیکتاتۆریەتێك کە لە رێگەی دەنگدانی گشتییەوە حوکم دەکەن[56]. ئێمەش دەڵێین؛ راستتر ئەوەیە بوترێت کە دیموکراسیی بریتییە لە حوکمی ئۆلیگارکیەت(حوکمی کەمایەتی) کە لە رێگەی دەنگدانی گشتی یەوە حوکم دەکات.

هەتا ئەگەر(حوکمی گەل) هەشبوبێت یان رۆژێك لە رۆژان هەبێت ئەمە حاڵەتێکی کاتییەو زوو حوکمی کەمایەتی یان حوکمی تاکە کەس سەرهەڵدەدات ئەو یاسایەی کە لە جیهانی سیاسەتدا فەرمانڕەوایە بریتییە لە یاسا داروینیەکە:((مانەوە بۆ بەهێز))

---

[56] کۆ. رونی، سیاسە الحکم، ج ٢، ل ١٦٥.

جەماوەریش بریتین لە توێـــەڵێکی بـیرو بۆچوونــی جیـاوازو نـا رێکخـراوو ئامـادەن بخڵەتێن(بەتایبەتی ئەگەر فاسد بن)و مەشغوولی ژیانی خۆیـانن... تـاد، بە کورتـی ئـەو شتانەیان تێدا نییـە کـە مایـەی هـێز بێت تـا((بمێننـەوە)) لـەکاتێکدا کەمایـەتی هـەموو مەرجەکانیان تێدایـە: کـەمن بۆیـە ڕیکخسـتنیان ئاسـانترە، ڕێکخسـتنەکەش هـێزێکی گەورەیە، هێزێکی ماددیشیان هەیە: دەسەڵات یان سامان، هێزێکی سێیەمیش: سیاسەت پیشەیانە ئەویش بەپێچەوانەیجەماوەر کە زیاتر سەرقاڵی پارە پەیدا کردن و کـات بردنـە سەرن، هێزێکی چوارەمیش: دەسەڵات مەبەستییانە... ئـەویش بە پێچەوانـەی هـاوڵاتی ئاسـایی کـە لەدەسـتی مەسئوولیەت رادەکـات ........ چەندی تریش لــە لایەنــەکانی بـەهێزی بژمێرین زیـاتر قەناعـەت دەکـەین کـە حوکم هـەر بۆ کەمایـەتی دەبێت، تاکـە هێزێکیش کە جەماوەر هەیەتی هێزی(ژمارە)یە بەڵام ئەمە تەنها بە رواڵەت هـێزە چونکـە نە جەماوەر ئەو جەماوەرە یەکە یەکـە لـە هـەموو شتێکدا یـەك ئامـانج و بـیرو بۆچوونـی هەبێت و نەدەتوانن ئەو ژمارە زۆرەیـان ڕێکبخـەن، پاشـان هەرچییـەك بکـەن(بـا شـۆڕش بێت) زوو کۆتایی پێ دەهێنرێت چونکە ئەگەر سەرەکردایەتییەکی پلەیەکیان نەبێت ئـەو نەفەسە درێژەیان نابێت، هەر شۆڕشێك یـان راپـەڕینێکیش تەنـها ((هـەڵچوون))ە ئەگـەر نەفەسـی درێـژی نـەبێت. ئـەو کاتانــەش شۆڕشــی جــەماوەری ســەرکەوتوو بــووە کــە سەرکردایەتی(= کەمایـەتی) پیشـەوایەتی شۆڕشـەکەی کــردووە یــان لــە حاڵــەتی زۆر کەمیشدا فەرمانڕەواکە کەشۆڕشەکە لەدژی بەرپاکراوە ئـەوەندە گـەمژەو ترسـنۆك بـووە کە هەر زوو رایکردووەو دەسەڵاتەکەی بەجێهێشتووە.

جارێکی تریش دەڵێین: ئەمە نە رەشبینییەو نە بە سـووکزانینی جەماوەرە بـەڵکو تەنها خوێندنەوەیـەکی واقعـە، ئـەو واقعـەی کـە خۆمـان دەخڵـەتێنین ئەگـەر خۆمـانی لێ لابدەینو لە جیاتی ئەوە باسی(حوکمی گەل) بکـەین ئێمـەش وەکـو ئیسـلامی یـەکێك لـە مەبەستە سەرەکییەکانمان فێرکردن و پەروەردە کردنی جەماوەرەو هیوامان گەورەیە بـە چاك کردنی و رزگار کردنی لە گەندەڵی تا بتوانێت دەوری خۆی ببینێت و ببێتە چـاودێرێك

بەسەر ئەو کۆمەڵگەیەی کە پێکی دەهێنێ‌و بەسەر حکومەتیش هەروەها ... ئەوەندە هەیە ئێمە خۆمان بە دروشمەکانی دیموکراسیی‌و سەروەری گەل‌و حوکمی گەل .... ناخڵەتێنین.

***

## بگەڕێینەوە سەر باسەکەی خۆمان:

یەکێك لە رەخنەکان لە(سەروەریی گەل) ئەوە بوو کە ئەم رێگە خۆش دەکات بۆ ئستبدادو ستەم کردن بەناوی گەلەوە، بەم پێیە پێویست بە زەمانێك دەکات دژی ئەم ناکامە.... ئەو زەمانەتەش(ئازادیی) یە. لە ئەسڵیشدا(ئازادیی) کەمایەتی لە دژی ستەمی زۆرینە دەپارێزێت، بەلام لەبەر ئەوەی بینیمان کەوا باسەکە باسی زۆرینە نییە بەڵکو باسی حوکمی کەمایەتییە. کەواتە ناچارین مەسەلەکە بۆ رۆژئاواییەکان راست بکەینەوەو ئازادیی بکەینە پارێزەری خەڵکەکە هەمووی دژی ئستبدادی کەمایەتی. سەیریش نییە ئەگەر مەسەلەیەك بۆ رۆژئاواییەکان راست بکەینەوە چونکە ئەوان زۆر شتیان بە هەڵەو گێڕاوی وەرگرتووە. کەواتە کاتی هاتووە بنەمای سەرەکیی دووەمی دیموکراسیی بخەینە ژێر لێکۆڵینەوە.

# بەشی چوارەم
# بنەمای ئازادییە گشتییەکان
# (ئازادییە فەردییەکان)

ئەم بنەمایە دووەم بنەمای سەرەکیی دیموکراسیی نوێ پێك دەهێنێت. ئەو ئازادیانە بریتین لە ئازادیی بیرو باوەڕو ئاین، ئازادیی خۆپێکخستن، ئازادیی رادەربڕین.... تاد. پێشتریش و لە باسی(دیموکراسیی راستەوخۆ) دا وتمان کە لە دیموکراسییە کۆنەکە ی یۆناندا ئازادییە فەردییەکان وجودیان نەبووە. وتمان کەوا دەوڵەت دەسەڵاتێکی رەهای هەبوو بەسەر تاکەکاندا، دەبوایە ئاینی دەوڵەت ئاینی ئەو تاکانە بوایە، موڵکایەتی حورمەتی نەدەپارێزرا بەڵکو هەرچی موڵکی کەسەکان هەبوو لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتدا بووو دەوڵەت دەیتوانی دەستیان بەسەردابگرێت.

بەلام هێشتا بەپاڵ ئەم نەبوونەی ئازادیی فەردی ئەوەندەی لە یۆناندا بانگەشەو باسی ئازادیی هەبوو کە لە هەموو شوێنو سەردەمێکی تر نەدەکرا. وەك وتمان مەبەست لە ئازادیی ئەوە بوو کە گەل ئازاد بێت و ستەمکاران حوکم نەکەن واتە ئەو ئازادییە بریتی بوو لە ئازادیی سەرجەمی گەل بەرامبەر بە حاکمەکان[157].

ئەم جۆرە ئازادییە کۆنەش گونجاوترین جۆری ئازادییە بۆ دیموکراسیی چونکە کرۆك وئەسڵی دیموکراسیی ئەوەیە کە سەروەریی بۆ گەل بێت و خواستی گەل(یان نەتەوە یان میللەت) لەسەرووی هەموو خواستەکاندا بێت، بەم شێوەیەش پێویستە

---

[157] لەبارەی ئەسڵی ئازادیی و نەبوونی ئازادییە فەردییەکان لە یۆناندا بڕوانە: H. Laski. Liberty. in: Encycl. of the SocialSciences. vol. 9. p. 442.

تاکەکان تەنها لە سنووری خواستەکانی گەلدا ئازادییان هەبێتو لەوە بەدەر ئازادییەکەی خۆیان لەدەست بدەن.

رێبازی دیموکراتی بۆ خۆی کەفالەتی ئازادیی تاکەکەسان ناکات، ئەو رێبازەش کە بانگەشە بۆ ئازادیی دەکات لە راستیدا رێبازی لیبرالییە کەلەسەر بناغەی رێزگرتن لە ئازادیی تاکە کەسەکاندا دامەزراوە.. بۆیە زۆر باسی ئەوە کراوە کەبنەمای یەکەمی دیموکراسیی(واتە سەروەریی گەل)و بنەمای ئازادییە گشتییەکان نارێکن بەیەکتر، وەکو دیگی Duguit ی یاساناسی فەرەنسیش دەڵێت: بۆ چوونێکی بەر بڵاوی هەڵە هەیە کە دیموکراسییو ئازادیی وەك منداڵی دوانەن و لێك جیانابنەوەو پێکەوە لەدایك بوون[158].

لەبەر ئەم نارێکییەو بۆ چارەسەرکردنی: هەندێك یاساناسی رۆژئاوایی پێنەیەکی ئەم عەیبەیان بەوە کردووە کە جیاوازی دەخەن نێوان نیزامی دیموکراتی(النظام الدیمقراطي)و رێبازی دیموکراتی(المذهب الدیمقراطي). لای ئەو کەسانە رێبازی دیموکراتی(واتە: فەلسەفەکە خۆی) مەرجی پاراستنی ئەو ئازادییانەی تێدا نییە لەکاتێکدا نیزامی دیموکراتی(واتە: چەسپاندنی فەلسەفەکە) رێز لەو ئازادییانەی دەگرێتو سنوور بۆ سەروەریی دەوڵەت دادەنێت[159]، لەبەر ئەوەش(دیگی) دەڵێت کەوا راست نییە رێبازی دیموکراتی هەمیشە رێبازێکی ئازادیخواز بێت. هەرئەم رێبازەش بوو کە هانی هەڵگرانی دا –بۆ نموونە(روسۆ) – کە دەسەڵاتێکی رەها بە دەوڵەت ببەخشنو تاکەکانی بۆ ملکەچ بکەن بێ مەرجو بێ سنوور. تەنانەت یاساناسێکی نوێی وەك ئیسماین Esmein کە زۆر دڵگەرم بوو بۆ بنەمای سەروەریی میللەت نەیتوانی نکوڵی لەوە بکات کە رێبازی دیموکراتی رێبازێکی ئازاد نیەو ئازادیی راستەقینە وجودی نییە تەنانەت لە نیزامێك کە لە بنەما دیموکراتییە کەوە هەڵقوڵابێت چونکە ئەنجومەنی گەل(کە

---

[158] دکتۆر عبد الحمید متولی، الوجیز في النظریات والأنظمة السیاسیة، ل ۱۵۹–۱٦۰ هەروەها پەراوێزی (۱) ل ۱٦۰.

[159] بڕوانە: دکتۆر محمد کامل لیلة، النظم السیاسیة، ل ٤۷۰ وشەی(پێنە)ش هی خۆمانە.

چەسپێنەری بنەمای سەروەریی گەلە) دەتوانێت دەسەڵاتەکان هەر لە دەستی خۆیدا بهێڵێتەوە[460]. بەم شێوەیە ئازادیی و چاولێپۆشین(تسامح) ... بەشێك نین لە کرۆکی دیموکراسییو چەندین نموونەی پێچەوانە هەیە کەوا ئۆتۆکراسی(حوکمی تاکە کەس) لە هەندێك باردا زیاتر لە دیموکراسیی ئازادیی دەپاراست[461].

ئا لێرەدا نموونەیەکی ترمان دەست دەکەوێت بۆ لاسایی کردنی کوێرانەی((دیموکراسییخوازان)) ی رۆژهەلات کە ئالای((دیموکراسییو ئازادیی)) پێکەوە بەرزکردنەوە بەلام زۆر کەمیان ئاگایان لەو ناکۆکییەی نێوان دوو وشەکە هەیە – ئەگەر ئەو کەمەش ئەسڵەن هەبێت.

هۆی پەیوەست کردنی ئازادیی بە دیموکراسییەوە دەگەرێتەوە بۆ بانگەشەکەی ئەوسا بۆ ئازادیی ئابووری، کە تاکە کەسان بتوانن چالاکیی ئابووری بە ئەنجام بهێنن بێ ئەوەی دەوڵەت رێگەیان لێ بگرێت، ئیتر وردە وردە دیموکراسیی ولتای لیبرالیەتی ئابووریی دەگەیاند، لە لایەکی تریشەوە ئازادیی تاکەکەسان بناغەی ئەو لیبرالیەتە بوو، بۆیە لە ئەنجامدا ئەم ئازادییە بووە پێوانە بۆ دیموکراسیی[462].

لەسەدەکانی رابردوودا باسێکی زۆری ئازادیی دەکرا، بۆ نموونە سەدەی(١٦) ی زایینی پڕی بوو لە موناقەشە لەبارەی مافی یاخی بوون ئەگەر فەرمانەکانی دەوڵەت لەگەڵ ویژدانی تاکەکاندا ناڕێك بن[463].

لیبرالیەت لەمیانەی کۆشش بۆ ئازادیی ئابووری پەیدا بوو، ئەوساش لیبرالیەکان لەسەر بناغەی فەلسەفەیەکی کۆمەلایەتی کاریان دەکردو کە ئەم فەلسەفەیە دەکرایە

---

[460] دکتۆر، طعیمة الجرف، نظریة الدولة، ل ٢٩٨–٢٩٩.

[461] دکتۆر البرت بدر، لە مستقبل الدیمقراطیة ومفاهیمها، ل٣٥١.

[462] ر. مەکئایڤەر، تکوین الدولة، ل ٢٢٤.

[463] H. Laski, Democracy, in; Encycl of the Social Sciences, vol. 5, p. 79.

بەرنامەی سیاسی بەلام لیبرالیەتی نوێو بە پێی فەیلە سووفی ئەمەریکی(جۆن دیووی) تەنها ئەوەیە تیۆرێکە بە شێوەیەکی تەمو مژاوی پێی دەوترێت((روانین بۆ پێشەوە)) بەبێ ئەوەی کە ئەم تیۆرە دڵنیا بێت لەو لای کە ملێ بۆ دەنێت"[16]. ئەم قسەی(دیووی) ش هی ساڵی(١٩٣٠) ە، بەلام لیبرالیەتی دوایی تر دووچاری کێشەی زیاتر بووو حزبە لیبرالیەکان لە جیهاندا پووکانەوە ئەویش لەبەر گۆڕانی سروشتی دەوڵەت. باسیشمان کرد کە دەوڵەتی ئەو سا دەوڵەتێك بوو خۆی دوورە پەرێز دەگرت لە خۆخنینە لەناو کارو باری کۆمەڵگەدا بەلام دوایی بوو بە دەوڵەتی(ئیجابی) کە بایەخ بەلایەنەکانی فێرکردنو تەندروستیو زمانەتی کۆمەلایەتی .... دەدات.

پاشەکشێ کردنی لیبرالیەتیش بەڵگەیەکی ترە لەسەر ناڕێکی نێوان ئازادییو دیموکراسیی. هەرچەندە ئەم ناڕێکییەش هەیە بەلام ئازادیی ئەمڕۆ لە جاران پێویستترە چونکە گەل لە جاران دوورترە لەیەك ڕێزیو یەك خواستی بەتایبەتی لەرۆژئاوادا، لە کۆمەڵگەیەکی پەرتەوازەشدا باس لە ئیرادەی گەل ناکرێت بەڵکو زیاتر باس لە ئازادیی کۆمەڵەکانو تاکە کەسەکان دەکرێت.

ئەم کێشەیەی ناڕێکی نێوان دیموکراسییو ئازادیی **کێشەی یەکەمی بنەمای ئازادییە گشتییەکانە** کەلە بەشەکانی پێشوودا چەند نموونەیەکیمان بینی(بۆ نموونە بڕوانە کۆسپی تۆیەم لەبەردەم حوکمی گەلدا).

## کێشەی دووەمی بنەماکەش کێشەی نێوان ئازادییو دەسەلاتە.

بەپێی جۆرج بیردۆ G. Burdeau ئەمڕۆ دوو کۆمەڵ هەن، یەکەمیان ئازادیی دەوێت، دووەمیشیان یاسای دەوێت. بەپێی بنەماکانی ساڵی ١٧٨٩(ساڵی شۆڕشی فەرەنسی) ئازادیی بیروباوەڕو کارکردنو ڕۆژنامەگەری... دران بەلام دابین کردنی ئەم ئازادییانە وا پێویست دەکەن کە دەوڵەت بەچەند کارێك هەڵسێت، ئەنجامی ئەمەش

---

[16] جۆن دیووی، للفردیة قدیما وحدیثا، ل ٥٨.

ئەوەیە دەوڵەت کۆنترۆڵ کردن و چاودێریی خۆی زیاد بکات و لە کاتی پێویستدا فشار بەکار بهێنێت، ئەنجامی ئەمەشیان نەفی کردنی ئازادییە لەلایەن دەوڵەتەوە[165].

(رۆسۆ) شتێکی وای دەربڕیبوو، لای(رۆسۆ) ئیرادەی گشتی(= ئیرادەی میللەت) بریتییە لە شتە باشە هاوبەشەکانی نێوان ئیرادەی تاکەکان[166] و پێویستە لە پێناوی ئیرادەی گشتیدا کەسەکان واز لە هەموو مافەکانی خۆیان بهێنن[167]، لە کاتێکدا یەعقوبیەکان(باڵی چەپڕەوی شۆڕشی فەرەنسی) کە شوێنی بیروباوەڕەکانی رۆسۆ کەوتبوون مافی ئەوەیان دابوو بە تاکەکان کە ئیرادەی گشتی دروست بکەن بەڵام پاش ئەم دروستکردنە ئەم ئیرادەیە دەبێت تاکەکان ملکەچی بن[168]. بەڵام لە ئینگلتەرادا دیموکراسییەکەی(جۆن ستیوارت مل) و(جۆن لۆک) کە زیاتر دیموکراسییەکی لیبراڵی بو بایەخێکی گەورەتری دەدا بە ئازادیی نەک بە نیزام[169].

لە کێشەی نێوان ئازادیی و دەسەڵاتدا دووەمیان زاڵ دەبێت. (لاسکی) دەڵێت کە ئەگەر ئازادیی مرۆڤ هەڕشە لە شێوازی ژیانی کۆمەڵگە بکات(ئەو شێوازەی کە خزمەتی ئەو کەسانە دەکات کە دەستیان گرتووە بەسەر دەوڵەتدا) ئەوا هەمیشە ئەم ئازادییە ئینکار دەکرێت، (لاسکی) دەڵێت: ئازادیی هەمیشە وەزیفەی دەسەڵاتە[170]. یان بەواتایەکی تر دەسەڵات چاوگی ئازادییەو لەهەر ململانەیەکدا چاوگەکە بڕیاردەدات ئازادییەکە ببەخشێت یان نەء.

---

[165] جۆرج بیردۆ، الدیمقراطیة.. ، ل ١١٠-١١١.

[166] بڕوانە جاك جاك روسۆ، فی العقد الاجتماعی، ل ٦٨.

[167] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٤٩.

[168] دکتۆر طعیمة الجرف، نظریة الدولة، ل ٥٠٥.

[169] ئێدوارد بێرنز، افكار فی صراع، ل ١٢.

[170] H. Laski, Leberty, Op. Cit. , p. 446.

## کێشەی سێیەم: کێشەی نێوان ئازادیی و نیزام:

کێشەی سەروو واتە نێوان(ئازادیی) و(دەسەلات) دەگەڕێتەوە بۆ کێشەی نێوان(ئازادیی)و (نیزام). ئازادیی تاکەکان هەموودەم ناگونجێت لەگەڵ پاراستنی نیزامی سیاسیو ئابووریو کۆمەلایەتی ...(لاسکی) مەبەستی سەرەکیی شارستانیی رۆژئاوا بە درێژایی(١٥٠) ساڵ – ئەمەشی لە چلەکاندا نووسی– بەوە دەسنیشان دەکات کە چۆن رێك بخرێت نێوان ئازادیی تاکەکان ونیزامی کۆمەلایەتی[٤٧١]. ئەگەر بڕوا بکەین یان نەکەین بەوەی کە ئەمە مەبەستە سەرەکییەکە بوو بێت ئەمە هیچ لەو راستییە ناگۆڕێت کە ئەم کێشەیە هەیە؛ ئازادیی گۆڕانکاری بەسەر ئەو نیزامەدا دەهێنێتو ئەو کاتە دەبێت یەکێك لە دوو شت هەڵبژێرێن، یان ئازادییەك کە سنووری کەمی هەبێت بەلام لە ئەنجامدا گوێ نەدرێتە ئاکامەکانی ئەم ئازادییە، یان پاراستنی نیزامو دانانی سنووری زۆر بەرامبەر ئازادیی.

(بێرتراند ڕەسڵ) کێشەکە دەخاتە ناو چوارچێوەیەکی فراوانترو باس لە کێشەی سەرەکیی سیاسەتو ئەخلاق دەکات کە رێکخستنە نێوان پێداویستییەکانی ژیانی کۆمەلایەتیو پێداویستییە زەرووریيەکانی تاکەکەسن[٤٧٢].

ئازادیی نەك هەر زیان بە دیموکراسیی دەگەیەنێت بەڵکو زیانەکەی هەروا باڵ دەکێشێت بۆ قەوارەی سیاسیی وڵاتەکەو لە ترسی ئەمە هەندێك دیموکراسییخواز هەن بڕوایان وایە کە(زۆرینە) مافی ئەوەی هەیە خۆی فەرز بکات بەسەر کەمایەتی بەلام ئەمە دەرگا دەکاتەوە لەبەردەم ئستبدادا[٤٧٣].

---

[٤٧١] هـ. لاسکی، حقوق الانسان،ل ا.

[٤٧٢] ب. ڕەسڵ، الفلسفة والسياسة، ل ٨.

[٤٧٣] دكتۆر ملحم قربان، له مستقبل الديمقراطية ومفاهيمها، ل١٢٥–١٢٦.

نارێکی نێوان(ئازادیی) لەلایەك و(دەسەڵات) و(نیزام) لەلایەکی تر کێشەیەکی وڵاتە گەورەو بچووکەکانە بەڵام زیاتر وڵاتە بچووکەکان بە دەستییەوە گرفتار بوون چونکە ئەگەر رژێمی حوکم بیەوێت سیاسەتێکی سەربەخۆ پیادە بکات یان نیزامی کۆمەڵایەتی یان ئایینی ... بپارێزێت دەبێت ئەو رژێمە حساب بۆ وەڵاتە گەورە نەیارەکانی بکات کە هەوڵ دەدەن فەشەل بەم ئامانجەی بهێنن ئەویش لە رێگەی هاندان و کۆمەك کردنی نەیارەکانی ناو وڵاتەکە(حزبەکان، کەمایەتییە نەتەوەیی و ئاینییەکان، .... تاد)، رژێمەکەش لە وەڵامی ئەم هاندانەش جووڵاندنەش سنوورەکانی ئازادیی زۆرتر و تەسکتر دەکاتەوە هەتا ئەگەر بۆ خۆی رێز لە ئازادی بگرێت و نرخی بزانێت.

بەچاك زانینی(ئازادیی) یان(نیزام) ...... بەشێکە لە بۆ چوونێکی فراوانتر لەبارەی ئازادییەوە جیاوازیی بیرورا لە بارەی ئازادییەوە دەگەڕێتەوە بۆ شێوەی تێگەیشتن و مامەلەکردن لەگەڵ بیرۆکەی ئازادیی خۆی. لەکۆن و نوێشدا هەر کەسێك لایەنێکی مەسەلەکەی بە((باشتر)) زانیوە. ڤۆلتێرو دیدێرۆ Diderot داوایان دەکرد تاکەکان بپارێزرێن لە کاتێکدا مۆنتسیکو داوای نیزامێکی دەستووری دەکرد، مابلی Mably ومۆریللی Morelly ش لەلایەکی ترەوە بیریان لە یوتۆپیا(شوێن یان نیزامێکی نموونەیی) ی کۆمۆنیست دەکردەوە[١٧١]، (روسۆ)و یەعقووبییەکانیش ئیرادەی گشتییان زاڵ کردبوو بەسەر ئیرادەی تاکەکاندا. ئەمەش بەمەرجێك هەموو ئەمانە لەیەك سەردەمدا ژیا بوون(سەدەی ١٨ی زایینی)و لە یەك وڵاتدا(فەرەنسا).

ئەمەش دەمانگەیێنێتە **کێشەی چوارەم کە لە بارەی وشەو واتای ئازادیی خۆی.** ئازادیی بۆ خۆی وشەیەکی زۆر تەمومژاوییە ئەویش چونکە کەسانێکی زۆر باسیان کردووە، هەر یەکێکیش لە روانگەی خۆیەوە، هەر سەردەمێکیش و بەواتایەکی تایبەت. وەکو هەموو جارێکیش نموونەکان ئەمانەن بۆ روونتر دەکەنەوە:

---

[١٧١] H. Laski, Democracy, Op. Cit., p. 80.

لەماوەی دوایەمینی سەدەی(١٦) ی زایینی ئازادیی لە فەرەنسا داو ەر لە هەموو شتێك بریتی بوو لە توانای هاولاتیان لەپەرەستنی خودا، هەریەك بەپێی شێو زی تایبەتی خۆی، لە سەدەی(١٧)و لە ئینگلتەرادا ئازادیی بریتی بوو لە نەمانی ئەو سەردەمەی کە پاشا بتوانێت باج بە ئارەزوو بسەپێنێت[١٧٥]. جا ئەگەر بزانین کەو' فەرەنسای سەدەی(١٦) جەنگی ئایینی بەخۆیەوە دیبوو(نێوان مەزهەبەکانی نەصرانیەت)و ئینگلتەرای سەدەی(١٧) خۆسەپاندنی پادشای تووش ببوو... بەئاسانی دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە بۆتە راستییەك ئەویش کە ناوەڕۆکی ئازادیی بەپێی کاتو شوێن دەگۆڕێت لەبەر ئەوە زەحمەتە ولتای ئازادیی دەستنیشان بکرێت[١٧٦]. وتراویشە کە هێڵە گشتییەکانی ئازادیی ناگۆڕێن لە کاتێکدا ناوەڕۆکە تایبەتییەکەی بە گۆڕانی کاتو شوێن دەگۆڕێت[١٧٧]. بۆ نموونە رەنگە داواکردنی ئازادیی لەسەردەمێکدا لە رووی داواکردنی چاوپۆشینی ئایینییەوە دەربکەوێت و لەسەردەمێکی تردا لە رووی بەخشینی مانی دەنگدان[١٧٨]. پاش گەشەسەندنی چینی کرێکارانیش(ئەمەش نموونەیەکی ترە) ململانە بۆ ئازادیی لەمەیدانی سیاسییەوە گوێزرایەوە بۆ مەیدانی مافە ئابوورییەکان[١٧٩]. نموونەیەکی تریش دەهێنینەوە کە ئازادیی جنسییەو کەلای زۆر کەس یەکێکە لە ئازادییەکان لە کاتێکدا لای(روسۆ) شەهوەت بۆ خۆی بەتەنیا کۆیلێتییە[١٨](نەك ئازادیی).

---

[475] هـ. لاسکی، اصول السیاسة، ج١، ل ١٦٣.

[476] H. Laski. Liberty. Op. Cit.. p. 444.

[477] تەنها وەکو نموونە بڕوانە: H. Laski.Ibid.Ann Van Wynen Thomas.The Semantics of international Law.p. 55.

[478] H. Laski. Ibid.

[479] Ibid. p. 445.

[480] روسۆ، في العقد الاجتماعي،ل ٥٦.

كەواتە لێرەدا كێشەی پێناسەكردنی ئازادیمان هەیە. ئەگەر بشمانەوێت وەكو هەموو پێناسەیەكی تر سنوورەكانی ئازادیێ بكەینە بەشێك لە پێناسەی ئازادیی ئەوا كێشەیەكی تر سەرهەڵدەدات ئەویش زانینی سنوورەكانی ئازادیی.

فەیلەسووفە كۆنەكانی دیموكراسیی و ئازادیی(وەك دكتۆر ملحم قربان دەڵێت) لەو باوەڕەدا بوون كە سنوور بۆ ئازادیی هەیە بەڵام زەحمەت لەوەدایە كە ئەم سنوورانە دەستنیشان بكرێن، یەكێكیش لەو دەستنیشانكردنانە ئەوەیە كە ئازادیی تاكەكەس لەو شوێنەدا كۆتایی پێ دێت كە ئازادیی كەسێكی تر دەست پێ دەكات، یاخود ئەو كەسە ئازادە مادەم ئازاری كەسی تر نادات بەڵام (قسەكەش هەر هی دكتۆر ملحمە) ئەمە دەستنیشانكردنێكی كەمو كورتو ئەمومژاوییە چونكە شتێكی فلانە كەس كە نابێتە مایەی ئازاردانی فلانە كەسی دووەم رەنگە فلانە كەسی سێیەم ئازار بدات، یان رەنگە ئەو شتەی كە فلانە كەس لە كاتو بارێكی دیاریكراودا ئازار نادات لەكاتو بارێكی تردا ئازاری بدات[181].

یەكێك لەو شتانەی كە وشەی ئازادیی لە واقعیەت دوور دەخەنەوەو دەیخەنە جیهانی خەیاڵ ئەوەیە كە بە شێوەیەكی رەها(مطلق) وشەكە تەفسیرو پێناسە بكرێت بۆیە(وەك دكتۆر الحبابی دەڵێت) ئەگەر لەرەهاكردن دووربكەوینەوە وشەكە واتایەكی واقعیی دەست دەكەوێت، واتە نالێین(ئازادیی هەیە) بەڵكو دەڵێین(ئازادیی فلانە شت هەیە) و(ئازادیی فیسارە شت هەیە)، بەڵام لەگەڵ ئەم واقعیكردنەی وشەكە نارێكی سەرهەڵدەدات چونكە بەم حسابە(قەید) مان دا بۆ ئازادیی، كە واتە ئازادیی بەر لەهەموو شتێك بریتییە لەقەید دانان[182].

## كێشەی پێنجەم بریتییە لە بنەما سەرەكییەكانی ئازادیی.

لێرەشدا هەروا بیرو بۆ چوونی جیا جیا هەیە.

---

[181] دكتۆر ملحم قربان، لە مستقبل الديمقراطية ومفاهيمها،ل ١٣١-١٣٢.

[182] دكتۆر محمد عزيز الحبابي. لە سەرچاوەی سەرەوە، ل ١٥٣.

(مەکنایڤەر) دەڵێت کەوا پێویستە ئازادیی کارکردن دژی حکومەت هەروەها ئازادیی بیرو ڕا هەبن(کە ئەمەیان هەڵبژاردن دەری دەبڕێت)و ئەم دوو ئازادییە بڕیار دەدەن لەسەر هەڵبژاردنی حکومەت‌و ئاراستە گشتییەکەی سیاسەت.. ئەمەش بریتییە لە ئازادیی دیموکراتی کە حکومەت دادەمەزرێنرێت‌و هەروەها لادەبرێت ... هەموو ئازادییەکانی تریش لەم دوو ئازادییەوە وەرگیراون[183].

دەستنیشانکردنێکی تری بناغەی ئازادیی ئەوەیە: ئەو کەسانەی کە یاسا بەسەریاندا دەسەپێنرێت بتوانن ئەو یاسایە بگۆڕن ئەویش بەوەی کە مافی رەخنەگرتن‌و مافی شکات کردنیان هەبێت[184].

(لاسکی) ش لەبارەی هەڵبژاردنی حاکمەکان دەڵێت کە بۆ ئەوەی هاوڵاتیان بتوانن بە باشی ئەمە بکەن پێویستە ئازادیی رادەربڕینیان هەبێت هەروەها ئازادیی کۆبوونەوەو دامەزراندنی حزب‌و نەقابەکان[185] کە ئەمەش دەستنیشانکردنێکی کلاسیکییە بۆ ئازادیی، لەبەر هەمێکی تریشیدا دەڵێت کەوا ئازادیی سیاسی ئەوەیە کە هاوڵاتی قسەی بڕوات لە کارو باری دەوڵەتدا[186]و دەڵێت ئەو کاتە ئازادیم کە لەپچە کرلونابێت کە بتوانم دەست بگرم بەسەر حوکمدا[187].

لەبابەتی(هێزە ئابوورییەکان) لە(حوکمی کەمایەتیدا)، قسەی(هاملتون) مان هێناوە کە تا ئازادیی هەبێت نا یەکسانی هەیە، (لورد ئەکتون) یش هەروەها دەڵێت کە یەکسانی‌و ئازادیی دوو شتی دژ بەیەکن بەڵام (لاسکی) بە پێچەوانەوە(یەکسانی) دەکاتە

---

[183] مەکنایڤەر، تکوین الدولة، ل ٢٥٠.

[184] سیریڵ جۆد، الحریة فی القرن العشرین، ل ١٨١.

[185] هـ. لاسکی، حقوق الانسان، ل ٣.

[186] هـ. لاسکی، اصول السیاسة،ج ١، ل ١١.

[187] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٢٦-٢٧، لەبارەی ئازادییەوە بڕوانە کتێبەکەی تری: الدولة فی النظریة والتطبیق، ل ٦٤ بەدواوە.

چەمكێكی ئەساسی لە ئازادیی‌و دەڵێت كەوا بەبێ یەكسانی ئازادیی وجوودی نییە، واتە لای ئەو یەكسانی بنەمایەكی سەرەكیی ئازادییە[188].

كەواتە دەپرسین: پاش ئەم بیروڕایانە ... چی سەرەكییەو چی لاوەكییە لە ئازادیی ؟.

**كێشەی شەشەمی ئازادیی**؛ پەیوەندی بەوانەی پێشووەوە هەیە بەتایبەتی پێناسەی ئازادیی‌و بنەماكانی. كێشەكە **پێوانەیە**: ئایا پێوانە چییە بۆ ئەوەی بزانین چی ئازادییەو كێ ئازادەو ئازادیی لە كوێدا هەیە... ؟.

نموونەیەك لەسەر پێوانە ئازادیی ڕۆژنامەگەرییە: ئایا خەڵك دەتوانن حەزیان لە چی بێت بیڵێن‌و لەبارەی هەركەسێكەوە بتوانن شت بڵاو بكەنەوە؟ ئەگەر ئەمە بێت ئەو كاتە ئازادیی ڕۆژنامەگەری یەكسانە بە پشێوی. بەڵام ئەگەر حكومەت چاودێری ڕۆژنامەگەری بكات ئەو كاتە ئازادیی ڕۆژنامەگەری دەكەوێتە ژێر ڕەحمەتی حاكمەكان، كەواتە پێوانەكە یان(خواستی ڕۆژنامەگەرانە) یان(خواستی حكومەتە)[189]. ئاشكرایە ناتوانین هیچ لەم دوو پێوانەیە هەڵبژێرین.

بەهەمان شێوەش ناگەینە ئەنجام ئەگەر باسی ئەو هێند(=كمية) ەی ئازادیی كە پێویستە بدرێت؛(بێرتراند ڕەسڵ) ی زاناو فەیلەسووف‌و لایەنگری تا ئەوپەڕی ئازادیی دەڵێت كە ئازادییەكی كەم دەبێتە مایەی سستی‌و ئازادییەكی یەكجار زۆریش پشێوی بە ئەنجام دەهێنێت بۆیە مەسەلەی ئازادیی لای ئەو وەكو هەموو مەسەلەیەكی ترە واتە مەسەلەی هێند(كمية) ە[190]. دیارە(ڕەسڵ) وەكو زانایەكی(ماتماتیك) بایەخێكی گەورە

---

[188] H. Laski, Liberty, Op. Cit., p. 445.

[189] دكتۆر محمد علي الحبابي، لە مستقبل الديمقراطية، ل ١٥٤-١٥٦.

[190] ب. ڕەسڵ، السلطة والفرد، ل ٦٢.

دەدات بە هێند[١٩١]، بەڵام بە بڕوای ئێمە مەسەلەکە هەر هێند نییە بەڵکو هەروەها مەسەلەی(جۆر) ە، لە جیهانی ماددەدا بایەخ بە(هێند) دەدرێت بەڵام لە جیهانی مرۆڤدا(جۆر) هەروەها بایەخی خۆی هەیە. نموونە لەسەر ئەوە ئاکامەکانی ئازادیی جنسی، نموونەیەکی تر ئەو ئازادییە جنسییە خۆی لەوانەیە کەسێك بڕوای بەوە هەبێت کە ڕێ بدرێت بە هێندێکی کەمی ئازادیی جنسی بەڵام ئێمە دەڵێین کەوا ئەو هێندە کەمە تەشەنە دەکاتو وەك حاڵی ئەمڕۆی ڕۆژئاوا بەکەمی نامێنێتەوە، کەواتە(هێند) ش هەروەها پێوانە نییە.

**کێشەی حەوتەمیش:** کە دەبێت بەلایەنی کەمەوە وەڵامی هەبێت ئەگەر چارەسەریشی بەدی نەکرێت ئەویش ئایا بنەمای ئازادیی ڕێگەمان پێ دەدات بنەمای ئازادیی خۆی ڕەفز بکەین ؟ یان هیچ نەبێت ئازادیی ڕێگەمان پێ دەدات توندوو تیژی دژی حکومەت(یان دژ بە هەر شتێکی تر) بەکار بهێنین؟.

(ڕەسڵ) بڕوای بە ئازادیی هەبوو بۆ بنیات نانی دیموکراسیی هەتا ئەگەر بشگاتە تیرۆرکردنو شۆڕشی توندوتیژ[١٩٢]. (لاسکی) ش بۆ چوونێکی وای هەبوو بەڵام (مەکنایڤەر) وەڵامی لاسکی بەوە داوەتەوە کە هاوڵاتی لە کۆمەڵگەی دیموکراتیدا داوای لێ دەکرێت کە بە ئارام بێت لەگەڵ دیموکراسییدا[١٩٣]. بەڵام ڕێگە نەدان بە شۆڕش قەیدە لەسەر ئازادیی، ئەو کاتەش دەبێت بزانین بە پێی چ پێوانەیەك ئەم قەیدە ڕەوایەو بۆچی پێویستە هاوڵاتی((لەگەڵ دیموکراسییدا بە ئارام بێت)).

---

[١٩١] بڕوانە بۆ ئەمە کۆڕێکی ڕەسڵ کە لەو نامیلکەیەدا کە بە ناونیشانی الفلسفة والسیاسة وەرگێڕدراوە.

[١٩٢] بڕوانە، ئێدوارد بێرنز، افکار فی صراع، ل ٨٠.

[١٩٣] ر. مەکنایڤەر، تکوین الدولة، ل ٢٤٩.

# سنوورەکانی ئازادیی

کێشەی هەرە گەورەی ئازادیی لە بواری چەسپاندندایە، واتە کاتێك ئازادیی مامەڵە لەگەڵ واقعدا دەکات.

لە دیموکراسیی هەر وەك لە دیکتاتۆریەتدا چەند ئازادییەك هەیە، ئەم ئازادییانەش چەند سنووریکیان هەیە.

یەکێکیش لە جیاوازییەکانی نێوان دیموکراسیی و غەیری دیموکراسیی(بە دیکتاتۆریەتەوە) ئەوەیە کە ئەوەی لێرەدا رێگەی پێ دەدرێت لە وێدا رێگەی لێ دەگیرێت و بە پێچەوانەوە.

لە دیکتاتۆریەتدا مرۆڤ ئازادیی نییە رەخنە لە دیکتاتۆرەکە بگرێت یاخود ئازادیی ئەوەی هەیە بەڵام ئەگەر بیەوێت ئەم ئازادییە پیادە بکات پێویستە((نرخەکەی بدات))، کوشتن بێت یان بەند کردن... بەڵام لە دیموکراسییدا ئازادیی رەخنەگرتن لە فەرمانڕەوایان هەیە.

ئەمە یەك رووی مەسەلەکەیە چونکە مرۆڤ رەخنە لە تەنها فەرمانڕەوایان ناگرێت. ئەگەر مرۆڤیش رەخنەی گرت لە یەکێك لە مەرکەزە بە هێزەکانی کۆمەڵگە، بۆ نموونە رەخنەی لە کارەکانی جولەکە گرت(ئەمەش لە وڵاتێکی رۆژئاوادا) پێویستە ئامادە بێت((نرخی)) ئەم رەخنەیە بدات کە هێرشی سەخت و گەمارۆدان و وێنە ناشیرین کردنە...

پرسیارە گرنگەکەش لێرەدا ئەوەیە: ئایا ئازادیی لە رۆژئاوای دیموکراتدا هەر وەکو ئازادیی لە دیکتاتۆریەتدا ئازادییەکی سنوورداره یان مەسەلەکە تەنها چەند پێشێلکردنێکی کەمە و هیچی تر ؟

ئەگەر مەسەلە پێشێلکردنی کەم و(خروقات) ە. ئەوا کێشەیەکمان نییە و پێویست ناکات لەم بارەیەوە بدوێین بەڵام ئەگەر وەڵامەکەی تر بێت ئەوا حاڵەتی ئازادیی

سنووردارمان هەیە کە جیاوازییەکەی لە ئازادیی لەسایەی دیکتاتۆریەتدا تەنها جیاوازی رادەو سنوورە ... ئەمەشیان وەڵامە راستەکەیە.

ئێستاش با سنوورەکانی ئازادیی لە رۆژئاوادا بناسین تا بگەینە ئەنجام:

## سنووری یەکەم – تەوژمی کۆمەڵگەو سنوورەکانی:

کۆمەڵگە ژمارەیەك بیروباوەڕو دابونەریتو شتی باوی هەیە کە بۆ خۆیان تەوژم(تیار) ێك پێك دەهێننو تاکەکانی کۆمەڵگە ناچار دەکەن لەگەڵ ئەو تەژمەدا بڕۆنو بەپێچەوانەی مەلە نەکەن. هەر کەسێکیش دژ بە تەوژمەکە مەلە بکات دەبێت کۆششی زۆر بکاتو لە ئەنجام یان ئەوەیە ئەوەندە ماندوو دەبێتو ناچار دەبێت کۆڵ بداتو تەوژمەکە لەگەڵ خۆیدا ببیات، یان ئەوەشە گۆشە گیر دەبێتو بێ هیوایی رووی تێ بکات. لە کاتێکدا ئەنجامی سێیەم واتە سەرکەوتنو بەدی هێنانی گۆڕانکاری بەدەگمەن نەبێت روونادات. ئەم حاڵەتە سێیەمیش بەزۆری لە کاتێکدایە کە کۆمەڵگە ئامادەیە بگۆڕێت یان رووەو گۆڕان چووبێت بەڵام ئەم حاڵەتە دیسان حاڵەتی((تەوژمە))، واتە تەوژمێك هەیەو بەرێوەیە کە تەوژمی گۆڕانە، ئەمەش بارودۆخ بۆ ئەو کەسە ساز دەکات بۆ کارە گۆڕانکارییەکەی.

تەوژمی کۆمەڵگە بەربەستێکە لەبەردەم ئازادیی تاکەکاندلو لەهەمان کاتدا دیاردەیەکی((دیموکراتییە)) چونکە دیاردەیەکە لەناو گەلدا هەیە، بەواتایەکی تر تەوژمی کۆمەڵگە بەڵگەیەکی ترە لەسەر ناڕێکی نێوان دیموکراسیو ئازادیی.

(لاسکی) باسی مرۆڤ دەکات کە چۆن خۆی لەگەڵ کەشو هەوایەکدا دەگونجێنێتو لایەنێکی ژیانی ئەو مرۆڤە نییە(مەگەر چۆنەها) باسا کۆمەڵایەتیەکان رەنگی نەکەن ئەگەر بەتەواویش نەبێت ئەوا بەلای کەمەوە بە شێوەیەکی(جزئی)[494]. لەلایەکی ترەوە لۆرد ئەکتۆن دەڵێت کە دیموکراسیی فەردییەتی تێکشکاند، ئەو

---

[494] H. Laski, Liberty, Op. Cit., p. 445.

فەردیەتەی کە کرۆکــی راســتەقینەی ئــازادیی بــوو ئــەویش بــەهۆی گــەڕان بــەدوای هاوجووتیدا[١٩٥] واتە کاتێك مرۆڤ دەبــەوێت نوســخەیەکی تــر بێـت لــەوانی تــرو فەردیــەتی خۆی لەدەست دەداتو بەمە ئازادیی خۆی دەدۆڕێنێت.

کەش‌و هەوای کۆمەڵایەتی‌و ڕێککــەوتنی خــەڵك لەســەر مەســەلەیەك مــرۆڤ ناچـار دەکەن واز لە قەناعەتەکەی خــۆی بهێنێت ئەگــەر ئــەو قەناعەتــە پێچەوانــەی رای خــەڵك بێت، مرۆڤەکە لێرەدا لەوە دەترسێت کە وەکو(شاذ) بێتە بەرچاویان[١٩٦]. لێکۆڵینــەوەش هــەن کــە بــاس لــە ترســی مــرۆڤ دەکــەن لــەوەی کــە هاوڕێکــانی ئــەو مرۆڤــە وەکــو کابرایەکی(سەیر) یان(ناماقووڵ) تەماشای بکەن[١٩٧]. دیارە ئەنجامی ئەم ترســەش ملکــەچ کردنە بۆ تەوژم‌و خۆ گونجاندن لە گەڵیدا... ئەمە چارەسەرێکی((دیموکراتییــە)) چونکــە رەچاوی((سەروەریی گەل)) دەکات بەڵام لەهەمان کاتدا چارەسەرێکی دژ بە ئازادییە.

دیاردەی تــرس لــە تــەوژم لــە رۆژئــاواو غــەیری رۆژئــاوادا بڵاوەو بـــە زەقـــی لـــە ئەمەریکادا بەدی دەکرێت. لەم بارەیەوە فەیلەسووفی ئەمەریکی(جۆرج سانتیانا) دەڵێت: هەموو شتێك لە ئەمەریکادا بەزۆرەملێیە، ئەگەر واش نەکەیت دەبێت وەکو کابرایکی خــۆ فرۆش یان(منبوذ) هەست بکەیت[١٩٨]. (لیلینثاڵ) کە ئەم قسەیەی (سانتیانا) دەهێنێتــەوە دەڵێت کەوا خەڵك زۆر گوێ دەدەنە ئەو شتەی کە لەناو خەڵکدا دەوترێت[١٩٩]، واتــە گــوێ دەدەنە قسەی خەڵك، ئەمــەش ئــازادیی کەلەپچکــە دەکــات، لــە کتێبێکــی ســاڵی(١٩٦٤) یشــدا(لیلینثــاڵ) بــاس مروڤــی ئەمــەریکی دەکــات کــە چــۆن نــاتوانێت لەبــەردەم تــەوژم‌و لەبەردەم جــەماوەردا بوەســتێت لەبــەر ئــەوە((کــەم وڵات هەیــە وەك ئەمــەریکا کــە

---

[495] Ibid.

[١٩٦] نقولا حداد، الديمقراطية سيرها ومصيرها، ل ١٠٠.

[١٩٧] ئۆستن رەنی، سياسة الحكم، ج ١، ل ٣٣١.

[١٩٨] (ئەلفرید لیلینثاڵ) هێناویەتی لە: هكذا يضيع الشرق الاوسط، ل ٢٢٠.

[١٩٩] سەرچاوەی سەرەوە، ل٢٢١.

خەڵکەکەیان لە ژێر سەرکەوت کردندا دەژین))[٥٠٠]، پاشان دەڵێت کەوا ترس‌و حەزکردن بە هاوجۆری(واتە: مروڤ وەکو خەڵك بێت) ئەمەریکایان کردە وڵاتێکی((مەڕنشین)) – واتە خەڵکەکە بوونەتە مەڕ– ماوەیەکی زۆر بەر لە ساڵی(١٩٨٤)[٥٠١].

لەلایەکی ترەوە(شپینگلەر) (١٨٨٠–١٩٣٦) ی رەخنەگر لە دیموکراسیی دەیوت کەوا دیکتاتۆرییەت هەردوو یەکێتی سۆڤیەت‌و ئەمەریکا حوکم دەکات چونکە جیاوازی نییە نێوان دیکتاتۆرێك کە حزب بێت‌و دیکتاتۆرێك کە کۆمەڵگەکە خۆی بێت[٥٠٢].

لەهەموو کۆمەڵگەیەکدا پێویستە مرۆڤ رەچاوی دەورووبەری خۆی بکات هەتا ئەگەر ئەو کۆمەڵگەیە نوقمی ئەفسانەش بێت (سۆڤی)ی فەرەنسی باسی ئەو مرۆڤە دەکات کە بەعەقڵ کاردەکات‌و ئەفسانەکان تێك دەشکێنێت‌و دەڵێت کە خەڵکەکە بە خێسەوە تەماشای دەکەن ئیتر لەهەر بوارێکدا ئەفسانەکان بشکێنێت: لە بواری زانستە سروشتییەکان بێت(فیزیا، کیمیا... تاد) یان لە بواری وەهمەکانی تێڕوانینی کۆمەڵایەتی یان هەر بوارێکی تر[٥٠٣]، بۆیە ئەو مرۆڤە لە پێناوی سومعەی خۆیدا ئەوەی پێ باشترە کە لەگەڵ هەڵەکانی گەلدا رێك بکەوێت نەك هەر خۆی راست بێت‌و کۆمەڵگە هەڵە بێت[٥٠٤]...

ئەوزمی کۆمەڵگەو سنوورەکانی چەند دیاردەو رواڵەتێکیان هەیە کە ئەوانەی خوارەوە هەندێکیانە:

١– داب‌و نەریت: لایەنێکی بە هێزیئەوزمەکەیە. داب ونەریت لە هەموو کۆمەڵگەو نیزامی کۆمەڵایەتی‌و سیاسیدا هەیە.

---

[٥٠٠] ئەلفرید لیلینتاڵ، اسرائیل ذلك الدولار الزائف، ل ١٣٤.

[٥٠١] سەرچاوەی سەرەوە، ل ١٣٥، مەبەستی لە رۆمانەکەی (جۆرج ئۆروێل) ١٩٠٢–١٩٥٠ کە ساڵ (١٩٤٨) نووسیویەتی‌و پێشبینی دەکات مرۆڤ لە (١٩٨٤) ئازادی لەدەست بدات‌و ببێتە کۆیلە.

[٥٠٢] ئیدوارد بێرنز، افکار فی صراع، ل ٢١٨.

[٥٠٣] ئەلفرید سۆڤی، الرأی العام، ل ٣٥.

[٥٠٤] سەرچاوەی سەرەوە. ، ل ١٢٠.

٣–خواستی یەك بوون: كۆمەڵگە بەربەست دادەنێت لەبەردەم هەر كەسێك یەك ریزی بخاتە مەترسی.

٣– ئاین: لایەنێكی بەهێزی تری كۆمەڵگەیە. لە ئەمەریكادا، بۆ نموونە، كەس خۆی بۆ هەڵبژاردنەكان ناپاڵێوێت لەسەر ئەساسی ئەوەی كە بێ باوەڕە چونكە هیچ كەسێكی وا ناتوانێت سەربكەوێت[505].

٤– بیروباوەڕی باو: هەر بیرو باوەڕێك چەند هەڵە یاخود ئەفسانەییش بێت نرخی تایبەتی خۆی هەیە ئەگەر لەناو خەڵكدا باو بێت.

٥– بەرژەوەندییە ماددییەكان: كۆمەڵگە وەك چۆن سنوور دادەنێت بۆ دەست وەردان لە داب و نەریت و ئاین ... هەروەها دژی ئەوانە یە كە بەرژەوەندییە ماددییەكانی بخەنە مەترسی.

بەكورتی كۆمەڵگە چەند بنەمایەكی هەیەو هەر كەسێك دوژمنایەتی خۆی دژ بەو بنەمایانە پیشان بدات دەبێت ئامادەی ململانە بێت و تا بنەماكە بەنرختر بێت لای خەڵك تا كاردانەوەیان بەرامبەر بەو كەسە گەورەتر دەبێت تا دەگاتە حاڵەتێك كە ئەو كەسە بە((دوژمنی گەل)) بزانرێت.

چاوڵێ پۆشینی كۆمەڵگەش لەو شتانەدا هەیە كە نرخێكی ئەوتۆیان نییە، چاوڵێپۆشین(تسامح) ی كۆمەڵگەش وەك(لاسكی) دەڵێت لەو كاتەدا یە كە كەس دژی ئەو بنەمایانە نەوەستێت كە كۆمەڵگە لەسەریان دامەزراوە[506].

## سنووری دووەم: تەوژمی تایبەت:

سنووری پێشوو تەوژمێك بوو كە كۆمەڵگە یان بەشێكی گەورەی كۆمەڵگەی دەگرتەوە. ئەم سنوورە دووەمەش تایبەتە بە بەرژەوەندی یان بۆ چوونێكی ناو كۆمەڵگە كە ژمارەیەك خەڵك هەڵیان گرتووە. بەهێزی ئەو بۆچوونەش لەوەدایە كە ژمارەی ئەو كەسانە زۆر بن یان ئەوەیە ژمارەیان زۆر نییە بەڵام مەكانەتی تایبەتییان هەیە. بۆ نموونە بەر لە هەرەس هێنانی كۆمۆنیزم بنەماكانی سۆشیالیزم باویان بوو زۆر لە

---

[505] بروانە: هـ. لاسكي، الديمقراطية الامريكية، ل ٢٧.

[506] H. Laski, Liberty, Op. Cit., p. 445.

سیاسییەکان و ڕۆشنبیران لە تۆمەتی(سەرمایەداری) و(بورجوازیەت) دەترسان، لە لایەکی ترەوە(کۆمۆنیزم)یش بۆ خوێ تۆمەتێك بوو کە هەندێك کەسی دەترساندو ڕێگەی ئەوەی لێ دەگرتن کە بیروبۆچوونی خۆیان دەربڕن ئەگەر بۆنی سۆشیالیزمی لێ بهاتایە. ئەمڕۆش زۆر کەس ناوێرن بیروبۆچوونی تایبەتی دەربڕن ئەگەر نارێك بێت بەو((مۆدەیە)) ی کە پێی دەوترێت((ئازادیی و مافی ئافرەتان)) نەوەکو بە((کۆنە پەرست)) ناوبنرێت.

ئەم تەوژمە بەکورتی نێشوویەك سەرچاوەیەتی و سەرانسەری کۆمەڵگە ناگرێتەوە، بۆیە مرۆڤ رای خۆی دەرنابڕێت لەناو کۆمەڵ و جەوێکی بەناو((ڕۆشنبیر)) دا ئەگەر بۆنی((کۆنە پەرستی)) ی لێ بکرێت بەڵام هەمان ئەو رایە لەناو کۆمەڵێکی(شەعبی) یان(عەشایر) بێ ترس – بەڵکو بە شانازیشەوە – دەڵێت بەم شێوەیە ئەم تەوژمە تایبەتەش سنوورێکی تر بۆ ئازادیی دادەنێت ئەگەر چیش لە سنووری یەکەم بچووکترە.

## سنووری سێیەمی ئازادیی —هێزە سیاسییەکان:

مرۆڤ بەئاسانی بە رواڵەت دەخەڵەتێ وەك فرە حزبیی و رەخنە گرتن لە حکومەت و وا دەزانێت کە ئەمە نیشانەی ئازادیی تەواوەتییە و ئاگاداری ئەو راستییە نییە کە هێزە سیاسییەکان بەرژەوەندیی زۆریان هەیەو هەندێك لەو بەرژەوەندیيانە قودسیەتیان هەیە. هێزە سیاسییەکانیش هەر حکومەت و حزبەکان نین بەڵکو هێزی تری شاردراوەن.

## سنووری چوارەمی ئازادیی — هێزە ئابوورییەکان:

ئەمانەشمان لە شوێنی خۆیاندا باس کردبووو زانیمان چەند بەتوانان. ئازادیش لە ئاستی ئەم هێزانەدا دەسەوەستان دەبێت چونکە بەرژەوەندیی ئەو هێزانە ئەوەندە پیرۆزە لایان کە ئامادەن –وەك باسمان کرد– ئەگەر پێویست بکات لەم پێناوەدا سەرجەم نیزامی دیموکراتی هەرەس پێ بهێنن.

# ئازادیی لە مەیداندا

وەك ئەنكیدێك لەسەر هەموو باسەكانی سەرەوە چەند نموونەیەك لەسەر ئازادیی لە رۆژئاوادا دەهێنینەوە تا بزانین كەوا كێشەی ئازادیی لەوێدا كێشەی(خروقات)و پێشێلكردنی جاروبار نییە.

## یەكەم — رۆژئاوا بە شێوەیەكی گشتی

## ئازادیی بۆ كێیە؟

هەر لەسەرەتاوە هەوڵی بەدەست هێنانی ئازادیی هەوڵی كۆمەڵە كەسێك بوو بەتەنیا. بانگخوازێكی دیموكراسییو ئازادیی دەڵێت: لە رۆژئاوادا پیاوە سیاسییەكان سەرەتا هاواری ئازادییان لێ هەڵسابوو، بەر لەتەواو بوونی سەدەی نۆزدەش زۆربەی سیاسییەكان ئەو ئازادییان دەست كەوتو ئینجا وایان بڕوا بوو كە زیانیان پێ دەگات ئەگەر كەسێك غەیری خۆیان ئازادییەكی گەورەتری دەست بكەوێت[٥٠٧].

ئەنجامی بانگەشە بۆ ئازادیی بڵاوبوونی ئازادیی نەبوو بەڵكو وەك(رەسڵ) دەڵێت: لە رۆژئاوادا قەیدو نیزامێكی توندو پروپاگندەی چەواشەكەری زۆر هەن كە لەوە زۆرترن كە خەڵك دەیانزانێت، دەشڵێت كەوا ئیعتیراف بەوە نەكراوە كە ئەم قەیدانە جیاوازی نێوان رۆژئاواو رۆژهەڵات كەم دەكەنەوە، داواكارییەكی رۆژئاواش كە ناوی ((جیهانی ئازاد))ی لێ بنرێت شتێكە مایەی گاڵتە پێ كردنە[٥٠٨].

(جۆد) وەك دیفاعكەرێكی ئازادیی لە سییەكانی ئەم سەدەیەدا باسی ئەوەی كردووە كە بە پێی راپۆرتی رەسمی ئازاردان لە بەندیخانەكانی وڵاتە ((شارستانییەكان))

---

[٥٠٧] د. بیرنز، الدیمقراطیة، ل ٢٨.

[٥٠٨] ب. رەسڵ، هل للأنسان مستقبل، ل ٥٧.

زۆرتر بووەو دەڵێت بێ گومان وڵاتێکی((شارستانی)) دان بەوەدا نانێت کە ئازاری بەندکراوان دەدات، پاشان دەڵێت کەوا خراپەکاری لە جیانی ئەوەی نەمێنێت رووەو زیادبوون دەچێت[509].

ئایا ئەمڕۆ ئازاردان چەند ماوە؟ بێ گومان ئەو وڵاتانەوەسیلەی((مۆدێرن)) یان هەیە، لە هەموو حاڵەتێکیشدا وڵاتێکی((شارستانی)) -وەك جۆد وتبووی- دان بە شتی وانانێت.

لەبەر ئەوەو تا بتوانین حوکم بدەین لەسەر هەبوون یان نەبوونی ئازادیی پێویستە ئاگامان لەحاڵەتە شارددراوەکان بێت، هەروەها ئەگەر ئازادیی ببینین پێویستە هۆکەی بزانین، رەنگە هۆکەی شتێکە غەیری رێزگرتن لە بنەمای ئازادیی وەك چۆن رۆژئاواییەك لەبارەی ئازادیی ئایینی لە رۆژئاوادا دەڵێت کەوا گومانی تێدا نییە کە رۆژئاواییەکان لەجاران سنگ فراوانترن بەرامبەر بە ئایین بەڵام ئەمە لەبەر بنەمای چاو لێپۆشین(تسامح) نییە بەڵکو لەبەر ئەوەی کە کەم ئەرخەمن لەبارەی مەسەلە گەورەکانی ئەصرانیەت[510].

ئەمەش بۆ خۆی رابەرێکە بۆ حوکم دان لەسەر سنوورەکانی ئازادیی: بزانە چی باوەڕو چی رێزی هەیەو چی خاوەن قودسیەتەو بزانە ئازادیی هەیە لە رەخنە گرتن لێی ... ئەو کاتە دەزانیت ئازادیی هەیە یان نا...

ئەوەش کە ئێمە بەچاو لێپۆشینی دەزانین لە راستیدا چەسپاندنی ئەو قسە باوەیە کە بۆتە یاسایەکی کۆمەڵایەتی وسیاسی((ئەمە پەیوەندی بە منەوە نییە)) This is not my business. ئەمەش سەرچەم خەڵکەکە دەگرێتەوە بەڵام هەروەها سیاسەتمەدارانیش تا رادەیەك دەگرێتەوە.

کەواتە مەسەلەکە چاو لێپۆشین و خۆشویستنی ئازادیی نییە بەڵکو سلبیەتە، هەر کاتێکیش خەڵکەکە یان سیاسەتمەداران هەڵوێستێك وەربگرن وەزعەکە دەگۆڕێت، وەك

---

[509] سیریل جۆد، الحریە فی القرن العشرین، ل ١٥.

[510] بڕوانە سەرچاوەی سەرەوە، ل ٧-٨.

چۆن بۆ نموونه ئەمڕۆ لەزۆر لە وڵاتانی رۆژئاوادا هەڵوێستێکی دوژمنانە بەرامبەر حیجابی ئافرەتی موسڵمان هەیەو ئافرەتی موحەجەبە دووچار نارەحەتی زۆر دەبێت لە کاتێکدا ئاساییە ئەگەر(راهبە) گاورەکان خۆیان بپۆشن

## دووەم -ئازادیی لە ئەمەریکا

ئەوسا ئەمەریکا بەخۆی دەوت ((پێشەوای جیهانی ئازاد)) ئەویش بەرامبەر جیهانی نا ئازاد کە وڵاتە کۆمۆنیستەکانی دەگرتەوە، هەروەها ئەو وڵاتانەی کە دیکتاتۆریەت حوکمیان دەکردن(هەرچەندە بەشی زۆریان دار دەستی ئەو پێشەوایەی ئازادیی بوون !).

باسی ئەوەشمان کرد کە تەوژمی دابو نەریت وشتی باو ... تاد لە ئەمەریکادا هێزێکی تۆقێنەرەو پێویست ناکات لێرەدا ئەوانە دووبارە بکەینەوە. تۆقاندن جگە لەم ئاستە، لەسەر ئاستی رەسمیدا هەبووە، ساڵی(١٩١٩)و بەهۆی ترسی سیاسییەکانو سەرمایەداران لە کۆمۆنیزم ئەمەریکا سەردەمێکی تۆقاندنی بەخۆیەوە بینی. هەزاران کەس گیرانو ئازاردران، نموونەی زۆریش هەن لەسەر ئەو ئازار دانە نموونەیەکیشیان لێدانی بەندکراوێك لەبەر چاوی ژنەکەیو لێدانی ژنەکەی لەبەر چاوی خۆیدا، ژووری بەندکراوێکی تریشیان گەرم کردبوو، بۆ ئەوەی بە گەرمایی ئازار بچێژێت، (٨٠٠) پیاو ئافرەت لەیەك داڵاندا بەند کرانو بەهەموویان یەك تاوالێتیان هەبوو. لەبەر ئەم تۆقاندنو ئازار دانەش هەندێکیان توانای خۆراگرتنیان نەبووو خۆیان کوشت.... رۆژنامەکانیش هەموویان چەپڵەیان لێ دەدا بۆ ئەم هەڵمەتە[511]. تۆقاندن گەیشتە ئەو رادەیەی کە لە هەندێك ویلایەتدا بۆینباغی سوور قەدەغە بکرێت[512](چونکە هێمای کۆمۆنیستەکانە).

---

[511] بڕوانە: ئەلبێرت کان، الخیانةالعظمی، ج ١، ل٣٢ بەدواوە.

[512] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٦٤.

سالی(١٩٤٨) یش هەڵمەتێکی تر کرا و(١٢) ئەندامی گـەورەی حزبـی کۆمۆنیسـتی ئەمەریکی گیران، قازییەکان هەڕەشەی سزایان دەکرد تەنانـەت لـە پارێزەرەکـانیش ... لەگەڵ ئەوەشدا رۆژنامەگەریی ئەمەریکا دەمۆڵی لێ دەدا بۆ ((ئازادیی لە ئەمـەریکا)) کـە لـە سـایەی ئـەم ئازادییـەدا هـەموو کەسـێك بتوانێـت لەبـەردەم دادگـادا عەدالـەت وەربگرێت"[٥١٣]

سالی(١٩٥٥) ش یاسەیەك دەرچوو کە سزای کەس نەدرێت ئەگەر ئەندامی حزبـی کۆمۆنیست بێت بەڵام هەموو مافـە یاسـاییەکانی لێ دەسـەندرێن وەکو:رێگـە نـەدان بـەو حزبە بەشداری بکات لە خۆپاڵاوتن لە هەڵبژاردنەکاندا یان رێگـە نـادرێت حزبەکـەی پـەنا بەرێتە بەر دادگا"[٥١٤]

لەسەردەمی تۆقاندنی پاش جەنگی دووەمی جیهانی تاقیکردنـەوەی(ولاء) هـەبوو کە بەپێی بڕیاری سالی(١٩٤٧) ی سەرۆك(ترومان) دەبوایە هەر فەرمانبـەرێکی حکومـەت لێی بپرسرێتەوە لەبارەی دڵسۆزی بۆ حکومـەت ئـەویش لەلایـەن(لیژنـەی چـالاکی دژ بـە ئەمەریکا) ... لێپرسینەوەکان سەردەمێکی تۆقاندنیان دامەزراندن‌و تۆقاندن گەشـتبووە رادەیەك کە هەر کەسێك بیویستایە رزگاری بێت لە دوژمنێکی خۆی ئەوەندەی بەس بـوو کە خەبەر بدات بە نووسینگەی تۆژینەوەی فیدرالی F.B.I. و بڵێت کە ژنـی دوژمنەکـەی فڵانە کتێب یان رۆژنامەی خوێندۆتەوە یان رەشپێستێکی بانگ کردبوو بۆ ماڵی خـۆی... ئەو دۆژمنە ئیتر لەناو دەچێت چونکە دوای ئەوە هەتا ئەگەر لـە بەندیخانـەش دەربچێت

---

[٥١٣] بڕوانە سەرچاوەی سەرەوە، ج٣، ل ١٩٢ بۆ داد گاییەکانیش بڕوانە هەمان سەرچاوە ل ١٧٥-١٩٣.

[٥١٤] ئۆستن رەنی، سیاسة الحکم، ج١، ل ١٨٤. بەریتانیاش ئیجرائـاتی وای کردبـوو هەرچـەندە لەوانـەی ئەمەریکا کەمتر بوون (ل ١٨٧ بە دواوە).

خەڵك لێی دەترسن‌و خۆیان لێ دوور دەخەنەوە[515] (بەلایەنی کەمەوە بۆ ئەوەی خۆشیان نەبنە جێگەی گومان‌و تووش بین)، ئەم حاڵەتەش پاڵی بەهەندێك لەمانەوە نا کەخۆیان بکوژن[516].

سنووردانان لەبەردەم نەیارانی سەرمایەداری گەشتە ئەوەی کە نیجرائیکی دەستووری لە(نیویۆرك) دا بەجێ بهێنرێت هەرچەندە پێشتر بەکار نەهاتبوو. بەپێی دەستووری ئەمەریکی هەر یەکێك لەدوو ئەنجومەنەکە دەتوانێت بە ۳/۲ ی دەنگەکان ئەندامێکی ئەنجومەنەکە لابەرێت، لە نیسانی ساڵی(۱۹۲۹) شدا ئەنجومەنی نوێنەرانی(نیویۆرك) پێنج ئەندامی هەڵبژێردراوی رەفز کرد هەرچەندە هەموو پێداویستییە دەستوورییەکانیشیان هەبوو ئەویش چونکە سۆشیالیست بوون، پاشان‌و لە ئەیلولی ئەو ساڵە هەڵبژاردنێکی تایبەت کراو هەر پێنج کەسەکە هەڵبژێردرانەوە ئەمجارەش سێ کەسیان رەفزکران[517].

وەنەبێت ژمارەی کۆمۆنیستەکان‌و سۆشیالیستەکان زۆر بوو بێت تا دەسەڵاتدارانی ئەمەریکا لەشۆرشی ئەوان یان هیچ نەبێت لە کودێتا بترسن، چونکە بەپێی سەرژمێری ساڵی(۱۹۱۹) هەر سێ حزبی سۆشیالیست‌و کۆمۆنیست‌و کۆمۆنیستی کرێکاری(۸۰) هەزار تا(۱۰۰) هەزار کەس بوون واتە لەسەرجەمی مرۆڤە(باڵغ)ەکانی ئەمەریکا ئەوان تەنها لە هەزاردا یەك بوون[518].

---

[515] ئەلبێرت کان، الخیانة العظمی، ج۲، ل ٦٩-۷۰ ئەمەش لەزاری پارێزەرێکی ئەو فەرمانبەرانە، لەبارەی ئەوەو بۆ نموونەی تر بڕوانە هەمان سەرچاوە، ل ٥٢ بەدواوە.

[516] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٨٥(پەراوێز).

[517] W. J. Shepard, Legislative Assemblies, History and Theory, Op. Cit. ,p. 358. دیارە کە بڕگەکەی دەستووری ئەمەریکی لە دەستووری(نیویۆرك) یشدا هەبووە.

[518] ئە. کان، الخیانة العظمی.

ماوەی تۆقاندنی پاش جەنگی دووەمی جیهانی بەزۆری بەناوی سەردەمی(مەکارثیەت) ناسراوە ئەویش بەهۆی سیناتۆر(ئەندامی ئەنجومەنی پیران) جۆزیف مەکارثی McCarthyیەوە کە لە ۱۹٥۰–تا ۱۹٥٤ سەرۆکی هەڵمەتی تۆقاندنەکە بوو مەکارثی پاش پیادە کردنی تۆقاندن دەسەڵاتەکانی لێ سەندرانەوە ... ئایا لەبەر ئەوەی کە ئازادییەکانی پێشێل کردبوو ؟ نەخێر بەڵکو لەبەر ئەوەی دژ بە یاسایەکی نەنووسراوی ئەنجومەنی پیران کاری کرد، یاساکە سنوور بۆ رەفتاری سیناتۆرەکان دادەنێت بە تایبەتی رەفتارەکانیان بەرامبەر هاوڕێکانیان لە ئەنجومەنەکەدا[٥١٩]، یان بە واتایەکی مەکارثی لە سنوور دەرچوو بوو، غەیری ئەو لە سنوور دەرچوونە کارێکی رەوا بوو... بەهەر حاڵ مەکارثی کاری خۆی کرد، کاتێکیش هات کە لە کار بخرێت بێ ئەوەی سوپاسی خزمەتکانی بۆ سەر مایەداری و نیزامی حوکمی ئەمەریکا بکرێت. وتیشمان کە ساڵی(۱۹٥٥). – ساڵێك پاش لابردنی مەکارثی –ئەو یاسایە دەرچوو کە مافی سیاسی لە حزبی کۆمۆنیست قەدەغە دەکات، مەکارثی نەما بەڵام پێویست بوو مەکارثییەت بمێنێتەوە هەتا ئەگەر بە شێوەیەکی کەمتر بێت.

پێشێلکردنی ئازادیی تەنها کۆمۆنیستەکانی نەدەگرتەوە بەڵکو هەروەها (حزبی پێشکەوتنخواز) کە هنری والاس(جێگری کۆنی سەرۆکی ئەمەریکی) سەرۆکی بوو بێ بەش نەبوو لە هەڵمەتی تۆقاندن. ئەم حزبە کە حزبی سێیەمی ئەمەریکا بوو لە هەڵمەتی هەڵبژاردنەکانی(۱۹٤۸) دا بەشداری کردبوو بەڵام هێرش کرایە سەر کۆبوونەوەکانی و رێگەیان لێ گیراو هەندێك سەرکردەی دەرکەوتووی حزبەکە گیران، لەهەندێك ویلایەتیشدا رێگە نەدرا بە حزبەکە لە هەڵبژاردنەکاندا بەشداری بکات، هەموو ئەمانەش بە بیانووی ئەوەی حزبەکە سەر بە یەکێتی سۆڤیەت بوو[٥٢٠]. ئەم کارانەو چەندینی تریش وایان لە

[٥١٩] رِفو، سیاسة الحکم. ج ۲، ل ۱۱۹.
[٥٢٠] کان، الخیانة العصمی. ج ۳، ل ۹۷ بەدواوە.

ڕۆژنامەیەکی ئەمەریکیی ئەو سەردەمەی کرد بڵێت: ئەمڕۆ لە ئەمەریکادا لە سەردەمێکی ترس و تۆقین دا دەژین".[521]

ئەگەر باسی کرێکارانی ئەمەریکاش بکەین توندوتیژی سەرمایەداران بەڕوونی دەبینین. مانگرتنی کرێکاران بەو پەڕی توندو تیژی کۆتاییان پێ دەهێنرا، تەنانەت کاتی خۆی بازرگانیەك هەبوو بەناوی(بازرگانی کۆتایی هێنان بەمانگرتن) کە پیاوی دڕندەی بۆ بەکرێ دەگیرا، لەوانە (بێرگۆف) ناوێك بوو کە بە ((پاشای تێکدەرانی مانگرتن)) ناسرابووو لە ساڵی(١٩٠٧) تا(١٩٣٥) خاوەن کارگەکان بەکرێ دەیانگرت. بێرگۆف پیاوە دڕندەکانی خۆی دەنارد بۆ لێدانی کرێکارە مانگرتووەکان، ئەوانیش بەم کارە هەڵدەستان و تاڵانییان دەکردو بریندارو کوژراویان لەپاش خۆیاندا بەجێ دەهێشت. پێشتریش(بێرگۆف) ((٢٥٠٠)) تفەنگی هەبووو ئەوەندەی تریش تێڵا، پاشان گازی فرمێسك رژێنی بەکار دەهێنا. ئەم کابرایە پاش ئەوەی ئەم لەم کارەدا ساڵانەی بردە سەر برایە بەردەم دادگا چونکە ... دەبێت لەبەر چی بێت ؟ چونکە پیاوەکانی خۆی شکاتیان کردبوو کە مووچەکانیان وەرنەگرتووە. دادگاش مەدحی ئەم کابرایە کرد کە ئەوەندە لە کاری خۆی لێزانەو ئاوا خزمەتی کۆمپانیا گەورەکان دەکات".[522]

ئەو ساڵەی کە بێرگۆف نووسینگەکەی داخست نزیکی(٢٠٠) نووسینگە لە جۆری تر هەبوون. ئەم نووسینگانە کاری سیخوڕییان لە مەیدانی پیشەسازیدا دەکرد، ئەویش بۆ خزمەتی کۆمپانیاکان، مەبەستەکەشیان بەپێی ڕۆژنامەیەکی ئەمەریکی((تێکشکاندنی نەقابەکان و نەهێشتنیان)) بوو".[523]

لەبارەی ئازادیشەوە لە بواری پەروەردەو فێر کردن ئەو ڕاستییە هەیە کە لە ئەمەریکادا دەبێت مامۆستای زانکۆ هەندێك تایبەتیی هەبێت. مامۆستایەك کە خاوەن

---

[521] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٨٤. لەوەش دەچێت ڕۆژنامەکە چەپڕەو بووبێت.

[522] بڕوانە سەرچاوەی سەرەوە، ج ٢، ل ٣٢–٤٨.

[523] سەرچاوەی سەرەوە، ج٢، ل ٥١، بۆ ئەم نووسینگانە بڕوانە ل ٤٩–٥٨.

بیرو باوەڕی رادیکاڵی بێت ڕێگەی پێ نادرێت وانە بڵێتــەوە... لەبەر ئـەوەش زەحمەتـە رادیکالییەت رای خۆی دەربرێت لەهەر بابەتێك کە ئیحتماله مافەکانی مۆڵکایـەتی بخاتـە مەترسی[524].

ئەو ئابووریناسانەش کە بایەخ بە فەلسەفەی غەیری فەلسەفەی خاوەن پرۆژەکان دەدەن درەنگتر لە پلەدا بەرز دەکرێنەوە بـەڵکو بـەبێ شـەرمیش دەردەکرێـن. سـەرۆکی زانکۆش بۆ خـۆی(کـە پـارە کۆدەکاتـەوە لـە دەوڵەمـەندەکان بـۆ زانکۆکـەی) ڕێگـە لـەو کەسانە دەگرێت کە بـیرو بـاوەڕی پـڕ((مەترسـی)) یـان هەیـە کـە ببنـە مامۆسـتا[525]... بەکورتیو بەپێی(لاسکی) لە پێناوی کۆمەکی دەوڵەمەندەکان ئازادیی ئەکادیمی دەکرێتە قوربانی[526]. هەموو قسەکانی سەرەوەش هی(هارۆڵد لاسکی)ی بە بەریتانین کە وانەی لـە زانکۆکـانی ئەمـەریکادا وتبـوو، هـەر خۆشـی باسـی زانکـۆی(مۆنتانـا) ی کـردووە کـە مامۆستایەکی دەرکردبوو چونکە سەلماندبووی کەوا کۆمپانیا گـەورەکانی مس بۆ چەند سـاڵێکی زۆر خۆیـان لـــە ئیلتزامـــاتی دارایـــی دزیبووەوە[527]. هـــەروەها باســـی زانکۆی(تێکساس) دەکـات کـە سـێ مامۆسـتای ئـابووریی دەرکردبـوو لەبـەر ئـەوەی رای خۆیان دەربڕی لەبارەی ماوەی کارکردنی مەدەنییەکان لە کارگە جەنگییەکاندا[528].

(لاسـکی) هـەروەها لـەزاری(گۆڤـاری زانکۆیـی ئەمـەریکی) دەڵێـت کـە خـاوەن کارەکان ئـەو مامۆسـتایانەی زانکۆیـان دەردەکـرد کـە تۆمـەتی بیروباوەڕی رادیکالییـان خرابـووە پـاڵ[529]، مەبەسـتی ئـەو خـاوەن کارانـە لـە(رادیکالییـەکان) ئەوانـەی کـەبیرو

---

[524] هـ. لاسکی، الدیمقراطیة الامریکیة، ل ٢٧.

[525] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٢٢٤.

[526] هـ. لاسکی، اصول السیاسة، ج٤، ل ١١٩.

[527] هـ. لاسکی، الدیمقراطیة الامریکیة، ل ٢٧.

[528] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٢٣٦-٢٣٧.

[529] هـ. لاسکی، الدولة في النظرية والتطبيق، ل ٢١٦.

بۆچوونەکانیان لەهەر مەسەلەیەکی گرنگدا ریک نەبێت لەگەڵ بیروباوەڕی(ژووری بازرگانیی ئەمەریکا) و(یەکێتی نیشتمانی پیشەسازان)[٥٣٠].

جگە لە(لاسکی)، (بێرتراند ڕەسڵ) یش هەروا وانەی لە زانکۆکانی ئەمەریکادا دەوتەوەو چەند جارێك عەقدی دەرس وتنەوەکەیان هەڵوەشانەوە[٥٣١]، بەمەرجێك ڕەسڵ بیرو باوەڕی سۆشیالیستی نەبوو.

(ڕەسڵ) باسی لیژنەی(ئاسایشی ناوەوە) ی ئەنجوومەنی پیران دەکات کە چۆن تۆمەتی کۆمۆنیزمی خستە پاڵ(بزوتنەوەی زایان) کە دژی جەنگو پشبڕکێی چەکداریی ئەتۆمی وەستابوونو لەم بارەیەوە دەڵێت کە ئەو لیژنەیە دەسەڵاتێکی گەورەی هەیە بۆ سەرکوت کردن[٥٣٢].

***

لە ئەمەریکادا حەساسیەتێکی گەورە هەیە بەرامبەر رەخنە، بۆ نموونە(لیدەرەر) دەڵێت کەوا ئەو کەسانەی کە گومانی خۆیان لەبارەی رەفتاری ئەمەریکا بەرامبەر بە وڵاتی(چین) ی کۆمۆنیست دەردەبڕن تۆمەتی مەیل بۆ کۆمۆنیزم دەخرێتەپاڵیان[٥٣٣]؛ بەڵکو هەر رەخنەیەکی ئەمەریکیش لە سیاسەتی ئەمەریکا لە وڵاتانی دەرەوەدا تووش هێرش دەبێتو نموونەی ئەو رۆژنامە نووسە دەهێنێتەوە کە لەبارەی گەندەڵی لە ڤێتنامی باشووری ئەوسای سەریەئەمەریکا شتی نووسیبووو کە بە هۆی ئەو رەخنەیە ئەوەندەی نەمابوو سزا بدرێت[٥٣٤].

---

[٥٣٠] هـ. لاسکی،الدیمقراطیة الأمریکیة، ل ٢٠٧.

[٥٣١] ب. ڕەسڵ، هل للأنسان مستقبل، ل ١٧(قسەکە هی وەرگێڕی کتێبەکەیە).

[٥٣٢] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٨٤-٨٥.

[٥٣٣] ولیام لیدەرەر، أمة من غنم، ل ٥٧.

[٥٣٤] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٩٨.

حەساسیەتی ئەمەریکا بەرامبەر بەرەخنە بە بڕوامان دەگەڕێتەوە بۆ سروشتێکی ئەمەریکی ئەویش کە سەرۆکی پێشوو(جۆن کێنێدی) لە کتێبەکەیدا وەکو یەکەم جۆرە فشار باسی کردبووو کە بریتیە لەو جۆرەی((کەجەماوەر بە دەگمەن نەبێت تێبینی ناکات ئەویش ئەوەیە کە ئەمەریکییەکان دەیانەوێت لای خەڵك خۆشەویست بن))[٥٣٥]. ئەمەش هەردوو لایەن دەگرێتەوە، لایەنی ناوەوەی وڵات کە هەر مرۆڤێك حەز دەکات لە لایەن هاوڵاتییانی ترەوە خۆشەویست بێت، لایەنی دەرەوەش کە ئەمەریکییەکان حەز دەکەن وەکو گەلێك لای گەلانی دیکە خۆشەویست بن، ئەم خواستەش دوو زیان بە ئازادیی دەگەیەنێت، زیانی یەکەم قوربانی دان بە راستیو راستگۆیی لە پێناوی خۆشەویستیی دەورویەر، زیانی دووەمیش بێ ئارامیو نەبوونی سنگ فراوانی بەرامبەر رەخنە.

نموونەکانی سەرەوە ئەو راستەیەمان بۆ ئاشکرا دەکەن کە ئەو ئازادییەی کە ئەمەریکا شانازیی پێوە دەکات بەرگەی ترس ناگرێت. لەگەڵ پەیدا بوونی ترسدا سەرکوت کردن سەرهەڵدەدات بەلام و نەبێت دەسەلاتداران هەوڵ بدەن ترس نەهێڵن بەڵکو بە پێچەوانەوە، باش هەرەسی کۆمۆنیزم دەسەلاتداران بەدوای((دوژمنێکی تر)) دا گەڕانو ئیسلامو ئیسلامییەکان بوونە پاڵێوراو بۆ ئەو هەڕەشەو مەترسییەی کە دەبێت هەمیشە وەکو شمشێر لەسەر ملی ئەمەریکییەکانو رۆژئاواییەکان بەگشتی بەرزکرابێتەوە تا دەسەلاتدارن بەردەوام چەکەکان زۆرترو پێشکەوتووتر بکەنو دەسەلاتی خۆیان بپارێزنو بۆ ئەوەی کارەگەکان هەمیشە بخرێنە گەڕ تا قازانجی سەرمایەداران بەردەوام بێتو تا بێ کاری زیاد نەکات...

وەك چۆنیش مێژووش خۆی دووبارە بکاتەوە، یان راستتر؛ دەسەلاتداران دووبارەی بکەنەوە، ئەوساو بەر لە هەڵمەتی یەکەمەکەی دژ بە کۆمۆنیستەکان چەند تەقینەوەیەك((روویان دا))[٥٣٦]، دوای ئەوەش بەهەشتا ساڵ تەقینەوەیەك لە

---

[٥٣٥] ئەلفرێد لیلینتاڵ هێناویەتی لە، اسرائیل ذلك الدولار الزائف، ل ٤١٠.

[٥٣٦] کان، الخیانة العظمی، ج ١، ل ٣١.

ئەمەریکادا((رووی دا))و نەیارێکی حکومەتی میسر(دکتۆر عمر عبد الرحمن) گیراو درایە دادگا گوایە دەستی هەیە لەو تەقینەوەیە[٥٢٧]. چیرۆکی فلیمەکە هەر چیرۆکە کۆنەکەیە بەڵام ئەمجارە ئەکتەرەکان گۆڕاون.

***

(لیلینتاڵ) باسی نەخۆشییەکی ئەمەریکیو رۆژئاوا دەکاتو دەڵێت کە ئەگەر شێوازی ژیانی رۆژئاوایی هەرەس بهێنێت ئەم نەخۆشییە هۆی هەرەس هێنانی دەبێت... لیلینتاڵ ئەم نەخۆشییە ناو دەنێت((نەخۆشیی ناولێنان))و دەڵێت: ناوی(ئازادیخواز) یان(فاشستی) یان(کۆنەپەرست) یان(کۆمۆنیست) بنێ لەهەر کەسێك کە بە دڵت نییە سەرکەوتنێکی گەورە بەدەست دەهێنێت ... ناوی(دیموکراتی) بنێ لەهەر میللەتێك، ئیدی شتە باشەکانو خراپەکانی ئەو میللەتە دەبێتە تاکە خەمی ئەو کەسانەی کە زانستو زانیاری ئیدیعا دەکەن[٥٢٨].

ئەمەش ئەمڕۆ بەروونی لەبارەی ئیسلامییەکانەوە دەیبینینو کە چۆن بە(توندڕەو) و(ئیرهابی) ناودەنرێن[٥٢٩]. ئەم ناولێنانەش جەوێکی ئیرهابی دروست دەکاتو رێگە لە دەربڕینی بیروڕادەگرێت چونکە ترس هەیە لەو ناوەی کە وەکو مۆر ئامادەیە، ئەنجامی ئەم ئیرهابەش بێ دەنگ کردنی نەیارانە هەروەها دوورخستنەوەی خەڵك لەو کەسەی کە ئەو تۆمەتەی خراوەتە پاڵ.

---

[٥٢٧] جگە لەم گەمەیەش شیخ عمر عبد الرحمن نەخۆش کەوتووە بە هۆی مامەڵەی خراپ؛ هەروەها رێگەیان لێ گرتبوو کە خواردنی ئیسلامی بخواتو گۆشتی بەرازیان بۆ دانابوو... تاد (رادیۆی لەندەن ١٩٩٧/١٠/١٥) ... ئەمەش لەو وڵاتەی کە پێشەوای ئازادییو مافی مرۆڤە.

[٥٢٨] ئە. لیلینتاڵ، هكذا يضيع الشرق الاوسط، ل ٢٢٢.

[٥٢٩] کۆمۆنیستەکانیش ناوی (کۆنە پەرست) یان بەکار دەهێنا (ئێستاش بەکاری دەهێنن) دژ بە ئیسلامییەکان هەتا پاش هەرەسی کۆمۆنیزمو دەرکەوتنی نەگونجانی لەگەڵ سەردەمدا واتا ئاشکرا بوونی (کۆنە پەرستیی) ی کۆمۆنستیەکانی ئەمڕۆ.

یەکێك لەو هێزانەی کە((ناولێنـان)) بـەکاردەهێنن رێکخراوەکـانی جوولەکەیـە کـە بەربەستێکی گـەورەن لەبـەردەم ئـازادیدا لـەو مەیدانـەی کـە پـەیوەندیی بـە جوولەکـەو ئیسرائیلەوە هەیەو تۆمەتی(دژ بەسامییەت) ئامادەیە لایان بۆ هەر رەخنەگرێك.

لەبابەتی(کۆمەڵەکانی فشار) دا چـەند نموونەیـەکمان هێنایـەوە لەسـەر کارەکـانی ئـەو رێکخراوانـەو لێرەدا چـەند نموونەیـەکی تـر دەخەینـە رووو دواییـش نموونـەیتر لـە وڵاتەکانی تری رۆژئاوا دەهێنینەوە.

لە ئەمەریکادا فیلمی(ئۆلیڤەر تویست) –کە لە رۆمانە ناودارەکەی(چارلز دیکنز) وەرگیراوە– رێگەی پێ نەدرا پیشان بدرێت چونکە کەسایەتییەکی قێزەونی جوولەکەی تێدایە[510].

لەم چەند ساڵەی دواییشدا ئەکتەری ناودار (مارلۆن براندۆ) رەخنەی لـە جوولەکـە گرتبوو کە دەستیان گرتووە بەسەر سینەمادلو وتبـووی: قولـە رەشـە دواکەوتووەکـەمان بینی(لـە فلیمەکاندا)و ئیتالییـە ساختەچییەکەو چینییـە نزمەکـەو ژاپۆنییـە چاوبارێکـە خەتەرناکەکە... بـەڵام قـەد جوولەکـەی ساختەچیمان نـەبینی چونکـە جوولەکـەن کـە فلیمـەکان دەهێننـە بەرهـەم... پـاش ئـەم قسـەیەی(براندۆ) ش رێکخراوێکـی جوولەکـە راگەیاند کە چـی مـاوە لـەژیانی ئـەو ئەکتـەرە بـۆی دەکاتـە دۆزەخ ئـەویش لـەپاش ئـەم هەڵمەتە ناچار بوو داوای لێبوردن بکات[511]. بەم شێوەیە ئازادیی رەخنەگرتنو قسـەکردن لـە ئاسـتی کـارە بـەدەکانی جوولەکـەدا پـەکی دەکـەوێت. ئـابێت رەخنـە بگریـت ئەگـەر ویستیشت ئازادیی رەخنە پیادە بکەیت پێویستە ئامادە بیت نرخی ئەم ئازادییە بدەیت.

---

[510] جۆن بیتی(؟) الستار الحدیدی حول امیرکا، ل ٦٠.

[511] گۆڤاری قضایا دولیة، ژمارە ٣٣٠، ٢٩/٤–٥/٥/١٩٩٦، ل٢٩.

(ليلينثال) دەڵێت کە ڕۆژنامەگەریی ئەمەریکا کە گۆڕانیی دەوت بەشانو باڵی ئازادییدا هەمیشە ئەم ئازادییە لەدەست دەدات کاتێك باسی کێشەی فەلەستینی دەکرد[٥٤٢].

لەبەرنامەیەکی تەلەفزیۆنیشدا چەند سەعیۆنییەك بیروبۆچوونی خۆیان بەدوورو درێژی باس دەکرد لەکاتێکدا دکتۆر(ئێلمەر بێرگەر) لە ڕێکخراوی(ئەنجوومەنی ئەمەریکی بۆ یەهوودییەت) کە دژ بە سەعیۆنییەت بوو تەنها لە دوو دەقیقە کەمتری پێ درا تاکو بۆ چوونی ڕێکخراوەکەی باس بکات[٥٤٣].

هەڵبەتە نموونەکان لەسەر ئەمە لەرادە بەدەر زۆرن ولەم کتێبەدا جێگەیان نابێتەوە، لە بابەتی(ئازادیی و ڕاگەیاندن) یشدا ئەختێکی تریان دەهێنینەوە.

***

لە ئەمەریکادا تۆقاندن تەنانەت لە ئاستی فەرمانگەکانی حکومەتیشدا پیادە دەکرێت، بۆ نموونە خاوەن بینایەك تاوانێکی بینی بەڵام ڕازی نەبوو شایەتی بدات چونکە پێشتر خاوەن بینایەکی تر شایەتییەکی وای دابوو، لە سزای ئەوەش فەرمانگەی بینا(بەهاندنی هێزدارەکان) کابرای ناچار کرد دەستکاریی بیناکە بکات ئەمەش بووە هۆی ئیفلاس کردنی[٥٤٤].

نەك هەر کەسانی ئاسایی بەڵکو تەنانەت کەسایەتیی گەورەش دەترسێنرێن. جەنەراڵ دۆگلاس مەکئارثەر MacArthur – پاڵەوانی ئەمەریکا لەشەڕی دژی ژاپۆن کاتی جەنگی دووەمی جیهانی – ساڵی(١٩٥١) لە وتارێکدا وتبووی کەوا زۆر کەس وریایان کردەوە هیچ بەیاننامەیەك نەڵێتو وتیان کەوا هەوڵ دەدرێت بڕوای خەڵك

---

[٥٤٢] ئە. ليلينثال، ثمن اسرائيل، ل ١٣١.

[٥٤٣] ئە. لينثال، هكذا يضيع الشرق الاوسط، ل ٢٢٨.

[٥٤٤] هـ. لاسكي، الديمقراطية الامريكية، ل ١٩٩.

نەهێڵرێت بەوەی کە بیروبۆچووکانی راستن ئەویش لە رێگەی پروپـاگندەی درۆیینـە نـەك لە رێگەی بەڵگەوە"[٥١٥].

***

دیارە ئەگەر نموونەی تر بهێنینەوە دەبێت بەم زووانە نەوەستین بۆیە ئەم باسەی سـنوورەکانی ئـازادیی لـە ئەمـەریکادا بـە وتەیـەکی نووسـەری نـاوداری ئەمـەریکی(مـارك تـوەین) کۆتایی پێ دەهێنین.

(توەین) دەڵێت: ئێمە لە وڵاتەکەماندا بە مەشـیئەتی خـودا سـێ شـتی بـەنرخمان هەیە: ئازادیی قسەکردن‌و ئازادیی ویژدان(واتە بیروبـاوەڕ)و حیکمـەتی بـەکارهێنانی هیـچ لەم دوانە"[٥١٦]. هەرچەندە(توەین) ساڵی(١٩١٠) مردووە بەڵام قسەکەی بۆ ئەمڕۆ راستترە، ئەمڕۆی کۆتایی سەدەی بیست و ئەمڕۆی گەرمەی باسـی دیموکراسیی‌و ئـازادیی‌و مـافی مرۆڤ.

# سێیەم — ئازادیی لە ئەوروپادا

زوو لـە بـەریتانیادا جـۆن لـۆك(١٦٣٢–١٧٠٤) کـە پێشـەوایەکی ئـازادیخواز بـوو دیفاعی دەکرد لە بێ بەش کردنی کاثولیکەکان"[٥١٧]، بەریتانیاش(ئایرلـەندای لێ دەربچێـت) بە زۆریی(پرۆتستانت) بوو.

دوای ئەوە بە سەدەو نیوێك (رەسڵ)ی فەیلەسووف‌و زانا دووچاری جەزا(غەرامە) بوو چونکـە لـە جـەنگی یەکـەمی جیهانیدا نامیلکەیـەکی بڵاوکـردەوە تیـایدا دیفـاعی لـە هاوڵاتییەك کردبوو کـە لەبـەر هۆیـەکی مـەبدەئی رازی نـەبوو سـەربازی بکـات. هـەروەها

[٥١٥] جۆن بیتی (؟)، الستار الحديدی ....، ل ٨٧.

[٥١٦] ليۆنارد ليتلی وجۆن بۆش، منهج السياسة الامريكية الداخلية، ل ٢٧٠.

[٥١٧] هـ. لاسكی، الدولة في النظرية والتطبيق، ل ٩١.

حوكمی بەندكردن بۆ ماوەی شەش مانگ بەسەر(رەسڵ) دا دەرچوو لەبەر ئەوەی ساڵی(١٩١٨) وتارێكی بڵاوكردبووەوە دژ بە پەنا بردن بۆ چەك[٤٨].

(جۆد) یش لە سییەكانی ئەم سەدەیەدا وتبووی كەوا لەدەزگای ئیزگەی بەریتانیدا BBC رێگە لەو پێشكەشكەری بەرنامەیە دەگیرێت كە باسی مەترسییەكانی جەنگی داهاتوو بكات یان دیفاع لە مەسەلەی ئاشتی بكات[٤٩]. هەروەها باسی سەرۆكی زانكۆی ئۆكسفۆرد دەكات كە ساڵی(١٩٣٣) باسی مافی ئازادیی تەواوی تاكەكانی كردبوو بەڵام چەند مانگێك پاش ئەم قسەیە چالاكییەكانی(یانەی ئۆكتۆبەر) ی وەستاندو رێگە گرت لە پێكهێنانی لیژنەیەك لە زانكۆكەدا بۆ دژایەتی كردنی جەنگ[٥٠].

هەرلەبەریتانیاداو لەبەر ئەوەی كە بەرنامەی حزبی كرێكارانی بەریتانیا لەگەڵ سەرمایەداریدا ناكۆك بوو لەبەر زاڵ بوونی سەرمایەداری؛ چەپرەوەكانی حزبەكە شكستیان هێنابوو. (لاسكی) پەنای بردە بەر نووسینو دەرس وتنەوە، (بێرنارد شۆ)پێش ئەو لەدەستی سیاسەت رای كردو رووی كردە ئەدەب، (ئەنورین بیڤان) (١٨٩٧-١٩٦٠) بە توندی دژی راستڕەوەكان دەجەنگی بەڵام جارێك دەردەكراو جارێكی تر دەهێنرایەوە[٥١].

لەبارەی ئازادیی لەئاستی رەخنەگرتن لە كارەكانی جوولەكەدا رۆژنامە نووسی بەریتانی(مایكڵ ئادامز) دەڵێت كەوا لە ساڵی(١٩٦٧) هوە تاكو ساڵی(١٩٧٠) زۆر

---

[٤٨] ب رەسڵ، هل للأنسان مستقبل، ل ١٦(پێنجەكیی وەرگێڕ).

[٤٩] سیریل جۆد، الحریة فی القرن العشرین، ل ٦٥.

[٥٠] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٢٨ وەرگێڕی عەرەبی وشەی (وەكیلی زانكۆ) بەكار دەهێنێت كە رەنگە (سەرۆكی زانكۆ) بگرێتەوە.

[٥١] هـ. لاسكی، الدولة..، ل ٣٢-٣٣ (قسەی وەرگێڕانی عەرەبی).

زەحمەت بوو هیچ وتارێك بڵاوبکرێتەوە لەرۆژنامەکانی ئەو وڵاتەدا ئەگەر پشتگیری لەعەرەبو فەلەستینییەکان بکات[502].

(ئادامز) نموونەی رۆژنامەی(گاردیان) دەهێنێتەوە کە لایەنگری ئیسرائیل بوو بەڵام ساڵ(١٩٥٦) — ساڵی تەعەدای بەریتانیاو فەرەنساو ئیسرائیل دژی میسر- دژی سیاسەتی حکومەت سەبارەت بە میسر قسەی کرد. ئەم هەڵوێستەی گاردیان بووە هۆی ئەوە ی جەماوەرێکی زۆرو خاوە ئیعلانی زۆری لەدەست دەربچێت ... هەرچەندە پاش ئەم بەزمە رۆژنامەکە خوێنەری زۆری جارانی دەستکەوتەوە بەڵام ((ئەم ئەزموونە بیرخستنەوەیەك بوو بۆ ئیحتمالی هەرەس هێنانی باشترین رۆژنامە بەرامبەر کارێکی نەخشە بۆ کێشراو لەلایەن کۆمەڵێکی فشارەوە))[503].

ئادامز هەروەها باس ئەو سەردەمە دەکات کە ئەو کەسە تووشی چی دەبوو ئەگەر شتی بنووسیایە یان قسەی بکردایە بۆ BBCو قسەکانی بەدڵی سەفارەتی ئیسرائیل یان هاوڕێکانی ئیسرائیل نەبن... ئەو کەسە دەست بەجێ سەرزەنشت دەکرا هەرچەندە(رصید) پشی بەهێز بوایە، ئەو کەسەش چەند پلەی بەرز بێت هەردەبێت چاوەڕوانی ئیجرائاتێکی وا بکات کە لە((ئیشارەت بۆ بەرپەرچ دانەوەو سزا)) زیاترن[504].

***

ئەگەر باس لەفەرەنساش بکەین ئەوا هەمووومان مەسەلەی قەدەغەکردنی حیجاب لەبەر کردن لە قوتابخانەیەکی فەرەنساامان بیستووە. هەرچەندە بالاترین دادگای فەرەنساش بڕیاری دابوو کە کچە دەرکراوەکان بگەڕێنەوەقوتابخانە بەڵام نەیارەکانی حیجاب لە فەرەنسادا بەتوندی دژی ئەو بڕیارە وەستانو بیرلەوە دەکرێتەوە کە

[502] مایکل ئادامز، الاعلام المتمیز، گۆڤاری آفاق عربیة، ژمارە ١١/تموز/١٩٧٩، ل ٢٦.

[503] سەرچاوەی سەرچاوە، ل ٢٧-٢٨.

[504] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٢٩.

پەرلەمان یاسایەك دەربكات كە حیجاب بە تەواوی لە قوتابخانەكان قەدەغە بكات، سەرۆكی فەرەنسیش(جاك شیراك) یش یەكێكە لەوانەی كە بیر لەمە دەكەنەوە[٥٥٥].

دیاریشە كە مەسەلەی قەدەغەكردنی حیجاب پەیوەندی بە ئازادیی ئافرەتەوە نییە چونكە سێ كچەكە خۆیان سوور بوون لەسەر حیجابەكە، هەروەها لە قوتابخانەدا جولەكە كڵاوی خۆیان دەكەنە سەرو نەصرانییەكان خاچ دەكەنە ملیان بەڵام هیچ نەكراوە بەرامبەریان. ئەم كێشەیەش بۆ خۆی نموونەیەكە لەسەر وەهمی ئازادیی.

نموونەیەكی تریش كێشەی بیریاری فەرەنسی(رۆجێ گارۆدی) یە. گارۆدی كە پێشتر ماركسی بوو لای فەرەنساییەكان جێگەی قبووڵ بوو چونكە ماركسییەكی كراوە بوو، گارۆدی رەخنەی لە داگیر كردنی(چیكۆسلۆڤاكیا) ی ئەوسا لەلایەن یەكێتی سۆڤیەت(١٩٦٨) گرتبوو. سەرەتای كتێبێكی پاش ئەم دلگیر كردنە بە رستەی(چیتر ناكرێت بێ دەنگ بین– لم یعد الصمت ممكنا)و هەر بەم رستەیە كۆتایی بە كتێبەكە هێناوە. بەڵام لە ساڵی(١٩٨٣) و گارۆدی دژی تەوژمەكە وەستا. لەو ساڵەدا بووە موسڵمانو پاشان كتێبێكی نووسی لەبارەی ئیسلامەوە. تاوانی گەورەتری گارۆدی ئەوە بوو كە ویستی بتەكان بشكێنێت. قسەی(سۆفی) مان لەیادە؟ خەڵكی بە خراپە سەیری ئەفسانە شكێنەر دەكەن گارۆدی لەم دواییەدا كتێبێكی بڵاو كردەوە بەناوی(ئەفسانە دامەزرێنەرەكانی سیاسەتی ئیسرائیلی)و تیایدا بە كۆمەڵ كوشتنی جولەكەی بەدرۆ خستەوە(لەگەڵ چەند ئەفسانەیەكی تر). گارۆدی لە هەموو لایەكەوە تووشی هێرشێكی سەخت بووو درا بە دادگاو پاشان دادگا جەزای پەنجا هەزار فرەنكی(زیاد لە ٨ هەزار دۆلار) بەسەردا سەپاند[٥٥٦]. هەرچەندیشە ویستبووی وەڵامی رەخنەگران بداتەوە وەڵامەكەی بڵاوبكرێتەوە بەڵام هیچ رۆژنامەیەك بەمە رازی نەبوو. دەشڵێت كە هەر

---

[٥٥٥] لە گۆڤارێكی عەرەبیدا بینیومەو ئێستا ناوو ژمارەیەكم لانییە.

[٥٥٦] رادیۆی لەندەن،١٩٩٨/١/١٦ بەڵام بڕیەرێتی ئەكتەری فەرەنسیی (بریجیت باردۆ) تەنها(١٧٠٠) دۆلار سزا درابوو لەبەر ئیهانە كردنی ئیسلام كە ئەمەش دەكاتە پێنج یەكی سزاكەی گارۆدی!

کەسێك پشتگیری لێ کردبێت دووچاری ئیرهابێکی فیکری و فشاری سامناك بوو تەنانەت(پییێر) ی قەشەی هاورێی کۆنی گارۆدی ناچار بوو لە پاریس دووربکەوێتەوەو بچێتە سەر کێویلێو پەیوەندی بەکەسەوە نەکات تا دووچاری ئەو فشارە نەبێت[557]. ئەمەش بەمەرجێك(پییێر) خۆشەویسترین کەسی لای فەڕەنساییەکانە[558].

بەر لەم مەسەلەیەش و لەکاتی داگیرکردنی لوبنان لەلایەن ئیسرائیلەوە(١٩٨٢) گارۆدی لەگەڵ دوو کەسایەتی تردا کە یەکێکیان(پییێر) ی قەشە بوو بەیاننامەیەکی نارەزاییان بڵاوکردەوەو لەبەر ئەمە گارۆدی درا بەداگا.

جگە لە کاری نەصرانییەت و جوولەکە هێزی تر هەن لەفەڕەنسادا کە ئازادیی لە ئاستاندا کەلەپچکە دەکرێت بۆ نموونە خاوەن رەزەکان کە بەرهەمەکانیان دەدلۆپێنن و کە ئیمتیازی گەورەیان هەیە وزۆربەی فەڕەنسیەکان دژ بەم ئیمتیازاتانەن بەلام وەکو(سۆڤی) ئەوسا وتبووی تەنها بەچرپەو نهێنی ئەم رایەی خۆیان دەڵێن[559].

***

لە ئەڵمانیادا قەدەغەکردنی ئازادیی لەو مەسەلانەی کە زیان بە جوولەکە دەگەیەنن شتێکی شاراوە نییە. بۆ نموونە ساڵی(١٩٩٤) یاسایەك دەرچوو کە سزای بەندکردن کە دەگاتە پێنج ساڵ دەدات بەسەر ئەو کەسەی کە لە ناوبردنی جوولەکە لەلایەن هتلەرەوە بەدرۆ دەخاتەوە[560]. هەروەها کتێبێکی(فرێد هۆفمان) قەدەغەکرا کەلە

---

[557] گۆڤاری العالم ٥٤٣، حوزەیرانی ١٩٩٦، ل ٤٥.

[558] Le Nouvelle Observateur, 9/5/1996, p. 46.

[559] ئەلفرید سۆڤی، الرأی العام، ل ١٧٢-١٧٤. سۆڤی دەڵێت:ئاوا دەبینین کە بنەمای دەنگدانی گشتی هەرەس دەهێنێت و هیچ نرخێکی نامێنێت.

[560] رادیۆی لەندەن ٢١/٩/١٩٩٤.

بارەی ئیسلامەوە بوو. هۆفمان فەرمانبەرێکی باڵیۆزخانەی ئەڵمانی لە(مەغریب) بووو موسڵمان بوو"[٥٦١].

***

هەر لە بارەی جوولەکەشەوە برایەکی خۆم باسی ئافرەتێکی کوردی کردبوو بۆم کە لە ئەمەریکادا بۆ ماجستێر دەیخوێندو کە هاتبوو بۆ زانکۆی(صلاح الدین) لە هەولێرو وتارێکی دابوو کاتێکیش لێی پرسی: ئایا دەتوانی لە ئەمەریکادا رەخنە لە جوولەکە بگریت وتبووی نەخێر... ئێمەش دەزانین کە نەخێر!.

***

نموونەی تر لەسەر سنوورەکانی ئازادیی لە بەشەکانی داهاتوودا دەبینین. لێرەشدا ئەوەندە دەڵێین کە ئەو سنوورانەی هەر هەن و هەر دەمێنن. لەوانەیە بگۆڕێن، رەنگە هەندێکیان نەمێنن بەڵام سنووری تر دەچێتە جێگەیان. دوور نییە لەدوارۆژدا دەسەڵاتی جوولەکە تێکبشکێت و رێگەی ئازادیی لەبەردەم رەخنەگرتن لێیان بکرێتەوە بەڵام لە جیاتی ئەوە رێگە لەبەردەم ئازادیی تردا دادەخرێت. بەهەمان شێوە رەنگە دەسەڵاتی سەرمایەداران تێکبشکێت بەڵام شوێنەکەیان بەچۆڵی نامێنێت و ئەوەی دەچێتە جێگەیان سنووری خۆی لەگەڵ خۆیدا دەمێنێت.

شتە قەدەغە کراوەکان پەیدا دەبن و نامێنن بەڵام یاساکە هەر دەمێنێت:لەهەر کۆمەڵگەیەکدا سنوور بۆ ئازادیی هەیە.

---

[٥٦١] کوردێك کە لە ئەڵمانیادا دەژی ئەوەی لە نامەیەکدا (کە بۆ برایەکی ناردبوو) باس کردبوو.

# ئازادیی ودەزگاكانی ڕاگەیاندن

ئەگەر دەزگاكانی ڕاگەیاندن ئازاد بن، خەڵكەكە ڕاستییەكان دەزانن‌و ئازاد دەبن لەبیركردنەوەو حوكمدان‌و هەڵسوكەوت‌و ژیرانە حاكمەكانی خۆیان هەڵدەبژێرن‌و سیاسەتەكان پەسەند دەكەن.

زۆر ئاسانە بەڕواڵەتی قسەكەی سەرەوە بخەڵەتێین. هەڵەی یەكەمی قسەكەش لەوەدایە كە قسەكە بێ موناقەشە خاوەنەكانی دەزگاكانی ڕاگەیاندن‌و كارمەندانی ئەو دەزگایانە بە مرۆڤێكی((بێ لایەن)) و((دادپەروەر)) و((دڵسۆز)) لە قەڵەم دەدات. بەڵام ئەمە خەونێكی خۆشە چونكە ئەمانە هەموو شتێكن غەیری بێ‌لایەن‌و دادپەروەرو دلسوز. بەم شێوەیە تەنانەت ئەگەر ئازادیی ڕاگەیاندنیش هەبێت بەو واتایەی كە هەموو كەسێك بۆی هەیە دەزگایەكی ڕاگەیاندن دابمەزرێنێت یان بڕوای بەچی هەبێت بیڵاوی بكاتەوە.... تاد ئەوا خەڵكی ناتوانن بڕیاری عەقڵی بدەن‌و ژیرانە حوكم لەسەرشتەكان بدەن...

دەزانین حاڵی ڕاگەیاندن لەسایەی دەوڵەتێكی دیكتاتۆردا چۆنە، بەڵام ئەو قەیدو زنجیرانەی كە لە دەوڵەتێكی وادا بەدی دەكرێن لە وڵاتێكی دیموكراسییشدا هەن بەڵام شێوەیەكی تر وەردەگرن. با بارۆخی ڕاگەیاندنیش بزانین تا بتوانین وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە كە دەڵێت: ئایا لە وڵاتە دیموكراتەكاندا ئازادیی ڕاگەیاندن هەیە؟

# یەکەم-مەسرەفی راگەیاندن

خەڵکی لای ئێمە دەزانن دەرکردنی رۆژنامەیەک یان گۆڤارێک لە رووی داراییەوە چەند زەحمەتە، بەڵام بۆ ولاتێکی رۆژئاوایی کە ژمارەی دانیشتوانی دەیان ملیۆنە کارەکە زەحمەتترە چونکە موناڤەسەکە گەورەترە بۆیە پێویستە رۆژنامەکە باشترو هەرزانتر بێت.

(سۆڤی) دەڵێت: هەموو هاولاتییەکی ئەمەریکی دەتوانێت رۆژنامەیەک دەربکات کە موناڤەسەی(نیویۆرک تایمز) یان(شیکاگۆ تریبیۆن) بکات بەڵام ئەم یەکسانییەی نێوان هاولاتییان شایەنی گاڵتە پێ کردنە[٦٢]. لە فەرەنساداو لە پەنجاکاندا وتراوە کەوا بۆ دەرکردنی رۆژنامەیەک نزیکەی یەک ملیار فرەنك پێویستە(کە ئەو کاتە دەیکردە نزیکی چارەکە ملیار دۆلار، بەبەهای دۆلاری ئەو کاتە)[٦٣]. ئەنجامەکەش ئەوەیە کە خاوەنی رۆژنامە تەنها دەوڵەمەندەکانن[٦٤].

لای خۆمان دەزگاکانی راگەیاندن مەسرەفیان دەوێت و زەرەر دەکەن بەڵام لە رۆژئاوادا قازانج دەکەن چونکە پرۆژەیەکی سەرمایەدارین. بۆ نموونە رۆژنامەی(تایمز) ی بەریتانی تەنها لەیەک ساڵدا(١٩٢٣–١٩٢٤) نزیکەی یەک ملیۆن پاوەنی قازانج کرد[٦٥]، ئەویش بەبەهای ئەوسای پاوەن. ئەم قازانجەش بەزۆری لە رێگەی ئعلانەوە بەدەست دێت. ئیعلانی بازرگانی ٦٥٪ تا ٩٥٪ی دەستکەوتی رۆژنامەکە پێك دەهێنێت[٦٦]. رەنگە

---

[٦٢] ئه، سۆڤی، الرأی العام، ل ٢٢.

[٦٣] ئەلبێر شافان؟ لە، مستقبل الديمقراطية ومفاهيمها، ل ٣٤٠.

[٦٤] لاسکی، مدخل الی علم السياسة، ل ١٠٩–١١٠، لیڤیو رۆش. منهج السياسة الأمريكية الداخلية، ١٢٦..

سەرچاوەی زیدی تریش

[٦٥] دکتۆر قتيبة الشيخ نوری، اسرار الصحافة البريطانية، گۆڤاری افاق عربية، ژمارە ٦/١٩٧٦،ل ٧٦.

[٦٦] تۆ. رەنی، سياسة الحكم، ج ١، ل ٣٢٠.

بوترێت: ئەمە شتێکی باشەو من دەتوانم ڕۆژنامەیەك دەربکەمو ئعلان بۆ ڕۆژنامەکە پەیدا بکەم، بەلام ئعلان دەستکەوتن بەو ئاسانییە نییە چونکە مەرجێکی ئعلان وەرگرتن ئەوەیە کە خاوەن ئعلانەکان(=سەرمایەداران، خاوەن بەرژەوەندییەکان....) تووڕە نەکەیت. ئەو ڕۆژنامە یان کەناڵە تەلەفزیۆنییەی کە لە وڵاتێکی سەرمایەداردا دژ بە بەهاکانی سەرمایەداری قسەبکات دەبێت چاوەڕێی ئەوە بکات کە هیچ کۆمپانیایەك ئعلانی بۆ نەنێرێتو دەبێت ئامادە بێت وەك ڕۆژنامەیان تەلەفزیۆنێکی ناوچەیی بمێنێتەوە ئەگەر ئەسڵەن بمێنێتەوە.

ڕەنگە کۆڵ نەدەیتو بڵێیت: ڕازیم ئازادیی خۆم لەسەر ئاستێکی ناوچەییدا پیادە بکەم.... بەلام ئەمە ئازادیی نییە، ئەگەر ئازادیش بێت نرخێکی ئەوتۆی نییە. پاشان بەو حسابە مرۆڤ ناتوانێت مونافەسەی ڕۆژنامەکانو دەزگاکانی تر بکات.

لەپەنجاکانی ئەم سەدەیەداو لەبەریتانیادا(٢٩) ملیۆن نوسخەی ڕۆژنامە دەفرۆشرا واتە یەك دانە بۆ دوو هاوڵاتی، کەواتە ئەگەر لەم ژمارەیە تەنها چەند هەزار دانەیەك هی تۆ بێت دەبێت دەنگی تۆ چەند کز بێت ؟ ئازادیی هەرئەوە نییە قسە بکەیت، ئازادیی ئەوەشە کە هەموو کەس گوێی لە دەنگت بێت ئەگینا جیاوازییەکی وا نییە نێوان ئازادیی قسەکردن بۆ چەند هەزار کەسێك(لە وڵاتێکی ٥٠ یان ٦٠ ملیۆنی)و ئازادیی شت نووسین لەسەر دیواری ئاودەست.

کەواتە پێویستە بچێتە ناو مونافەسەو شان بدەیت لە شانی پاشایانی ڕاگەیاندن. بەر لەوەی خەیاڵ بمانبات با نموونەیەك بهێنینەوە کە هەموو خەیاڵێك بنەبڕ بکات. ئەوەتا ڕووپەرت مەردۆخ Rupert Merduck کە ئیمپراتۆرێکی ڕاگەیاندنە تازە کەناڵێکی تەلەفزیۆنیی هەواڵی(٢٤) سەعاتی بەردەوامی داناوە لە ئەمەریکادا .... ئەو ئەمەریکا گەورەیە تەنها دوو کەناڵی وای تێدایەو پێویستە مەردۆخ پارەیەکی زۆر سەرف بکاتو ماوەیەکی زۆر چاوەڕێ بکات تا بگاتە ئەو ڕۆژەی کە قازانج بکات[٥٦٧]. ئەمە

---

[٥٦٧] ڕادیۆی لەندەن، ١٩٩٦/١٠/١٥ برنامج الأعلام.

ئیمپراتۆریکی راگەیاندن(نەك پادشا)و ئـاوا پێویسـتە مونافەسـە بکـات ... ئـەی غـەیری ئەو؟

کەواتە دەبێت مرۆڤ قەناعەت بەوە بکـات کـە راگـەیاندنێکی ناوچـەیی‌و بچووکـی هەبێت وچاوەڕێی ئەنجامی ناوچەیی‌و بچووك بکات ئەوەش ئەگـەر پادشـایانی راگـەیاندن وازی لێ بهێنن حەزی لە چییە بیڵێت‌و ریسەکەی بۆ نەکەن بە خوری.

رەنگە ئەو کەسـەش تـەکانێك بـداتو هـەوڵێکی دوایـەمین تـاقی بکاتـەوە ئـەویش بەوەی کە نرخێکی دیاریکراو بۆ ئعلان دەسـتنیشان بکات کـە بـە هۆیـەکی سـەرمایەیەکی گەورە بۆ رۆژنامەکـەی دابین بکـات بـەڵام لێرەشدا بەرگـەی موناقەسـە نـاگرێت چونکـە کۆمپانیا گەورەکان نرخێك بۆ ئعلان دەسـتنیشـان دەکـەن کەئـەوەندە کەمـە مەسـرەفی رۆژنامە بچووکەکان پڕ ناکاتەوە[٥٦٨].

دوور نییە هەوڵەکانی ئەو کەسە دوایەمین هەوڵ نەبێت بەڵام پاش ماوەیـەك دڵنیـا دەبێت لەو راستییەی کە پارە لە وڵاتێکی‌دیموکراتیداو لەبواری راگەیاندندا دەوری زەبری دەسـەڵاتداران لـە دەوڵـەتێکی دیکتـاتۆردا دەبینێت. بـەڵام ئەمـە هـەموو شـتێك نییـەو بەربەستی تر لە رێگە دا هەن.

## دووەم — بیروباوەڕو بەرژەوەندییەکانی سەرمایەداران

بـاس ئیعلانمـان گـرد وەك داهـاتێکی سـەرەکی بـۆ دەزگاکـانی راگـەیاندن. ئـەو دەزگایانەش بۆ ئەوەی ئـەم داهاتـەیان دەسـت بکـەوێت پێویسـتە سـەرمایەداران تـووڕە نەکەن. نموونەیەك لەسەر ئەمە بەرنامەیـەکی تەلـەفزیۆنیی تەسـجیلی (واتـە واقعـی نـەك تەمسیلی) کە لە تۆڕی N.B.C. ی ئەمەریکی پەخش کرا لەبارەی کۆچ کردووەکـان کـە لـە رنینـی میـوە لـە ویلایـەتی (فلۆریـدا)ی ئەمـەریکیدا کاریـان دەکـرد. فلیمەکـە لەگـەڵ

[٥٦٨] دەیڤید کۆشمان کۆیل، النظام السیاسی فی الولایات المتحدة، ل ٢٥٠.

بەرژەوەندییەکانی کۆمپانیای خواردەمەنیی (کۆکا کۆلا)و(یەکێتی فلۆریدا بۆ میوەو سەوزە) نەدەگونجا بۆیە کەناڵەکەیان وریا کردەوە کە پەخشی نەکات چونکە((بێ لایەن نییە))، پاشان داوایان کرد دیمەنی زۆری لێ لابرێت، لە کۆتاییشدا تەنها یەك دیمەنی لابراو بەخش کرا، کۆمپانیای (کۆکا کۆلا)ش لە وەڵامی ئەوە ئیعلانی خۆی لە N.B.C سەندەوەو دای بە دوو تۆڕی A.B.C و C.B.S.[69] دیاریشە کۆمپانیایەکی عیملاقی وەکو کۆکا کۆلا کە بەرهەمی لەناو هەموو جیهاندا بڵاودەکاتەوە ئیعلانی چەند زۆری هەبێت و پارەی چەندیان بۆ سەرف بکات و ئەو تۆڕە چەند زیانی پێ گەیشتبێت.

بەرژەوەندیی ماددی بڕگەی یەکەمی بیروباوەڕی سەرمایەدارەکانەو بیروباوەڕەکانی تر لەوەوە هەڵدەقوڵێن. لە هەموو حاڵەتێکیشدا ڕاگەیاندن لە ئاستی ئەو بیروباوەڕانەدا نە ئازادەو نە بێ لایەنە.

دامەزرێنەری گۆڤارە ئەمەریکییەکانی تایم و لایف.. تاد هنری لوسیH. Luce دانی بەوەدا نابوو کە مەوزووعیەت لە ڕۆژنامەگەر بەو واتایەی کە ڕۆژنامە نووسەکە ڕاستییەکان وەکو خۆیان بخاتە ڕوو.. ئەم جۆرە مەوزووعیەتە شتێکی نوێیەو بەتەواوی ساختەیەو (لوس) ناڕەزایی دەربڕی بوو بەرامبەری [70].

فکری سەرمایەداریش وەکو ئایدیۆلۆجیا خۆی خنیوەتە تەنانەت ئەو بڵاوکراوانە کە گوایە زانستیو بێ لایەنن. شیللەر باسی گۆڤاری میللیی جوگرافیا National Geographic دەکات کە گوایە مەوزووعییە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئایدیۆلۆجیای تێدا دەبینرێت وەك باوەڕ بەسارمایەداریو ستایش کردنی داگیر کەری ئەورووپیو ئەمەریکی لە کاتێکدا نووسەرێك تێبینی کردووە کە لە ماوەی پەنجا ساڵدا لە هیچ لەو وتارانەی کەلە

[69] هـ. شیللەر، المتلاعبون بالعقول، ل ٢٥.

[70] سەرچاوەی سەرەوە، ٢٤٧.

بارەی ویلایەتەکانی باشووری ئەمەریکاوەن باسی رەگەز پەرەستیی سپی پێستەکان یان کەم خۆراکی .... تاد نەکراون"[٥٧١].

لەفەرەنساشداو وەك (شافان) دەڵێت: رۆژنامەگەری لە خزمەتی چەند هێزێکی شاردراوەیە، بۆ نموونە زۆر زەحمەتە هێرش بکرێتە سەر ئیمتیازاتی بازرگانەکانی چەوەنەر (کە مەشرووبی لێ دروست دەکرێت)و بازرگانەکانی مەشرووب لە باکووری فەرەنسادا"[٥٧٢].

نموونەیەکی تر(بێرنارد شۆ)یە کە خاوەن بیروباوەڕی سۆشیالیست بوو بەلام هەرچەندە (شۆ) سۆشیالیستێکی (فابی) بوو واتە بڕوای بەشۆڕش نەبوو بەڵکو بەبەدی هێنانی هێواش وپلە بە پلەی سۆشیالیزم ...(شۆ) سکالای کردبوو کە رۆژنامەگەریی بەریتانیا بوونەتە بەربەست لەبەردەم بیروباوەڕەکانی کە بگاتە گەل لە کاتێکدا لاپەڕەکانیان دەکەنەوە بۆ چیرۆکە سەخیفەکان"[٥٧٣]..

# سێیەم —بیروبۆچوونی خاوەن دەزگا ئیعلامییەکە

وتمان دەبێت دەزگاکان خاوەن ئعلانەکان (= سەرمایەداران) رازی بکەن. بەلام خاوەن دەزگاکان بۆ خۆیان بیروبۆچوونی تایبەتیی خۆیان هەیەو ئەم بیرو بۆچوونانە بەربەستێکی ترن لەبەردەم ئازادیی راگەیاندندا.

---

[٥٧١] سەرچاوەی سەرەوە، ل ١١٦،١١٧، ١١٨، بە شێوەیەکی گشتیی لەبارەی رەوتی ئەم گۆڤارە ل ١١٢-١٢٣.

[٥٧٢] ئەلبێر شافان، له مستقبل الديمقراطية...، ل ٣٣٩.

[٥٧٣] كريم مسعد، الديمقراطية البريطانية، ل ٩٩.

دەزگاکەش هەرچەندە پرۆژەیەکی بازرگانییە بەڵام لە کۆتاییدا هەر بیرورباوەڕی خاوەنەکەی دەردەبڕێت ... لەبەر ئەوە ڕۆژنامە نووس چەند بیەوێت بابەتییانە قسە بکات هەر بەرژەوەندییەکانی خاوەنی رۆژنامەکە دەردەخات[574].

بۆ چوونەکانی خاوەن دەزگاکە پاڵی پێوە دەنێن بۆ چەند کارێك وەك هەڵبژاردنی ئەو باسو هەواڵانەی کە بۆ خۆی گونجاون‌و پشت گوێ خستنی ئەوانەی تر، دەستکاری کردنی هەواڵەکان، بچرپچر کردنی هەواڵەکان، پاش‌و پێش خستنیان، دواخستنی هەندێکیان تا (ئیکسپایەر) دەبن[575].

هەندێك لە خاوەنەکانی دەزگاکانی راگەیاندن ((ئیمپراتۆری راگەیاندن))و دەستیان گرتووە بەسەر بەشێکی گەورەی کەناڵەکانی راگەیاندن وزۆر لە مونافسەکان‌و لە کەناڵە بچووکەکانیان لەبازاڕ دەکردووە.

یەکێك لەوانە (روپەرت مەردۆخ)ی جوولەکەی ئوسترالی کە پێشتر باسمان کردبوو. مەردۆخ خاوەنی رۆژنامەی ناوداری (تایمز) Times، هەروەها (سەندەی تایمز) و(سەن) ... تاد لە بەریتانیادا. سەرەتای هەشتاکان تایمز تووشی زیانێکی گەورە ببوو مەردۆخ ئەو رۆژنامەیەی کڕی، ساڵی (١٩٨٧) یش رۆژنامەی تودەی Today ی ٣٨,٥ ملیۆن پاوەن کڕی، بەم پێیەو تا ئەو ساڵە مەردۆخ ٣٤٪ ی رۆژنامەگەریی بەریتانیای لە دەستدابوو (بەحساب دابەش کردنی رۆژنامەکان)[576]. ئەمەش جگە لە چەندین رۆژنامەو گۆڤاری تر لە ئەمەریکاو وڵاتانی تردا و جگە لەو کەناڵە تەلەفزیۆنییەی ئەمەریکا کە باسمان کردبوو کە لە ئەمەریکا تەنها دوانی تر هەن.

---

[574] لیفی‌و رۆش، منهج السیاسة.. ، ل ١٢١-١٢٦.

[575] بڕوانە چەند نموونەیەك لە، اسرائیل ذلك الدولار الزائف، ل ١٩٠، ١٩١، ١٩٤، ١٩٥، ....

[576] The Economist, 4-10-/7/1997, p. 31: بەپێی سەرچاوەی نوێتریش رێژەکە (٣٧٪)ە: محمود المراغی، گۆڤاری (العربی) ی کوێتی، ژمارە ٤٤٥، کانوونی یەکەم، ١٩٩٥، ل ٨٥.

نموونەیەکی تر لەسـەر ئیحتکار کردنـی راگەیاندن: کۆمپانیـای (زیرۆکس) ە کـە بەشەکانی کۆمپانیاکـانی (مـایکرۆفلمی زانکۆیـی)ی کـرپ، هـەروەها ئەوانـەی (بڵاوکـراوە ئەمەریکییـەکانی فـێرکردن)و خانـەی (ر. ر. پاوکـەر) بـۆ بڵاوکردنـەوە کـە دوو گۆڤـاری بازرگـانیی نـاوداری دەردەکـرد هـەروەها کۆمپانیـای (جـن) ی کـرپ کـە یەکێکـە لـە دوو کۆمپانیای گەورەی بڵاوکردنەوەی کتێبی فێرکاری[٥٧٧] .....

نموونەیەکی تر سەرۆك وەزیرانی پێشـووی ئیتالیـا (سـلڤیۆ برسـلۆنی) کـە شـەش کەناڵی تەلەفزیۆنی و دەیان رۆژنامەو گۆڤاری هەیە[٥٧٨].

لەئەمەریکادا کۆمپانیا ئحتکارییەکان ساڵی (١٩٦٠) ٣٠٪ی رۆژنامە ئەمەریکییەکان هـەبوو بـەڵام سـاڵی (١٩٧٨) رێژەکـە بـوو ٥٩٪ ئـەو رۆژنامانـەش لـەو سـاڵەدا ٧١٪ی خوێنەران دەیانخوێندەوە، ٩٧٪ی ئەو رۆژنامەش کە لەشارەگەورەکاندا دەردەچوون(کە ١٥٤٤ شارن) لەدەستی ئەو کۆمپانیایانەدا بوون[٥٧٩].

جۆرێك لە ئیحتیکار بریتییە لە ئحتکار کردنی هەواڵ ئەویش کە دەزگایەکی گەورە هەواڵ دابەش دەکات بەسەر دەزگاکانی تردا، ئەویش وەکو رۆژنامەی (نیویۆرك تایمز) کە هەواڵ بە(٧٢) رۆژنامە لە ئەمەریکاداو کەنەداو وڵاتانی تردا دەدات[٥٨٠].

هەواڵەکانیش لە جیهانداو بەپێی سەرژمێرییەکی (یونسکۆ) ١٩٨٢-١٩٨٣ لە چوار دەزگای گەورەوە دەردەچن کە سەرچاوەی سـەرەکیین بـۆ ئـەو هەواڵانـە، دەزگاکـانیش بریتین لە(ئەسۆشییەیتد پرێـس)، (یونـایتد پرێـس)،(رۆیتـەر)،(وەکالـەتی رۆژنامەگـەریی فەرەنسی)، ئەمانەش رۆژی زیاد لەیەك ملیۆن وشە بڵاودەکەنەوە[٥٨١].

---

[٥٧٧] د. شیللەر، المتلاعبون بالعقول، ل ٨٩.

[٥٧٨] محمود المراغی، گۆڤاری العربی، ژمارە ٤٤٥، کانونی یەکەم، ١٩٩٥، ل ٨٥.

[٥٧٩] گۆڤاری الوطن العربی، ژمارە ٨٢-٩٠،-١٩٩٥/٩/١٥، ل٢٨٧.

[٥٨٠] ئەلفرید لیلینتاڵ، اسرائیل ذلك الدولار المزیف، ل ١٦٦.

[٥٨١] گۆڤاری فلسطین المسلمة، ژمارە ١٢، ساڵی ١٣، کانوونی یەکەم ١٩٩٥، ل٤٥.

هەرچەندە یاسای حکومی هەر دژی ئەم ئیحتکارە بەڵام پێچو پەناکردنو خۆ دزینەوە لەم یاسایانە شتێکی زەحمەت نییە. مەردۆخیش کاتێك رۆژنامەی Today ی کڕی خۆی لەیاسای ئیحتکار دەرباز کرد چونکە یاساکە ئەو بڵاوکراوانە ناگرێتە کەمەترسی ئیفلاسیان لەسەرە[582]. لەبەر ئەوەش کە گوایە مەترسییەکی وا لەسەر ئەو رۆژنامەیە هەبوو کرینی لە لایەن مەردۆخەوە یاسایی بوو.

ئیمپراتۆرەکانی راگەیاندن بەمەش ناوەستن بەڵکو لە نێوان خۆیاندا کۆمەڵێکی راگەیاندنی گەورەتر دروست دەکەن وەك ئەو چوار کەسو دەزگا تەلەفزیۆنییەی کە لە ساڵی(١٩٩٦) نیازیان بوو شەریکایەتی بکەن بۆ داگیرکردنی بازاری تەلەفزیۆنی ئەوروپی، ئەوانەش بریتین لە مەردۆخو کەناڵەکانی Havasو+Canal ی فەرەنسیو Bertelsman ی ئەڵمانی[583].

ئایا لەناو جیهانی ئەم ئیمپراتۆرانەی راگەیاندنو لەناو ئەم چڕبوونەوەیەدا ئازادیی هەموو کەسێك لە دامەزراندنی دەزگایەکی راگەیاندن هیچ بایەخێکی دەمێنێت ؟ یان ئازادیی هاوڵاتی لە بیرکردنەوەو لە بڕیاردان بەدی دەکرێت ئەگەر بناغەی ئەم ئازادییە بابەتە ئیعلامییەکە بێت کە ئاوا لە ژێر دەستی چەند دەزگایەکی کەمە؟

چڕبوونی دەزگاکانی راگەیاندن شتێکی نوێ نییە، لە جەنگی یەکەمی جیهانییەوە مەیل پەیدا بووە بۆ ئەم چڕبوونەیە (لەسەر ئاستی رۆژنامەدا)[584]، ئەم مەیلەش زیاد بووەو لەزیاد بووندایە.

دیارە دەزگای راگەیاندنی ناوچەیی هەر دەمێننەوە، بەڵام تەنانەت لەم ئاستە ناوچەییەیشدا چڕبوون بەدی دەکرێتو لەناو یەك ناوچەدا تەنها یەك رۆژنامە دەمێنێتەوەو وەك (کۆیل) دەڵێت: بەم شێوەیە ئازادیی گەل نامێنێت لەوەی کە

---

[582] The Economist, 4-10/7/1987, p. 31.

[583] Les Nouveaux Empereurs de la Télé, Le Nouvel Observateur, 9-15/5/1996, p. 52 ff.

[584] ئۆستن رەنی، سیاسة الحکم، ج ١، ل٣٢٢.

ڕۆژنامەکان ڕای(معارض) ی بۆ بڵاو بکەنەوە[585]. لە هەموو حاڵەتێکیشدا ڕۆژنامەی ناوچەیی لەناو زەرەو هوری ڕاگەیەندنی ئیمپراتۆریدا وون دەبێت.

***

## کەواتە بەکورتی:

١-هەموو کەسێك تەنها بەشێوەیەکی (نظری) دەتوانێت دەزگایەکی ڕاگەیان دابمەزرێنێت، ئازادیی ڕاستەقینەش لەمەدا هی سەرمایەدارەکانە.

٢-ڕاگەیاندن ئیحتکار کراوە لەدەستی چەند دەسێك کەمدا.

٣-لەبەر ئەوە چەواشەکردنی جەماوەر کارێکی ئاسانە، یەکەم چەواشە کردنیش ئەوەیە کە بەجەماوەر بوترێت کەوا ئازادیی تەواویان هەیە.

چەواشەکاری لە ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوادا ڕەنگە لەوەی ڕاگەیاندنی دیکتاتۆریەت زیاتر بێت، چونکە دیکتاتۆریەت بەزۆری درۆ لەمەسەلە حکومییەکان دەکات و بەتایبەتی لەوانەی کە پەیوەندییان هەیە بەخودی دیکتاتۆرەکەوە لەکاتێکدا دەرگای درۆکردن لە ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوادا کراوەیە چونکە مەرکەزەکانی هێزو دەسەڵات زۆرن، دەستگرتنی کەمایەتیش بەسەر ڕاگەیاندندا شەوی چەواشەکاری تاریکتر دەکات.

لەبەر ئەمەش سەیر نییە ئەگەر قسەی (پەیمانگەی جیهانیی ڕۆژنامەگەری) ببیستین کە لە بڵاوکەرەیەکیدا دەڵێت:

لە جیهانی عەرەبییەوە بۆ ئاسیا، هەروەها چەند پایتەختێکی ئەورووپی کە ئیدیعای ئەوەیان دەکرد کە پابەندی ئازادیی ڕۆژنامەگەرین ... بارنەی ئەم ئازادییانە بەردەوام لەتەسك بوونەوە دایە[586].

---

[585] دەیڤید کۆیل، النظام السیاسی فی الولایات المتحدة، ل ٢٥٠.

[586] گۆڤاری الوطن العربی، ژمارە ١٥، ٢٧/٥-٢/٦/١٩٧٧، ل ٥٢.

# رای گشتی

## (الرأي العام)

رای گشـتی(یـان رای جـەماوەر) Public Opinion وەکـو شـتەکانی تـر پێناسەیەکی روونی وای نییە کە زانایان لەسەری رێک بکەون، بۆیە دەوترێت کەوا بێ هوودەیە ئەگەر هەوڵ بدرێت پێناسەی رای گشتی بکرێت[٥٨٧].

رەنگە بتوانین رای گشتی بە شتێکی دژ بەو بناسین وەك چۆن بەهۆی (شەو)ەوە (رۆژ) بناسین، ئەو شتەش (رای تایبەت)ە کە رای کۆمەڵێك خەڵکەو بەتایبەتی کۆمەڵی دەسەڵاتداران.

رای گشتی وەك زەمانەتێك بۆ پاراستنی ئازادیی‌و دیموکراسیی تەماشا دەکرێت. رای گشتی پارێزەری ئازادییە ئەگەر هەڕەشە لێ بکرێت‌و پارێزەری حوکمی گەلە ئەگەر کەمایەتی بیانەوێت حوکم زەوت بکەن بۆ خۆیان. لەبەر ئەوە هەبوونی رای گشتی‌و دەوری ئەم رایە بە یەکێك لە رواڵەتەکانی حوکمی دیموکراتی دەزانرێت ... ئەگەر راستیش بێت کە رای گشتی هەر لادانێك لە بنەمای حوکمی گەل یان لە ئازادیی راست دەکاتەوە ئەوا بەشی زۆری رەخنەکانمان قابل چارەسەرکردنن‌و بەم شێوەیە حوکمی دیموکراتی دەیسەلمێنێت کە دەردەکانی بێ دەرمان نین.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا با هیواکەمان گەورە نەبێت چونکە ئەوەی سەرەوە تێڕوانینێکی ساکارەو لەیەکەم هەنگاوەوە هەڵەیە چونکە رای گشتی بۆ خۆی پێولنەی راستی نییە. پێشتریش سەلماندن کەوا هەتا ئەگەر گەل خۆی فەرمانڕەوا بێت ئەوا گەل

---

[٥٨٧] جان ستوتزلو ئالان جیرار، استطلاع الرأی العام، ل ٣٢، (سۆڤی) ش لە کتێبەکەیدا هەولی نەداوە پێناسەی بکات، الرأی العام، ل ٢٥.

بۆ خۆی پێوانەی راستی نییە دواییش هەندێك لە بەڵگەكان دووبارە دەكەینەوەو بەڵگەی تر دەهێنینەوە.

پاشان‌و هەر لەسەرەتاوە قسەكە هەڵەیە چونكە هەبوونی رای گشتی وحساب كردن بۆی تایبەتییەكی دیموكراسیی بەتەنیا نییە. رای گشتی بۆی هەیە پشتگیری لە حوكمێكی نادیموكرات بكات وەكو ئەڵمانیای كاتی نازییەت.

هەروەها تەنها دیموكراسیی بایەخ بەرای گشتی نادات بەڵكو تەنانەت دیكتاتۆرەكانیش بایەخی پێ دەدەن [588]. فەیلەسووفی ئەمەریكیش (جۆن دیووی) دەڵێت: كەوا ئەو قسەیە راست نییە كە بەرژەوەندیی هاوبەشی نێوان حاكم‌و حوكمكراون لە رژێمی ئستبدادی دا وجودی نییە [589]. لەوەش زیاترو بەر لەوە فەیلەسووفی ئینگلیزی دەیڤید هیوم Hume (١٧١١-١٧٧٦) وتبووی كەوا تەنانەت دەوڵەتە ئستبدادییەكان یان سەربازییەكان تەنها لەسەر رای گشتی وەستاون [590]. فەیلەسووفی ئینگلیزیش هۆبز Hobbes (كە لەو بڕوایەدا بوو كە مرۆڤ گورگە بۆ مرۆڤەكانی‌ترو پشتگیریی دەسەڵاتی رەهای دەوڵەتی دەكرد) دەیوت كەوا رای گشتی جیهان حوكم دەكات [591]. كەواتا رای گشتی شەرعییەت تەنها بە دیموكراسیی نادات. وتراویشە كە رای گشتی لە دیموكراسییدا تەنها ئەو جیاوازییەی هەیە كە ئازادیی رێكخستن‌و موناقەشەكردن ... تاد ی هەیە [592].

ئێمەش ئەم بۆچوونە رەهایە رەت دەكەینەوە كە دەڵێت رای گشتی جیهان حوكم دەكات چونكە ئاشكرایە كە دیكتاتۆریەت لە هەموو شتێكدا رەچاوی رای گشتی ناكات، هەروەها ئەو بۆچوونە رەها پێچەوانەیەش رەت دەكەینەوە كە دەوری رای گشتی بە

---

[588] رەنی، سیاسة ا لحكم، ج ١، ل ٢٩٠، هەروەها بڕوانە سۆڤی، الرأی العام، ل ٢٢.

[589] جۆن دیووی، الدیمقراطیة والتربیة، ل ٨٦.

[590] جان دۆندیو دو ڤابر، الدولة، ل ٩، هەروەها گراهام والاس، الطبیعة البشریة فی السیاسة، ل ١٧٧.

[591] ستوتزل‌و جیرار، استطلاع الرأی العام، ل ٢١

[592] . رەنی، سیاسة الحكم، ج ١،ل ٢٩٠-٢٩١.

تایبەتییەکی دیموکراسیی بەتەنیا دەزانێت. راستیش ئەوەیە کە لە هەردوو جۆرە نیزامەکەدا کەمایەتی (کە فەرمانڕەوای راستەقینەیە) ناچارە لە هەندێك مەسەلەدا ملکەچی رای گشتی بێت‌و لەزۆر مەسەلەی تردا رای گشتی دەخاتە ئەو لاوە یان چەواشەی دەکات یان هەتا دروستیشی دەکات.

جێگەی مەبەست لێرەدا ئەوەیەئەو بۆ چوونەی کە رای گشتی بەپارێزەری ئازادیی‌و دیموکراسیی دەزانێت بۆچوونێکە بێ بەش نەبوو لەرەخنە[593]. لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە هەبوونی رای گشتی خۆی جێگەی گومانە:

١- هەندێك دەڵێن: رای گشتی وجوودی نییە بەڵکو ئەوەی کەهەیە رای زۆرینەیە[594].

٢- هەندێکیش دەڵێن: رای گشتی تەنها لەچەند مەسەلەیەکدا هەیە[595]، چونکە گەل وەکو جاران لەناو خۆیدا رێك نییە[596]. خەڵك لەبارەی راستییەکانی زانستەوە رێکن بەڵام هەر ئەوەندە لەم بوارە دەریچێن ناڕێکی سەرهەڵدەدات[597].

٣- هەیشە دەڵێت کە رای گشتی لە حوکمی دیموکراتیدا وجوودی نییە بەڵام ئەوە زیاد دەکەن کە ئەوەی هەیە ئەو را تایبەتەیە کە ئەوڕەمەکە دەجووڵێنێت[598].

بێگومان ئەوانەش هەن‌و زۆرن کە دەڵێن رای گشتی هەیەو دەور دەبینێت، هەرچەندە هەندێکیان - وەکو (گوستاف لوبۆن) - ئەمە بەشێکی خراپ دەزانن کە حکومەت‌و رۆژنامەگەری لە جیاتی پێشەوایەتی‌و رێکخستنی رای گشتی(وەکو ئەو سای

[593] رەنی، سیاسة الحکم، ج ١، ل ٢٩٠، سۆڤی، الرأی العام، ل ٢٢.

[594] بڕوانە: نقولا حداد، الدیمقراطیة . ل ١٠٥ مەبەستی لەو زۆرینەیە کە شوێنی رای کەمایەتی دەکەون.

[595] رەنی، سیاسة الحکم، ج ١،ل ٢٨٨،هەروەها (لۆوێل) بڕوانە: عبد الحمید متولی، الوجیز... ، ل ٢٢٧.

[596] ج. بیردۆ، الدیمقراطیة، ل ٤٨.

[597] ئە. سۆڤی، الرأی العام، ل ١٨٦.

[598] نقولا حداد، الدیمقراطیة، ل ١٠٥.

نوو) بوونەتـەوە دەنگدانـەوەو دووبارەکردنـەوەی ئـەو راگشـتیەن[599]. هەڵبەتـە ئەگـەر (لوبۆن) تا ئەمڕۆ بژیایە دەیزانی رای گشتی گەشتووە بەچی.

وتمـان هـەتا ئەگـەر رای گشـتیش هـەبێتو دەور ببینێـت، ئـەو راگشـتییە نابێتـە پێوانەی راستی تا دڵمان پێی خۆش بێت ئەویش چونکە:

١- زۆر جـار رای گشـتی بـۆ چوونێکـی هەڵـە دەبێـت، ئەمـەش نـاکۆکی دروسـت دەکات نێوان ئەم رایـەو رای کەمایـە تیپـەکی ژێـر کـە دەیـەوێت راسـتیپەکان بخاتـە روو هەرچەند ئەم راستییانە تاڵ بن[600].

٢- (ذاکرة)ی خەڵك زۆربەی کات وردو بەهێز نییە، خەڵك بایـەخ بـە مەسـەلەکانی ئێستا دەدەن و زۆر لەمەسەلە کۆنەکان پشت گوێ دەخەن[601]. لەبەر ئـەوە ئەگـەر لـەدوا رۆژدا حەقیقەتی هەر مەسەلەیەك روون بێتەوە ئەمە کار دەکاتە سەر تەنها پسـپۆڕان[602] و بایەخی نابێت لای خەڵك چونکە بۆتە مێژوو.

٣- رای گشتی شتێکی نەگۆڕ نییە بەڵکو تووچاری گۆران دەبێت[603].

٤- خەڵك هەمیشە تاماشای رابردووی دوورەوشـاوە دەکـەن کـە گوایـە کـاتی خـۆی وەزع لە ئێستا باشتر بووە[604]. لەبەر ئەوە حوکمەکەیان لەسەر ئێستاو رابردوو حوکمێکی راست دەرناچێت. ئەم خاڵەش سـەلماندنی خـاڵی (٢) ی سـەرەوەیەو نـاڕێك نییـە پێـی. خـەڵك (ذاکـرة) یـان ئـەوەندە لاوازەو ئاواتـەکانیان ئـەوەندە زۆرن کـە شـتە خراپـەکانی

---

[599] بڕوانە: گۆستاف لوبۆن. روح الجماعات. ل ١٢٧.

[600] بڕوانە: سۆفی. الرأی العام. ل ٣٤.

[601] سەرچاوەی سەرەوە. ل ٥٣

[602] سەرچاوەی سەرەوە. ل ٥٤

[603] سەرچاوەی سەرەوە. ل ٢٨

[604] سەرچاوەی سەرەوە. ل ٧١ . . . .

ئەوسایان لەیاد نامینێت‌و بەهۆی بەراوردکردنی ((ئێستای خراپ)) لەگەڵ هەندێك شتی باشی رابردوودا حوکمێکی هەڵە لەسەر ئێستا دەدەن.

٥- زانیارییەکانی خەڵکیش کەمن بۆیە حوکمەکانیان ورد نین.

٦-لەهەموو ئەمانەش خراپتر ئەوەیە کە رای گشتی لەزۆر مەسەلەدا دروست نابێت بەڵکو ((دروست دەکرێت))، ئەمەش کە بەشی داهاتوومان بۆ تەرخان کردووە.

## دروستکردنی عەقڵ

وتمان رای گشتی زۆر جار ((دروست نابێت)) بەڵکو((دروست دەکرێت))، باس کردنی ئەمەش شتێکی نوێ نییە. ئێمەش لێرەدا زاراوەیەکی فراوانتر بەکار دەهێنین ئەویش دروستکردنی عەقڵ یان دروستکردنی مێشك.

دروست کردنی عەقڵ ئەوەیە کە چەند هێزێك کاردەکەنە سەر کۆمەڵگەو سەر تاکەکانی ئەو کۆمەڵگەیەو مێشك‌و بیرکردنەوەو هەست‌و ئارەزوویان ئاراستەی ئەو لایە بکەن کە مەبەستییانە، ژمارەیەك بۆ چوون لە مێشکیاندا دەچەسپێنن‌و ژمارەیەکیتر لە مێشکیان دەردەکەن، دروست کردنی عەقڵ بە کورتی جۆرێکە لە مێشك شتن(غسل الدماغ) ئەگەر مێشك شتن خۆی نەبێت. لەم جۆرە مێشك شتنە مێشك شۆراوەکان هەست بەهیچ زۆلێکردنێك ناکەن کە ئاراستەیان کرابێت، لە کاتێکدا مێشك شتن لە نیزامێکی دیکتاتۆریدا جێگەی بێزار بوونی خەڵکە و کارێکی پێچەوانەی هەیەو تەنها لەچەند شتێکی کەمدا سەرکەوتووە.

ئەو هێزە سەرەکییانەی کە عەقڵی جەماوەر دروست دەکەن:

## یەکەم —کۆمەڵەکانی فشار

دروست کردنی عەقڵ رێگەیەکی ئاسانکەرەوەی کارەکانی ئەم کۆمەڵانەیە. لەم بارەیەوە راپۆرتێکی رەسمی ئەمەریکی هەیە کە باس لە کۆششی ئەو کۆمەڵانە دەکات بۆ ئاراستەکردنی مێشکی میللەتو بۆ دەست گرتن بەسەر رای گشتیدا. (مێنــۆ) ی فەرەنسیش کە ئەم قسەیە لەبارەی ئەمەریکاوە دەهێنێتەوە دەڵێت کەوا چەند نیشانەیەك هەیە کە ئەورووپا زیاترو زیاتر بەرەو ئەوە دەچێت کە چەند کۆمەڵێك رای گشتی بۆ بەرژەوەندیی خۆیان بجووڵێنن[١٠٥].

باسی ئەوەشمان کردبوو کە چۆن ئەو کۆمەڵانە سالانە سەدان هەزار سەرف دەکەن بۆ دروستکردنی ((کەش و هەوایەکی گونجاوی رای گشتی))و بۆ((رۆشنبیرکردنی گەل)).

## دووەم —دەزگا حکومییەکان

(لیدەرەر) لە بارەی ئەمەریکاوە چەند نموونەیەکی ئاراستە کردنی رای خەڵکمان بۆ دەهێنێتەوە، یەکێك لەوانە بڵاوکراوەکانی ئیستعلاماتی گشتی (ئەم ئیستعلاماتانەش بەزاری وەزارەتەکان قسەدەکەن) کە لە رێگەیانەوە فەرمانبەرەکان دەیانەوێت ئەو شتانە بەسەر خەڵکدا بسەپێنن کە بەراستی دەزانن[١٠٦].

(لیدەرەر) دەڵێت کە حکومەت شەرم نایگرێت کە سەرنجمان (- گەلی ئەمەریکی) رابکێشێت بۆ تێڕوانێکی دیاریکراوو لەم رێگەیەوە رای گشتی دروست بکات، زۆربەی

---

[١٠٥] جان مینۆ، الجماعات الضاغطة، ل ٥٠-٥١.

[١٠٦] ولیام لیدەرەر، أمة من غنم، ل ١٠٩.

کاتیش دەکەوینە داوەکانی چەند بیروڕایەك کە پێشتر بڕیاریـان لەسـەر درابـوو لـە لایـەن ئەو کەسانەوە کە ئێمە هەڵیان دەبژێرین‌و کە گوایە خواستەکانی ئێمە بەجێ دەهێنین[٦٠٧].

ڕێگەیـەکی دروستکردنی ڕای گشتی لـە ئەمەریکادا بریتییە لـە توێژینـەوەکانی کۆنگرس کە(دۆگلاس کەیتەر) لە کتێبی (بەشـی چوارەمـی حکومـەت) دا باسـی دەکـات. بەپێی (کەیتەر) –کە لیدەرەر قسەکانی نەقڵ دەکات–توێژینەوەکانی کۆنگرس وەسیلەن بۆ دروستکردنی هەواڵەکان‌و ئاراستکردنیان‌و بۆ سەرنج ڕاکێشانی گەل یان ئینزار کردنـی یان ئارام کردنـی، یـان بـۆ وەرگرتنـی ڕەزامـەندیی خـەڵك، یـان هـەندێك جـار بـۆ ئـەوەی شتەکان زیاتر لەجاران تەمومژاوی بن[٦٠٨].

(لاسکی) لەلایەکی ترەوە باسی مەترسیی هاوپەیمانێتی حکومـەت‌و ڕۆژنامەگـەری بۆ ئاراستنی ڕای گشتی دەکات‌و دەڵێت ڕەنگە ئەم هاوپەیمانییـە تـیری کوشـندەی تێدا بێت بۆ دیموکراسیی[٦٠٩].

بەڵام لە هەندێك حاڵەتدا پێویست بەو هاوپەیمانییەتە ناکات، بۆ نموونە یەکێك لـە نەریتـەکانی ڕۆژنامەگـەریی ئەمـەریکی –بـەپێی لیـدەرەر– ئەوەیـە کـە زۆربـەی ڕۆژنامەنووسان وتەکانی لێپرسـراوان بـەبێ هیـچ ئیمـتیازێك نـەقڵ دەکـەن، (مـەکارثی)ش سوودی لەم نەریتە وەرگرتبوو بە هۆیەوە سەرکەوتووبوو[٦١٠].

شـێوەیەکی تـری پـەیوەندی نێـوان ڕۆژنامەگـەری‌و حکومـــەت بریتییـــە لـــە سەرلێشێوانی ڕۆژنامـە نووسـان لـەبارەی وتـەکانی وەزیـری دەرەوەی ئەمـەریکا چونکـە نازانن ئایا وەکو ڕۆژنامە نووس حسابیان بۆ دەکات یان دەیـەوێت بەشـداریان بکـات لـە جەنگە دەروونییەکە ... پاشان ڕۆژنامە نووسەکە چی بکات ئەگەر زانی ئەو قسانە درۆن

---

[٦٠٧] سەرچاوەی سەرەوە، ل ١١٨.

[٦٠٨] سەرچاوەی سەرەوە ل ١١٤.

[٦٠٩] هـ. لاسکی، اصول السياسة، ج ١، ل ١٤١.

[٦١٠] ولیام لیدەرەر، أمة من غنم، ل ١١٢.

؟ راستی بڵێتو پڕۆژەکانی وەزیری دەرەوە تێك بدات یان راستی بشارێتەوەو خۆیو گەل بخلەتێنێت ؟"[611].

ئێمەش دەپرسین: ئەی ئەگەر بەراستی هاوپەیمانێتی هەبێت نێوان حکومەتو رۆژنامەگەری ؟ سەرکەوتنی حکومەتی دیکتاتۆری لەم حاڵەتەدا گەورە نییەو سەرکەوتنی گەورە لەو وڵاتەیە کە خەڵکەکە حوکمەکەیان بە دیموکراتی دەزانن‌و خۆیان بەئازاد حساب دەکەن.

# سێیەم- دەزگاکانی راپرسی
# (مؤسسات استطلاع الرأي العام)

لەرۆژئاوادا ژمارەیەکی زۆری دەزگا هەن کە مانگانەو هەفتانە رای خەڵك (یان راستتر: نموونەیەکی هەڵبژاردراوی خەڵك) لەبارەی چەند مەسەلەیەك دەپرسن بەر لە چارەکە سەدەیەك لە ئەمەریکادا زیاتر لەسەد رێکخراوی جۆراو جۆری وا هەبوون. بەپاڵ ژمارەیەکی لەوە زیاتری رێکخراوی راپرسی کە تەنها لەبارەی بازاڕەوە رای خەڵکیان دەپرسی"[612]. تەنها ئەو رێکخراوانەش کە سەر بەکاری بازاڕن ساڵانە(بەپێی سەرژمێرییەکانی پەنجاکانی ئەم سەدەیە)٣٠-٦٠ ملیۆن دۆلاریان سەرف دەکرد"[613].

هەرچەندە زۆر هەن راپرسی بەشتێکی پاش دەزانن بەلام زۆر کەسی تر گومان لە کاری ئەم دەزگایانە دەکەن‌و وای بۆ دەچن کە ئەم دەزگایانە دەستیان هەیە لە رووداوەکاندا. نموونەش لەسەر ئەوە راپرسی لەکاتی هەڵبژاردنەکاندا کەبەر لەوەی سندووقەکانی دەنگدان دابخرێن ئەنجامی راپرسی دەردەچێتو دەڵێت کە پاڵێوراو (أ) ٥١٪ ی دەنگەکانی دەستکەوتووەو ئەوەی تر (ب) ٤٩٪ ی دەنگەکانی بەدەست هێناوە.

---

[611] سەرچاوەی سەرەوە، ل ١١٧.

[612] ستوتزلو جیرلر، استطلاع الرأی العام، ل ٥٣.

[613] رەنی، سیاسة الحکم، ج ١،ل ٣٤٢.

لەم حاڵەتەدا رەخنەگران دەڵێن کە ئاشکرا کردنی ئەم ئەنجامە هانی لایەنگرانی (ب) کە تا ئێستا دەنگیان نەداوە دەدات زوو بچن‌و دەنگ بدەن‌و لایەنگرانی (أ) کە دڵنیا بوون لە ئەنجامەکە لەماڵەوە بمێننەوە .... ئەمەش دەبێتە هۆی گۆڕینی ئەنجامەکەی سەرەوە، هەندێکیش رەخنەیەکی پێچەوانە دەگرن ئەویش ئەوەیە کە لایەنگرانی (ب) سارد دەبنەوەو دەڵێن (ب) هەر سەرناکەوێت بۆیە ناچن بۆ دەنگدان و(ب) بەڕاستی دەدۆڕێت. ئەمەش ئەگەر ئەنجامی راپرسییەکە راست بێت ئەگینا ئەگەر درۆی تێدا بکرێت ئاکامەکە زیاتر جێگای مەترسییە.

مەبەستی ئێمە لەم بەشەدا زیاتر زانینی دەوری راپرسی لە دروستکردنی عەقڵ: شێوەیەکی ئەمەش بریتییە لە چۆنێتیی دارشتنی ئەو پرسیارەی کە ئاراستەی خەڵك دەکرێت، بۆ نموونە ساڵی (١٩٤٠) –کاتی جەنگی دووەمی جیهانی – لە ئەمەریکادا راپرسییەك بە دوو جۆر کرا؛ یەکەمیان ((ئایا لەو بڕوایە دایت کە پێویستە ئەمەریکا لە ئێستا زیاتر کۆمەکی ئینگلتەراو فەرەنسا بدات؟)) رێژەی وەڵامی (بەڵێ) بۆ ئەم پرسیارە ١٣٪ بوو، بەڵام کە هەمان پرسیار رستەی (لەخەباتی ئینگلتەراو فەرەنسا دژی هتلەر)ی بۆ زیاد کرا رێژەکە بەرز بووەوە بۆ ٢٢٪ [٦١٤]، واتە هەرچەندە هەموو کەسێك دەیزانی کە شەڕەکە دژی هتلەرە بەڵام چونکە شێوازی یەکەمی پرسیارەکە ناوی ئەوی تێدا نەبوو رێژەی (بەڵێ) کەمتر بوو. کەواتە شێوازی دارشتنی پرسیارەکە دەوری هەیە لە سەپاندنی وەڵامێکی دیاریکراو.

دەوری گەورەتری راپرسی لەو کاتەدا دەبێت کە ئەو مەسەلەیەی کە جێگەی پرسیارە مەسەلەیەکی نوێ بێت (یان: زەویی نەکێڵراو)[٦١٥] چونکە جەماوەر ئامادەیە هەر رایەك هەبێت وەری بگرێت، ئەمەش بە پێچەوانەی مەسەلە زانراوەکان کە خەڵك رای ئامادەی خۆیان هەیە لەبارەیانەوە.

---

٦١٤- سۆڤی، الرأي العام، ل ٦١-٦٢

٦١٥- شیلەر، المتلاعبون بالعقول، ل ١١٥

ڕەخنەکان لە ڕاپرسی ڕوڕو جگە لەوانەی سەرەوە ئەمانە هەن:

١-ئەو پرسیارەی کە لە خەڵك دەکرێت هەر ئەو پرسیارەیەو بەدیلی نییە (ئەمەش جۆرە ئاڕاستەکردنێکی ئەو کەسەیە کە وەڵام دەداتەوە).

٢-هەندێك حاڵەتی ساختەکاری هەیە.

٣-بۆتە زۆرە ملێ واتە پرسیار لێ کراوەکە ناچار دەبێت وەڵامێکی دیاریکراو بدات.

٤- مەترسییە لەسەر دیموکراسیی

دەوری گەورە تری ڕاپرسیش لەسەر دروستکردنی عەقڵ ئەوەیە کە ڕاپرسییەکە لە ئەسڵدا پرسیارێکە لە نموونەیەکی (عینـة) خەڵکی دەکرێت بەڵام دوایی کەبڵاو دەکرێتەوە کاردەکاتە سەر جەماوەر (یان هیچ نەبێت ئەوانەی ئەنجامەکە دەخوێننەوە یان دەیبیستن)، بۆ نموونە ئەگەر وەڵامی (بەڵێ) لەئەنجامەکەدا ٦٠٪ بێت ئەم ڕێژەیە کاردەکاتە سەر کەسانی تر (بەتایبەتی دوو دڵەکان)و هانیان دەدات کە ئەوانیش هەمان بۆ چوونیان هەبێتو بەم شێوەیە ڕێژەی لایەنگران زیاد دەکات.

جگە لە گومان لە کارەکە گومان لە دەزگاکان هەیە ئەویش چونکە دەزگاکان بە خۆڕایی بەم کارە هەڵناسنو پارەی لەسەر وەردەگرن ئەویش لە بڵاوکراوەکان یان لە دەزگا ئابووریو سیاسیو ئەکادیمییەکان ..... بۆیە پرسیاری ئەوە هەیە کە ئایا ئەم دەزگایانەی ڕاپرسی نیەتی باشیان هەیە؟ ئەگەر ئەو نیەتە پاشەشیان هەبێت ئایا لە پشتیانەوە کۆمەڵێکی شاردراو ناوەستێت[٦١٧]؟

---

بڕوانە سەرچاوەی سەرەوە، ل ١٤٥،١٥٤،١٥٧،١٦٠،٢١٥

ستونزل وجیزار، استطلاع الرای العام، ل ١٥-١٦

# چوارەم — دەزگاکانی راگەیاندن

دەزگاکانی راگەیاندن ئامێرێکن لــە دەســتی حکومــەتو کۆمەڵــەکانی فشــارو سەرمایەدارانو لەدەستی خاوەنەکانی ئەو دەزگایانە خۆیان. هەموو ئەمانەش ئەم دەزگایانە لە دروستکردنی عەقڵدا بەکاردەهێننو باشترین ئەنجامیان دەست دەکەوێت. لێرەشدا تەنها باس خاوەنەکانی دەزگاکان دەکەینو بەم کورتییە:

یەکەم: بەرژەوەندیی یەکەمی خاوەن دەزگاکە (قازانج)ە ویەروالەت وا دەزانین لەبەر ئەو قازانجە ئەو خاوەنە ناچارە هەمیشە خەڵك رازی بکات، واتە ئەوان کاری تێ دەکەن نەك بە پێچەوانەوە. ئەمەش راستە بەڵام بە وورد بوونەوە دەزانین کە کاری ئەو لەسەر جەماوەردا گەورەترە چونکە:

(أ)- بۆ قازانج کردن ناچارە ئعلانــی شــتومەکی بازرگــانیی زۆر دابــەزێنێت. ئیعلانیش کارێکی تێکدەری هەیە لەسەر عەقڵی خەڵك چونکە بیرکردنەوەیان لەکار دەخات[٦١٨]. ئعلانە زۆرەکانیش عەقڵیەتی (استهلاکی) لای خەڵك دروست دەکەنو لە هەندێك حاڵەتدا ئەم عەقڵییەتە دەبێتە نەخۆشی کە پێی دەوترێت نەخۆشیی بازاڕ کردن(ئۆنۆمینیا)و کە زۆربەی نەخۆشەکانی ئافرەتن[٦١٩].

بازاڕ کردن دەکاتە حاڵەتێك کە شێوازی ژیانی خەڵك ئاراستە دەکاتو کاردەکاتە سەر سەرجەم بیروبۆچوونو رەفتارو ئەنجامیان.

(ب)- خاوەن دەزگاکە بەر لە هەموو شتێك سەرمایەدارە، لەوەش زیاتر سەرمایەدارێکی لیبرالییە بەو واتایەی کە دەست تێ وەردانی حکومەتی پێ قبوول نییە لە کارەکانییدا، لەبەر ئەوەش رێگە لە بیرو بۆچوونی ناکۆك بەم بیروبۆچوونە دەگرێت،

---

[٦١٨] بڕوانە، گۆڤاری سۆڤی، الرأي العام، ل ١٤٩-١٥١ لەگەڵ بەراوردێك لەگەڵ ئعلانی جاران.

[٦١٩] بۆ ئەم نە خۆشییە بڕوانە: گۆڤاری قضایا دولیة، ژمارە ٣٦٦، ١٩٩٧/١/٦، ل ٨.

لەوەش زیاتر دەڵکەکەش ناڕاستە دەکات (ڕاستەو خۆ یان نا ڕاستەوخۆ) ڕووەو بیروبۆچوونی سەرمایەداری.

دووەم: جگە لە قازانج ڕەنگە خاوەن دەزگاکە ئایدیۆلۆجیایەکی تایبەتی تری هەبێت (بەپاڵ سەرمایەداری). ڕەنگە لەو بڕوایەدا بێت وڵاتەکەی دەور ببینێت لە جیهاندا هەتا ئەگەر بکاتە ئەوەی بەهێزی سەربازییەوە بچێتە ناو وڵاتان و لەوانەیە بەپێچەوانەوە بڕوای بە سیاسەتی دورە پەرێزە هەبێت.

جوولەکە نموونەیەکن لەسەر ئەو ئایدۆلۆجیایە.. یەکێك لە گەورەترین چالاکیی مێشك شتن لە ڕۆژئاوادا جوولەکە بە پێی هەڵساوە کە گەورەترینیان خورافەتی لەناوبردنی شەش ملیۆن جوولەکە لە لایەن نازییەکانەوەو دەزگاکانی ڕاگەیاندن ئەم خورافەتەیان کردۆتە ڕاستی لای خەڵك.

دەزگاکانی ڕاگەیاندن ئەو چەکە بەکۆمەڵ کوژەیە کە لەیەك ساتدا مێشکی سەدان هەزارو ملیۆنان کەس لەکار دەخات و دەیانسڕێتەوەو عەقڵیەتێك و جۆرە هەست و ئارەزووی تری تێ دەئاخنێت.

لەبەر خرنخیی ئەم دەزگایانەش هەندێك لەو ڕێگایانە باس دەکەین کە لە دروستکردنی عەقڵدا بەکاریان دەهێنن و کە هەندێك جار مەبەستیان ئەو دروستکردنە نییە وەك جا.

١- لەسەرەوەدا باسی دەوری گەورەی ئعلانی بازرگانیمان کردو لێرەدا تەنها ناوی دەهێنین.

٢- ڕۆژنامەکان (کەناڵەکانی تری ڕاگەیاندنیش) هەندێك بیروڕا وەکو هەواڵ بڵاو دەکەنەوە[٢٠]. ئاشکرایە هەواڵ زیاتر کار دەکاتە سەر خەڵك وبەراست و بابەتیی دەزانن و بەپێچەوانەی بیروڕا کە بە ئاشکرایی دەوترێت ئەمەبیروڕایەو خەڵك قبووڵ یان ڕەفزی دەکەن.

---

لیلی و رۆس، منهج السیاسة الامریکیة الداخلیة، ل ١١٦.

٣- پشت گوێ خستنی چەند هەواڵی مەسەلەی دیاریکراو، خەڵکەکەش ناتوانن تەماشای هەموو کەناڵەکانی تەلەفزیۆن بکەن‌و هەموو ڕۆژنامەکان بخوێننەوە تا ڕاستیی مەسەلەکان بزانن[٦٢١]. جێگری کۆنی (ریچارد نیکسۆن)، (س. ئەگنیو) ساڵی١٩٦٩ ئامارەی بۆ مەترسی ئەم هەڵبژاردنی هەواڵەی کردبوو وتبووی کەوا کۆمەڵە کەسێکی کەم لە(٩٠ تا١٨٠)، دەقیقەی هەواڵ (٢٠) دەقیقە هەڵدەبژێرن، ئەوان بڕیار دەدەن چ هەواڵێك بگاتە (٤٠) تا(٥٠) ملیۆن ئەمەریکی[٦٢٢] (ئەوانەی کاتی هەواڵ تەماشای تەلەفزیۆن دەکەن).

٤-ڕێگەی چوارەمی دروستکردنی عەقڵ شێواندنی هەواڵەکانە. (جۆن بێتی)(؟) دەڵێت کە لە کاتی جەنگی دووەمی جیهانیدا بەهەواڵەکانی حەوت وەکالەتی هەواڵدا چووبووەوبەراوردی کردن لەگەڵ هەواڵەکانی ڕۆژنامەکان‌و سەری سوڕما چۆن دەستکاریی ئەو هەواڵانە کرابوو بۆ ئەوەی ڕێك بن لەگەڵ سیاسەتی ڕوژنامەکە یان لەگەڵ بیروبۆچوونی خوێنەران یان لەگەڵ خولستی خاوەن ئعلانەکان یان لەگەڵ بۆچوونی ڕوژنامە نووسەکە[٦٢٣].

٥- شێواندنی ڕاستییە مێژوویییەکان‌و ڕاستییەکانی سەر بەرووداوی هاوچەرخ: یەکێك لە نموونە دووبارەبووەکانی شێواندنی ڕاستییەکان ئەوەیە کە(لیلینثال) باسی دەکات ئەویش ناشیرین کردنی وێنەی عەرەب لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن لە ئەمەریکادا هەروەها جوان کردنی وێنەی ئیسرائیل‌و نووسینی خەیالات لەبارەیەوە. (لیلینثال) دەڵێت: بەم شێوەیەش ((کاریوەی خوڕافەتی دەزگاکانی ڕاگەیاندن چنرا))[٦٢٤].

---

[٦٢١] ئە. شافان، لە مستقبل الدیمقراطیة، ل ٢٤٠ ئەویش باس هەر لە ڕۆژنامە دەکات بەلام ئەمە تەلەفزیۆنیش دەگرێتەوە کە خەڵك پارە دەدەن بە کەناڵەکە بۆ وەرگرتنی بەرنامەکان بۆیە ناتوانن لە کەناڵی زۆردا بەشداری بکەن هەروەها کاتی‌ئەوەیان کەمە کە هەموو کەناڵەکان ببینن.

[٦٢٢] ڕەنی. غزوات السلطة، ل ٤٢.

[٦٢٣] جون بیتی. الستار الحدیدی حول أمریکا. ل ٥٦.

[٦٢٤] ئە. لیلینثال، هکذا یضیع الشرق الاوسط، ل ١٣٩.

یەكێك لە نموونەكان كتێبێك بەناوی (پادشـای پادشـاكان) كـە دوایـی تـر كـرا بـە فلیم. لەم كتێبەدا (هیرۆد)پادشای جوولەكە كە فەرمانی لە خاچدانی مەسـیحی دا(راسـت ئەوەیە لەخاچدانی ئەو كەسەی كە لە مەسیح دەچوو .... ئەصرانییەكان درۆ دەكەن كە دەڵێن مەسیح لـەخاچ درا).... ئـەم پادشـایە وەكـو كابرایـەكی عـەرەب پیشـان درلوە لەكاتی خاچ دانەكەو لەفلیمەكەدا وێنەی چەند كەسێك دەركەوت كە لە عەرەب دەچوون. بۆیـە یـەكێك لەوانـەی شـتیان لـەبارەی ئـەم بەرهەمـەوە نووسـی لـەجیاتی (پادشـای پادشایان) بەرهەمەكەی ناو نابوو درۆی درۆكان[٦٢٤].

٦- (ناوونیشان) هۆیەكی رێگەپێدانە بۆ كاركردن لەسەر جـەماوەر. ناوونیشـانەكە ئـەو شـتە دەگەیـەنێت كـە مەبەسـتی نووسـەرانی هەواڵەكەیـە (یـان بەرهەمێنـەرانی هـەر شتێكی‌تر) لە كاتێكدا هەواڵەكە خۆی شتێكی جیاوازە. (لیدەرەر) دەڵێت: ئێمە وامـان لێ هاتووە ناوونیشانی سـەرەكی بە چیرۆكی تـەواوی مەسـەلەكە بزانـین (واتـە خـەڵك زیـاتر سەرنجی ناوونیشانەكە دەدەن‌و بایەخ بە بابەتەكە نادەن)و دەڵێت كەوا دەقـی بابەتەكـە ئەوەندە سەرنج راكێش نییە كە ببێتە هۆی ئەوەی كەسانێكی زۆرتر رۆژنامەكە بكڕن[٦٢٦]. بەوڵاتایەكی تر بۆ فرۆشتنی ژمارەیەكی زۆرتری رۆژنامەكە ناوونیشانی زەق بـۆ بابـەتێكی ئاسـایی دادەنرێـت، ئەمـەش جگـە لـە دانـانی ناوونیشـانێك بـۆ بابـەتێك كـە لەگـەڵ ئـەو ناوونیشانەدا ناگونجێت، كەواتە بەكورتترین رێگـەو بـە هـۆی ناوونیشـانەوە شـتی زۆر لـە مێشكی خەڵكدا دەچەسپێنرێت.

٧- شـێوەی خوێندنـەوەی بابـەتو هەواڵـەكان لـە تەلـەفزیۆندا: بـۆ نموونـە پێشكەشكەری بەرنامەكە یان هەواڵەكە بەبزۆ جووڵاندنێـك یـان گۆڕینـی شـێوەی دەنگـی

---

[٦٢٤] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٢١٢.

[٦٢٦] بڕوانە: و. و. لیدەرەر، أمة من غنم،ل ١٤٤. خۆش خۆت تاقی بكەرەوەو بزانـە كـە رۆژنامـەو گۆڤـار دەخوێنێتەوەبەزۆری ناونیشانەكان ناخوێنێتەوە. ئەو بێ كارانەش كە هەموو بڵاو كراوەیەك لەبەرگەو بۆ بەرگ دەخوێننەوە زۆر كەمن!

خۆی دەتوانێت گومان بخاتە مێشکی ملیۆنان کەس(کە تەماشای تەلەفزیۆنەکە دەکەن) لەبارەی مەسەلەیەك کە پەیوەندی بە بابەتەکەوە هەیە[٦٢٧].

٨- تەنانەت ڕووناکیو مەکیاج وشتی لەم بابەتە بەکار دەهێنرێت بۆ کارکردن لەسەر جەماوەر. (ڕەنی) نموونەی چاو پێکەوتنی نێوان دوو مونافسی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی ساڵی (١٩٦٠)؛ (جۆن کێنێدی)و(ریچاردنیکسۆن) دەهێنێتەوە کە زۆربەی ئەوانەی سیمینارەکەیان لە تەلەفزیۆندا بینی وایان بڕوا بوو کە کێنێدی سەرکەوتوو بوو، بەڵام زۆربەی ئەوانەی کە لە رادیۆدا سیمینارەکەیان بیست وتیان کە نیکسۆن سەرکەوتوو بوو... هۆی ئەم جیاوازییەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لە تەلەفزیۆندا روناکییەکەی سەر رووی نیکسۆن وجۆری مەکیاجەکە .... تاد بەجۆرێك بوون کە نیکسۆنیان بە ڕوویەکی خەفەتبارو ((بێ ڕەنگ))دەرخست[٦٢٨]. بە شێوەیەکی گشتیش وەسیلە تەکنیکییەکان بۆیان هەیە کار بکەنە سەر عەقڵی خەڵك لە ئاستێکی فراوانتر لە ئاستی نموونەکەی سەرەوە هەروەکو- سینەمای ئەمەریکی کە لە بواری بەکارهێنانی تەکنیکی پێشکەوتوو قەبەو کاریگەر پلەی یەکەمی هێناوەو فلیمەکانی عەقڵییەتێکی خەیاڵییان بۆ خەڵکەکە دروستکردووە.

٩- دروست کردنی عەقڵ لە ئاستی هەواڵو بابەتی(جدی)دا نامێنێتەوە بەڵکو تەنانەت لەبابەتی کات بردنە سەریشدا* پیادە دەکرێت. (شیللەر)دەڵێت گەورەترین فێڵ لە مێژوودا ئەو فیکرەیەیە کە دەڵێت کەوا بابەتی کات بردنە سەر هیچ تایبەتییەکی فێرکردنی تێدا نییەو قسەی مێژووناسی تەلەفزیۆنی ئەمەریکی (ئێریك بارنۆ) دەهێنێتەوە

---

[٦٢٧] بڕوانە ڕەنی، قنوات السلطة، ل ٤٣. ڕەنی باسی گومان دروستکردنی لەبارەی راستگۆیی لیبرسراوێك یان جیکمەتی سیسەتێکی حکومەت دەکات.

[٦٢٨] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٢٣-٢٤.

* وشەکە(ترفیه) ەو لەبەر نەبوونی وشەیەکی بەرامبەری کوردی لەلای خۆم وشەی (کات بردنە سەر) بەکار دەهێنم هەرچەندەبەرامبەری تەولوی وشەکە نییە.

کەوا کات بردنە سەر مەفهومێکی پڕ مەترسییە، فیکرەی خەڵکیش لەبارەیەوە ئەوەیە کە پەیوەندی بە مەسەلە (جدی)یەکانی جیهانەوە نییەو تەنها پڕکردنی سەعاتێکی بە تاڵییە، راستیش ئەوەیە کە ئایدیۆلۆجیایەکی شاردراوە لەناو هەموو چیرۆکە خەیاڵییەکاندا هەیە، چەمکی خەیاڵیش لە چەمکی واقع گرنگترە بۆ دروست کردنی بیرو رای خەڵك[129].

جگە لە بەکارهێنانی کات بردنە سەر بۆ سەپاندنی فیکرەیەکی دیاریکراو، بابەتەکانی کات بردنە سەر کارێکی ترسناکی تریان هەیە ئەویش ئاراستە کردنی مرۆڤە بۆ شێوازێکی دیاریکراوی ژیان ئەویش ژیانی سلبیەت. کاتێك کە کات بردنە سەر ببێتە یەکێك لە بەهاکانی ژیانی میللەت ، ئەوا میللەت کەمتر ئامادەی خەبات دەبێت لە پێناوی ئازادیی و لە پێناوی ئەوەی خۆی خۆی حوکم بکات، کاتبردنە سەریش بەم حسابە دوژمنی دیموکراسیی و ئازادیی و هەر شتێکی ترە کە پێویستە خەڵك دەوری تێدا ببینێت. لە رۆژئاوادا کات بردنە سەرو گەڕان بەدوای خۆشیی ژیاندا بە های سەرەکیی خەڵکەکەیە بۆیە نموونەی سلبیەتی زۆریان لێبەدی دەکرێت.

ئەم رووکردنە بەرەو کات بردنە سەر دەزگاکان هان دەدات (بۆ قازانج) کە ئەمە لەجاران زیاتر بکات. رۆژنامەی ناوداری (واشنتن پۆست) بۆ نموونە شانازیی بەوەی کردبوو کە لە ماوەی پێنج ساڵدا بابەتی سیاسی بەڕێژەی ٧٥٪ تا ٥٠٪ کەم کردۆتەوە ئەویش لە قازانجی لاپەرەکانی رابواردن. رۆژنامەکە دەڵێت: ئێمە (رۆژنامەکە) دوور کەوتینەوە لە سیاسەت و بەم جۆرە ژمارەیەکی زۆرتری خوێنەرانمان دەست کەوت[130]. لە بەریتانیاشدار لە پەنجاکاندا گەورەترین رۆژنامەی بەریتانی لە رووی دابەش کردنەوە کە رۆژنامەی (هەواڵەکانی جیهان)News of the World (کەهی مەردۆخی جوولەکەی ئوستورالیایە) رۆژانە ٦,٧ تا (٨) ملیۆن دانەی لێ دەفرۆشرا ... ئەم رۆژنامەیە هیچ لەبارەی سیاسەتەوە بڵاو ناکاتەوەو بەتایبەتی تەرخان کراوە بۆ ئابڕووچوونە جنسییەکانی چینە بەرزەکانی کۆمەڵگەو بۆ ئاهەنگو موغامەراتی دڵداری[131].

---

[129] هـ. شیللەر، المتلاعبون بالعقول، ل ١٠٤.

[130] محمود المراغی، لە گۆڤاری (العربی)، ژمارە ٤٤٥، ١٢/١٩٩٦، ل٦٠.

[131] گۆڤاری لفاق عربیة، ژمارەی ٦، شوبات، ١٩٧٦، ل ٧٦.

(لیـدرەر) دەڵێـت: خوێنـەران ڕۆژنامـە بـۆ هەواڵـەکانی نـابرووچوونی کەسایەتییەکانی وڵات دەکڕن. هەروەها بۆ شتە سەیرو سەمەرەکانو بۆ هەواڵەکانی کۆمەڵگەو بۆ خوێندنەوەی بەخت و وەرزش بۆ ((ئەو ئامۆژگارییانەی کە پێشکەش بەو کەسە دەکرێن کە خۆشەویستەکەی بەجێی هێشتووە)) و شتی لەم بابەتانە[١٢٢].

١٠- ڕێگەی تر بۆ کارکردنە سەر خەڵك ڕێگەیەکی گرنگی ترە ئەویش بەکارهێنانی وروژاندن (اثارة) ە[١٢٣]. بابەتو ناوونیشان و شێوە و ڕەنگ ... تاد چەند هۆکارێکن بۆ سەرنج ڕاکێشانی خەڵك لە لایەن ڕاگەیاندنەوە، ڕاگەیاندنێکیش ئەگەر هەست و خەیاڵ و ئارەزوو چاوو گوێی خەڵك نەوروژێنێ قازانجەکانی زیاد ناکات.

لە پێناوی ئەم وروژاندنەدا وا پێویست دەکات ڕاستییەکان بخرێنە ئەو لاوە چونکە ڕاستییەکان زۆر جار ((ساردن)) و هەمیشە خزمەتی وروژاندن ناکەن.. بۆیە قسەیەکە لە جێی خۆیەتی کەوا دەزگاکان بایەخ بەشتی وروژێنەر (مثیر) دەدەن نەك بەشتی ڕاست[١٢٤]. بەهۆی شتێکی واشەوە تاوانبار دەکرێتە پاڵەوان چونکە داوا لەو تاوانبارە بەندکراوەکە (بۆ نموونە) دەکرێت کە خۆی وتارێك بۆ ڕۆژنامەکەی بنووسێت کە ئەمە وروژێنەرترە لە وتارێك کە ڕۆژنامە نووسەکە لەبارەی تاوانەکەوە بینووسێت، بەرامبەر ئەم وتارەش ڕۆژنامەکە بەشێکی مەسرەفی دەعواکە دەدات بە تاوانبار[١٢٥].

لە ئەنجامی وروژاندنی بەردەوام دەزگاکانی ڕاگەیاندن جگە لە بەنج کردنی جەماوەر، عەقڵیەتێکی دیاریکراویان بۆ دروست دەکەن و بیروباوەڕی جۆراوجۆر لە مێشکیاندا دەچەسپێنن.

دەزگاکانی ڕاگەیاندنیش بۆ خۆیانو بێ هیچ وروژاندنێك دەزگایەکی سەرنج ڕاکێشنو مرۆڤ ناتوانێت خۆی دوورە پەرێز ڕابگرێت، چەندیش ژمارەی ئەو دەزگایانە زۆرتر بن بە کۆیلەکردنی عەقڵی خەڵك مەحکەمتر دەبێت، ئەمەش پێویستی بە بەشێکی تایبەتە لەم کتێبەماندا ئەویش ئەم بەشەیە کەدێت.

---

١٢٢ لیدەرە، أمة من غنم، ل١٥٦.

١٢٣ (وروژاندن) پێتاوپێت بەرامبەری ووشەی(اثارة)ە بڕوا ناکەین بۆ مەبەستەکەی سەرەوە بەکار هێنرابێت هەرچەندە بۆی دەشێت.

١٢٤ دکتۆرعبداللة الدايم، لە، مستقبل الديمقراطيةومفاهيمها، ل ١٩٢.

١٢٥ بڕوانە، هـ. لاسكي. اصول السياسة، جزء ١، ل ١٦٤-١٦٥.

# لێشاوی ڕاگەیاندن

لە جیهانداو بەتایبەتی لە ڕۆژئاوا بەرهەمی یەکجار زۆری بابەتی ڕاگەیاندن هەیە، هاوڵاتی ڕۆژانە خۆی لەبەردەم ئەم لێشاوەدا دەبینێتو ڕووداوەکانە هەر شوێنێك تەماشا دەکات چواردەوری بەبەرهەمەکانی ڕاگەیاندن تەنراوە. لەناو ئەم قەرەباڵغییەشدا مێشك سڕینو دروست کردنی عەقڵ ئەنجامێکی چاوەڕوان کراوە.

ڕەنگە بوترێت کە ئەم لێشاوە بەسوود بێت چونکە واتای ئەوە دەدات کە کەناڵی زۆری کراوە هەن بۆ ڕادەربڕین هەروەها ڕێگەدانە بەهەموو ڕایەك کە بگاتە جەماوەرو جەماوەر چیتر تووشی مێشك سڕینەوە نەبێت. (شیللەر) لەکەمالێکی وای وتبوو هەر خۆشی وەڵامی دابووەوە. (شیللەر) دەڵێت: ئەگەر میللەتێك (مەبەستی لە ئەمەریکایە).. (٦٧٠٠) ئێزگەی ڕادیۆی هەبێت، هەروەها زیاد لە (٧٠٠) کەناڵی تەلەفزیۆنی و(١٥٠٠) ڕۆژنامەو سەدان گۆڤارو بڵاوکراوەو سینەمایەك ساڵی (٢٠٠) فلیم بەرهەم دەهێنێتو پیشەسازییەکی کتێب بڵاوکردنەوە کە سەرمایەکەی یەك ملیار دۆلارە... ئەو کاتە ئاسانە وا بزانرێت کە ڕاگەیاندنی ناو ئەو میللەتە ڕاگەیاندنێکی هەمە جۆرە (متنوع) بەڵام لە ڕاستیدا ئەم هەمەجۆرییە (لە هەواڵەکانی کەناڵەکانی ڕاگەیاندندا) وجودی نییە ئەویش لەبەر لێکچوونی بەرژەوەندییەکانی خاوەن دەزگاکان، هەروەها چونکە کەناڵەکان لاسایی یەکتر دەکەنەوە [١٢٦]، واتە ئەگەر هەر تەلەفزیۆنێك شتێکی سەرنج ڕاکێش پەخش بکات کەناڵەکانی تر لاسایی دەکەنەوەو لە ئەنجامی ئەمەدا چەند جۆرە بەرهەمێکی لەیەکچوو لە هەواڵو بەرنامە دێتە بەردەم خوێنەرانو بیسەران وبینەران و لێشاوی ڕاگەیاندن لە جیاتی خزمەتکردنی ڕای جۆراوجۆر گۆڕێکی گەورەتر بە دروستکردنی عەقڵ دەدات.

چەند نموونەیەکیش لەبارەی لێشاوی ڕاگەیاندن لێرەدا پێویستن:

لە ڕاپۆرتێکدا لە بارەی ڕۆژنامەگەریی ساڵانی(١٩٤٧-١٩٤٩) ڕۆژنامەکانی بەیانیانی شاری(لەندەن) ڕۆژی زیاد لە (١٥,٥) ملیۆن دانە لە چاپ دەدرا، هەروەها د

---

[١٢٦]. شیللەر. المتلاعبون بالعقول، ل٢٧-٢٨

له (٢,٥) مليۆن له ڕۆژنامەکانی فەیری لەندەن[٦٣٧]. دواییش لە پەنجاکانی ئەم سەدە زانییەدا ڕۆژی (٢٩) مليۆن دانە دەفرۆشران[٦٣٨]، واتە(٥٨٢) دانە بۆ هەر (١٠٠٠) کەس[٦٣٩].

هەرچەندە بەریتانییەکان لە هەموو گەلێکی تر زیاتر ڕۆژنامە دەخوێننەوە[٦٤٠]، بەڵام لێشاوەکە ئەو وڵاتانەش دەگرێتەوە کە بەو ڕادەیە ڕۆژنامە ناخوێننەوە، ئەویش دەخەینەوە یادی خوێنەر کە ئەمە وڵتای ئاستی بەرزی سیاسی نادات چونکە خەڵکەکە بایەخ بە بابەتەکانی کات بردنە سەر دەدەن زیاتر لە لاپەرەکانی سیاسەت.

سینەماش دیسان بەرهەمێکی زۆری هەیە، بەڵام ئەمیان سیفەتێکی جیهانیی هەیە، واتە فلیمی وڵاتێك (بەتایبەتی ئەمەریکا) لە وڵاتانی تریشدا دەبینرێت، لەوەش خراپتر ئەوەیە کە باسەکانی فلیمەکە لە قالبێکی تەمسیلیدا دارێژراون بۆیە کاریان زیاترە لەسەر جەماوەر لەبەر ئەوە یەك فلیم بەرامبەر بە دەیان ڕۆژنامە دەوەستێتەوە. جەماوەری سینەماش لە ئەمەریکاداو بە پێی سەرژمێرییەکی پەنجاکان بریتین لە ٥٠٪ تا٦٠٪ی مرۆڤە (بالغ)ەکانی خەڵکەکە[٦٤١].

بێ گومان تەلەفزیۆن و ڤیدیۆ ئەوەندە کاریان لەسەر سینەما نەکردووە بە بەڵگەی ئەو فلیمانەی کە ئێستا دەهێنرێنە بەرهەم و کە قازانجێکی زۆر دەکەن.

تەلەفزیۆن جەماوەرترین دەزگای ڕاگەیاندنە لەبەر ئەوەش کارێگەرترین دەزگایە. تەلەفزیۆن ئەمڕۆ چۆتە هەموو ماڵێکو بۆتە یەکێك لە ئەندامەکانی خێزان.

ئامارەکانی ئەمەریکا دەڵێن کەوا ساڵی (١٩٥٦) ٧١٪ی ئەمەریکییەکان تەلەفزیۆنیان هەبووە[٦٤٢]. ساڵی(١٩٧٠) ش ڕێژەکە بووە ٩٥٪، لە هەشتاکانیشدا ٩٨٪ی ماڵەکان بەلای کەمەوە یەك ئامێریان هەبووەو نزیکی نیوەیان دوو تەلەفزیۆن یان

---

[٦٣٧] کریم محمد، الدیمقراطیة البریطانیة، ل ١٠٠.

[٦٣٨] دکتور قتیبة الشیخ نوری، اسرار الصحافة البریطانیة، آفاق الربیة، ٦، ل٧٨.

[٦٣٩] سەرچاوەی سەرەوە ل٧٦. سەرژمێری نوێمان لا نییە.

[٦٤٠] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٧٦.

[٦٤١] ڕەنی، سیاسة الحکم، ج ١، ل ٣٢٩.

[٦٤٢] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٣٢٦.

زیاتریان هەبووە، ئەوەندەش تەلەفزیۆن لە ئەمەریکادا هەیە ئەوەندە تەلەفۆن و حەمام و ئاودەستی تێدا نییە[٦٤٣]. زۆربەی منداڵە ئەمەریکیەکان لە تەمەنی سێ مانگییەوە* تەماشای تەلەفزیۆن دەکەن و تا قۆناغی ناوەندی تەولو دەکەن زیاد لە (٢٢) هەزار سەعاتیان سەرف کردووە لەبەردەم تەلەفزیۆندا لە کاتێکدا کەمتر لە (١٢) هەزار سەعاتیان لە قوتابخانەدا سەرف کردووە[٦٤٤]، نموونەیەکی تر گۆڤاری هەفتانەی (دەڵێلی تەلەفزیۆن) کە هەر ژمارەیەکی زیاد لە (١٧,٥) ملیۆن دانەی لێ دەردەچێت[٦٤٥].

ئەوانەی سەرەوە شتێکی کەمن لە نموونەکانی لێشاوی راگەیاندن کە چواردەوری مرۆڤیان داوە. ئەو نموونە کەمانەش بەسن بۆ زانینی کاری ئەم لێشاوە لەسەر بیرکردنەوەو هەستی خەڵک و دەوری گەورەی لە دروستکردنی عەقڵیان.

## رێگەی تر بۆ دروستکردنی عەقڵ

جگە لە رێگاکانی سەرەوە باسی دوو شتی تر دەکەین کە بۆ ئەم مەبەستە بەکار دەهێنرێن:

**یەکەم: هـێزێکی نادیارو نا(شخصی)** هەیە ئەویش ترس لە شتە گوناهەکان. شتە گوناهەکان هێزێکی ئاراستە کردنی مێشکی خەڵکە. (سۆڤی) دەڵێت کەوا لە وڵاتە دیموکراتییەکاندا چەند شتێکی گوناه (محرمات) هەن کە رێگە لە رای گشتی دەگرن کە ئازادانە تەعبیر لە خۆی بکات، بۆ نموونە لە ئەمەریکادا دەتوانرێت وا لە رای گشتی بکرێت رەفزی هەر پرۆژەیەکی نوێ بکات (چەند بچووکیش بێت) هەر ئەوەندە بە ((نا ئەمەریکی)) ناوبنرێت[٦٤٦]. شتە گوناهەکان لە لایەکەوە یەک دەگرنەوە لەگەڵ سنوورەکانی کۆمەڵگە (کە باسمان کردبوون)و چەند هێزێك ئەمانە بۆ مەبەستی

---

[٦٤٣] رەنی، قنوات السلطة، ل ١٥.

* بەم شێوەیە هاتووە ولە(سێ مانگییەوە) ئەمیش رێ تێ دەچێت.

[٦٤٤] سەرچاوەی سەرەوە، ل ١٠.

[٦٤٥] هـ. شیللەر، المتلاعبون بالعقول، ل ١٠٧.

[٦٤٦] لە. سۆڤی، الرأي العام، ل ٢٢.

خۆیان بەکار دەهێنن، لە لایەکی تریشەوە شتی گوناهی تر هەن کە چەند هێزێکی دیاری کراو دروستیان دەکەن و خەڵکی پێ دەترسێنن.

سنوورەکانی کۆمەڵگەش باسی دروستکردنی عەقڵ نایانگرێتەوە چونکە شتەکان هەر هەبوون (مەگەر بەکار بهێنرێن بۆ مەبەستێکی تر) لە کاتێکدا دروستکردنی عەقڵ لەبارنەی شتە گوناهە نوێکاندا باشتر بەدی دەکرێت. نموونەیەکیش لەسەر ئەوە (دژ بە سامیەت) کە بۆچوونێکی ((گوناهە)) لە رۆژناواداو جولەکە دایانهێناوەو بۆ سەرکوت کردنی نەیارەکانیان بەکاری دەهێنن. بەکارهێنانی ئەم زاراوەیەش دژی هەر کەسێك یەکسەر یادی هتلەرو نازییەکان دەهێنێتەوە مێشکی خەڵکەکە.

ئەم جۆرە ترسەش لە شتە گوناهەکان کارێکی زۆرەملێی هەیە، بە پێەوانەی رێگەکانی دیکە کە نەرمتر و شاراوەترن.

**دووەم کاری زانست:** زانستیش لە زۆر رووەوە کارێکی زۆرەملێی هەیە لە چالاکیی دروستکردنی عەقلدا.

زانست بە پێچەوانەی بۆچوونی زۆربەی خەڵك یەکێکە لە هۆکانی لە ناوچوونی ئازادیی. ئەم کارە سلبیەی زانستیش لەسەر ئازادیی فیکرەی سەدە ی بیستە لە کاتێکدا لە سەدەی نۆزدەدا –سەدەی لە خۆ بایی بوونی زانستی– کە تازە زانست هەنگاوە گەورە سەرەتاییەکانی دەناو خەڵك سەرخۆشی دەستکەوتە زانستییە سەرەتاییەکان بوون ئەو فیکرەیە باو بوو کە زانست مرۆڤ زاڵ دەکات بەسەر شروشتداو بەم شێوەیە زانست ئازادیی بە مرۆڤ دەبەخشێت.

زانست دەسەلاتیکی گەورەی بەخشی(لە رێگەی رۆژنامەگەری و سینەماو تەلەفزیۆن... تاد) بەوانەی کە مێشك سرینەوە مەبەستیانە... ئەم دەسەلاتە گەورەیە بووە گەورەترین مەترسی لەسەر ئازادیی عەقڵ[٦١٧]. نووسەری ئەم رستەیەی دوایش ئەم قسەیەی لەسەردەمێکداو تووە کە هێشتا تەلەفزیۆن دروست نەکرابوو وەکو ئێستا نەچووبووە هەموو ماڵێك.

---

[٦١٧] سیریل جود، الحریة في القرن العشرین، ل ٦٥٧.

بیریارانی رۆژئاوا پێشبینیی ئەوەیان کردووە کە زانست لە دوارۆژدا بۆ بە ئامێرکردنی مرۆڤ بەکار بهێنرێت. (ڕەسڵ) پێشبینیی کۆمەڵگەیەکی زانستیی کردبوو کە حکومەتە ئستبدادییەکان تیایدا هەموو دەسکەوتەکانی پزیشکیو دەروونناسی بەکار دەهێنن بۆ ئەوەی خەڵکەکە بکەنە ئامێرێکی گوێڕایەڵ[٦١٨]. هەرنەمەشە بیرۆکەی رۆمانەکەی (جۆرج ئۆروێڵ)ە کە ناوونیشانی (١٩٨٤) ی هەڵگرتووەو رۆمانی (کاتژمێر٢٥)ی (کۆنستانتان جۆرجیۆ).... تاد.

رۆژئاوا هەنگاوی گەورەی لەم ڕێڕەوەدا ناوە بەڵام هێشتا زۆر ماوە تا زانست نەك هەر عەقڵی خەڵکەکە بە تەواوی بشواتەوە بەڵکو گۆڕان بەسەر لە شیشیاندا بهێنێت. زانست چەکێکی بێ لایەنە تا دەکە وێتە دەستی لایەنێك، ئەو لایەنەش بڕیار دەدات بۆ خزمەتی مرۆڤ بەکار بهێنرێت یان بۆ بەکۆیلەکردنی.

---

[٦١٨] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٦٦.

# چارەنووس و دوارۆژی ئازادیی

ئازادیی هەر لەسەرەتاوە رێگەیەکی هەڵەی گرتۆتە بەر، لەیەکەم هەنگاوەیە نەیتوانیوە پێناسەیەکی خۆی بکات، پێناسەیەك کە جێگەی رەزامەندیی هەمووان بێت. رێگەش پڕیووە لەبەربەست تا لە کۆتاییدا لەناو دەریای هێزەکانی ناو کۆمەڵەکەدا ونبووە.

ئازادیی ئەمڕۆ لە چ ئاستێکدایە تا باسی دوا رۆژی بکەین؟ چی لە ئازادیی مرۆڤ ماوەتەوە تا باسی کاری تەکنەلۆجیاو زانستو راگەیاندنو دەسەڵاتی دەوڵەتو هێزە سیاسیو ئابوورییەکان... لە سەر زەوت کردنی ئەو ئازادییە بکەین؟

خەڵك تەماشای رۆژئاوای ((ئەمڕۆ)) دەکەنو دەیکەنە نموونەی ئازادیی. خەڵکەکەش جگە لەوەی کە تەنها سەیری ((رووالەتی ئەمڕۆ)) دەکەنو ناچنە ناو قووڵاییەکەی، هەروەهاو لەوە زیاتر لە ئاستی ئەو ((ئەمڕۆ))یەدا بەنج بوون. خەڵك هەستی مێژوویيان نییەو تێڕوانینیان بۆ دواڕۆژ لاوازە. لەبەر ئەوە قەد بە خەیاڵیاندا نایەت کە ئەم ((ئازادیی)) یە نیشانەیەکی هەرەس هێنانی شارستانییەکە. مێژوو ناسانو خوێنەرانی مێژوو دەبینن چۆن شارستانییە کۆنەکان رووە مردن دەچوون بەڵام ئەو خەڵکەی کە لەناو ئەو شارستانییە کۆنانەدا دەژیان لەمە بێ ئاگا بوون.. مەگەر چەند بیریارێکی ژیریان، وەکو هەندێك لە بیریارانی ئەم سەردەمەی رۆژئاوا... بەڵام نە ئەوان گوێیان لێ گیراوە و نە ئەمانەی ئەمڕۆی رۆژئاوا کاریان هەیە لە سەر خەڵك.

((ئازادیی))یەکەی رۆژئاوا خۆی لە پچڕاندنی هەموو پەیوەستە خێزانیو کۆمەلایەتیو مرۆڤاییەکاندا دەبینێتەوە، ((ئازادیی)) یەکەی رۆژئاوا ناوێکی خەڵەتێنەرە بۆ ژمارەیەك نەخۆشی کە یەکێکیان (خۆ پەرستی) یە.

رۆژئاوای ئەمڕۆ ((پیاوە نەخۆشەکەیە)) کە رووەو مردن دەچێت. رەنگە نەشمرێتو رۆڵەکانی خۆی فریای بکەون... ئەواتا لە نەخۆشترین کۆمەڵگەی رۆژئاواییدا:

((ئەمەریکا)) بزوتنەوەیەکی بەهێز سەری هەڵداوە بۆ گەڕاندنەوەی بەها روحیو ئەخلاقییەکان... ئەگبەتو سەرلێشێواوەکانی لای خۆشمان دەستیان داوەتە تەور بۆ بڕینەوەی درەختی ئەو بەها بەرزانە تا لەگەڵ زەویدا تەختی بکەنو بەوە نەوەستاون کە زۆر لە لقەکانی ئەو درەختەیان وشکو کلۆرکردووە.. ئەوەش بەناوی ئازادیی... کام ئازادیی؟.

ئەو ئازادییە زاڵبوونی ئارەزووی نەفسە، ئەو ئارەزووەی کە باوەڕی جۆراوجۆری تاریکی دادەمەزرێنێت، ئەو ئارەزووەی کە فەرمان بەو قسەو کردارانە دەکات کە هیچ سەرچاوەیەکان نییە غەیری ئارەزوو خۆی؟... ئەمە ئازادیی نییە بەڵکو ناوێکی تری کۆیلێتی.. کۆیلێتی بۆ ئارەزوو.

ئازادیی لای ئێمەی موسڵمانو بەر لەهەموو شتێك خۆ رزگار کردنە لە کۆیلێتی بۆ ئارەزوو، لەم سەرەتاییەشەوە دەتوانین باسی ئازادییەکانی تر بکەین. بناغەکەی ئێمە بریتییە لە ((گەڕانەوە بۆ مرۆڤ)) نەك دارشتنی یاساو پەسەندکردنی دەستوور.. هەرچەندە ئەمانە پێویستن.. بەڵام ئەمانە ئەنجامن نەك هۆ.

بەشێوەیەکی (نظري) هەموو کەسێك باوەڕدار بێت یان بێ باوەڕ دەتوانێت ئازاد بێت ئەگەر زاڵ بێت بەسەر ئارەزووی نەفسی خۆیدا بەڵام ئەمە خەیاڵە چونکە تەنها باوەڕدارە کە رێگەی ئەم زاڵ بوونەی گرتۆتە بەر، تەنانەت ئەویش هەندێك جار لە شتە وردەکاندا مل کەچ دەبێت بۆ ئارەزوو چ جای ئەو کەسەی کە ئەساسەکەی (- بێ باوەڕی) مل کەچییە بۆ ئارەزوو.

کەواتە ئەساسی یەکەمی ئازادیی کۆیلێتییە بۆ خودا، کە من کۆیلەی خودا بم چیتر کۆیلێتی بۆ شتەکانو مرۆڤەکان ناکەم، کۆیلەی تەوژمی کۆمەڵگە نابم چونکە ئەوەی کە ئاینەکەم بەراستی دەزانێت بەراستی دەزانم هەتا ئەگەر خۆشم بەتەنیا بمێنمەوە، کۆیلەی هێزە سیاسیو ئابوورییەکان نابم چونکە سەروەرێکم هەیە لەوان

گەورەتر، کۆیلەی پارە نابم ، کۆیلەی رابواردن، راگەیاندن، بەها ماددییەکان.... کۆیلەی هیچ لەمانە نابم.

ئەی شەیتان؟ دوژمنی یەکەم کە لە یادمان چووە، ئەو بوونەوەرەی کە مرۆڤ تاکە دوژمنێتیو کە بریاری دابوو (ئادەم)ی باوکمانو نەوەکەی لە رێگەی راست دوور بخاتەوە، ئەو بوونەوەرەی کەتا قیامەت دوژمنایەتیی مرۆڤایەتی دەکات... لادان لە رێگەی راست پەرستنی شەیتانە، غەیری ئەو شارستانیانەش کە یەکتاپەرستی (توحید)یان پیادە کردووە... هەموو ئەوانەی تر شارستانیی شەیتان پەرستن.. باسی ئازادیی مرۆڤیش لە ئایینی شەیتان پەرەستندا هیچ نرخێکی نامێنێت.

# بەشی پێنجەم
# دوو بنەمای تری دیموکراسیی
## یەکەم: بنەمای لێك جیاکردنی دەسەڵاتەکان
## (فصل السلطات)
## Seperation of Powers

بنەمای سەرەکیی دووەمی دیموکراسیی ((نوێ))مان – واتە: بنەمای ئازادییە گشتییەکان– کۆتایی پێ هێنا. پێشتریش دوو بنەمای ترمان وەرگرتبوو:(سەروەریی گەل)و (حکومەتی نوێنەرایەتی). دەمێنێتەوە (بەپێی یەکێك لە پۆلێن کردنی بنەماکان) دوو بنەمای تر کە ئەمەیان یەکێکیانە.

بنەمای لێك جیاکردنی دەسەڵاتەکان لای ژمارەیەك لێکۆڵەرەوە یەکێکە لە بنەماکانی دیموکراسیی‌و ئەم بنەمایە بەکورتی‌و وەك باسمان کرد بریتییە لەوەی کە هەموو دەسەڵاتەکان (یاسادانان، بەجێهێنان، قەزا) لەدەستی یەك کەس یان یەك دەزگا نەبێت بەڵکو دابەش بکرێت بەسەر چەند دەزگایەکدا ئەویش زیاتر بەمەبەستی ئەوەی حوکمێکی ئستبدادی Despotic نەیەتە دی کە دەسەڵاتەکان لە دەستی تاکە کەسێك یان کۆمەڵێك کۆبکاتەوە. ئەم بنەمایە گرنگترین داهێنانی لیبرالیەکان بوو[٦١٩] و بەتایبەتی بە ناوی زانای فەرەنسی مۆنتێسکیو Montesquieu (١٦٨٩–١٧٥٥) ناسراوە هەرچەندە پێش ئەو چۆن لۆك Locke ی ئینگلیزی (١٦٣٢–١٧٠٤) باسی کردبوو (بەڵام زیاتر مەبەستی لە قەزا بوو)، هەروەها پێش ئەمان‌و پێش لیبرالیەت ئەفلاتوون(٤٢٨–٣٤٧ پێش زاین)و ئەرستۆ (٣٨٣–٣٢٢ پێش زاین) باسیان لێوە کردبوو.

---

[٦١٩] دکتور عصمت سیف الدولة، الطریق الی الدیمقراطیة..، ل ٤٠٧.

نیزامێك هەیە كە پەیوەندی بەم بنەمایە هەیە ئەویش نیزامی وەستاندنو هاوسەنگی (الصد والتوازن) Check and Balance كە پەیوەندی نێوان دەسەڵاتەكان پیشان دەداتو كە بریتییە لەوەی هەردەسەڵاتێك ئەوەی تر لە شوێنی خۆیدا رابوەستێنێت هەروەها هاوسەنگییەك هەبێت نێوان دەسەڵاتەكان تا هیچیان بەسەر ئەوەی تردا زاڵ نەبێت.

ئەم بنەمایە كە گوایە پارێزەرێكی حوكمی دیموكراتیو ئازادیی تاكەكانە رەخنەی زۆری ئاراستە كراوە. سەرەتا ئەوەیە نەلای مۆنتێسكیوو نەلای لۆك پێناسەی واضان دەست ناكەوێت بۆ دەسەڵات. یەكەمیان هیچ پێناسەیەك نادات، دووەمیشیان مامەڵە لەگەڵ دوو مەفهوومی دژ بەیەكی دەسەڵات دەكات[٦٥٠].

بنەماكەش بۆ خۆیو جگە لە گومانی گەورە لەبارەی راستێتیو سوودەكەیەوە[٦٥١] هەروەها باسی ئاكامە تێكدەرەكانیشی دەكرێت[٦٥٢]. لەم رەخنانەش كە رووكراونەتە ئەم بنەمایە:

**یەكەم:** بنەماكە بەتەواوی لە واقعدا نەچەسپێنراوە[٦٥٣]: ئەوەش كەرووی داوە تێكەڵ بوونی دەسەڵاتەكانە لە بەریتانیاداو لەو وڵاتانەی كە نیزامی بەریتانی (واتە نیزامی پەرلەمانی) دەچەسپێنن هەردوو دەسەڵاتی یاسادانو بەجێهێنان تێكەڵ بوون چونكە دەسەڵاتی بەجێهێنان (-كابینەی حكومەت) لە دەسەڵاتی یاسادانانەوە (-پەرلەمان) دروست دەبێت، هەروەها حكومەت دەست دەخاتە زۆر لەمەسەلەكانی پەرلەمان، وەك دابەزاندنی لیستی یاساكان كە ئەسڵەن كاری پەرلەمانە بەڵام لەم نیزامەدا بۆتە كاری حكومەت، پەرلەمانیش تەنها موناقەشەو مۆری دەكات. لەبەر ئەوە بەو لێك جیاكردنەوەی دەسەڵاتەكان كە لەو نیزامەدا هەیە دەوترێت لێك جیاكردنی

---

[650] Carl J. Friedrich, Separation of Powers, Encycl. of the Social Sciences, Vol. 13, p. 655.

[٦٥١] ئێرنست گریفیث، نظام الحكم في الولایات المتحدة، ل ٨٠.

[٦٥٢] جان-ماری بنوا، لە، المثقفون والدیمقراطیة، ل ٣٤.

[٦٥٣] سەرچاوەی سەرەوە.

لاستيكى (مرن). لـه نيزامى سەرۆكايەتيشدا وەكو (ئەمەريكا) بەلێك جياكردنـەوە كـە دەوترێت لێك جياكردنى رەق(جامد) چونكـە هـەر يەكێك لەدوو دەسـەڵاتەكە بـەجيا هەڵدەبژێردرێت و دەست خستنى هەريەكێكيان لە كارەكانى ئەوەى تر كەمترە.... تاد.

وتمـان ئـەوەى لـە واقعــدا رووى داوە تێكــەڵ بوونــى دەسـەڵاتەكانە نــەك لێــك جياكردنيان، نموونەى نيزامى پەرلەمانيمان ووت، دەمێنێتــەوە نيزامى سـەرۆكايەتى كـە لێك جياكردنەكەى زيـاترەو كـە بـە پێچەوانـەى ئـەم لێك جياكردنـە كـارى دەسـەڵاتەكان تێكەڵ بوون. لە ئەمەريكا هــەندێك بريـارى سـەرۆك پێويستى بـە رەزامـەندىى كۆنگرسـە (وەك دامەزراندنى فەرمانبەرى بەرز، ئەو پەيمانانەى سەرۆك كۆمار لەگـەڵ وڵاتێكـى تـردا مۆرى دەكات). لـە لايـەكى تـرەوە سـەرۆك سـەرنجى كۆنگرس رادەكێشـێت بـۆ هـەندێك مەسەلەى پێويست كە ياسا لەبارەيانەوە دەربچێت، دەسـەڵاتى بەجێهێنان ژمارەيـەكى زۆرى بريارى ئيدارى دەردەكات كە سيفەتى ياسايان هەيە و ژمارەيـان لەوانـەى كۆنگـرس زياترە.. تاد.

دەسەڵاتى ياسـا دانـانيش لـە هـەموو نيزامـەكاندا دەسـت دەخاتـە كـارى قـەزايى چونكە چەند كارێكى دادگايى دەگرێتە ئەستۆى خـۆى وەك دادگـايى كردنـى فەرمانبـەرە گـەورەكان، دەسـەڵاتى بەجێهێنانيش هـەروا كاردەكاتـە سـەر قـەزا بـەوەى كـە زۆر لــە قازييەكان دادەمەزرێنێت. قەزاش بۆ خۆى دەسـت دەخاتـە كـارى دوو بەشـەكەى تـر لـە رێگـەى چـاودێرى كردنـى دەسـتووريەتى ياسـاكانى پەرلـەكان و بريارەكــانى دەســەڵاتى بەجێهێنان....

لە هەموو ئەوانەش گرنگتر بودجەيە كە گرنگترين مەسەلەى دەوڵەتە و كە تايبەتــە بەياسا دانـان بـەلام ئێسـتاو لەبـەر ئـاڵۆزى و فراوانـى بودجـە بەجێـهێنان داى دەنێــت و پێشكەشى دەكات بە پەرلەمان تا ئيمزاى بكات.

لێك جيـاكردنى دەسـەڵاتەكان هۆيەكـە بـۆ دەستنيشـان كردنـى بنيـاتى حكومـى، ئەگەر پەرلەمانى بێت يان سەرۆكايەتى يان جۆرە دەگمەنەكەى تر كـە (جمعيـه) ى پێـى دەوترێت و دەسەڵاتەكان تيايدا بەتەواوەتى تێكەڵن.. بەلام زۆر كەس دەڵێن كە ئـەم لێـك جياكردنـە وەزعـى سياسيى راستەقينە پيشان نـادات ئەگـەر ئەسڵەن پێشتر پيشـانى

دابێت[٦٥٤]. بەڵێ، پۆلێن کردنی کارەکانی حکومەت بۆ یاسادانانو بەجێهێنانو قەزا یەکێکە لە پایەکانیتیۆری سیاسیی ((نوێ)) نیتر ئایا بنەمای لێك جیاکردنەکە وەریگیرێت یان وەرنەگیرێت [٦٥٥]، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانرێت بەشە جۆراو جۆرەکانی چۆنێتی کاری حکومی بچووك بکرێنەوە بۆ ئەم پۆلێن کردنە ساکارە[٦٥٦].

هەرچەندە بە پێی تیۆرکە خۆی لێك جیاکردنی تەولو قەد روو نادات و مۆنتێسکیو خۆی وتبووی کەوا دەسەلاتەکان ناچار دەبن هاوکاریی یەکتر بکەن[٦٥٧]، هەروەها بەپێی واقع پێویستە ئەو هاوکارییەکە هەبێت [٦٥٨]، بەلام ئاشکرایە کە (هاوکاری) شتێکەو (تێکەلاو بوون) شتێکی ترە.

**دووەم:** لەبەر ناواقعیێتی لێك جیاکردنیش، ئەم لێك جیاکردنە عەمەلی نییە. زۆر باسی ئەمەریکا کراوە کە بە هۆی لێك جیاکردنە زۆرەکەیەوە نیزامی حوکم بە شێوەیەکی باش ناڕواتو[٦٥٩] بەشەکانی حکومەت بە هارمۆنیەتەوە (رێكو گونجاوی لەگەڵ یەکتردا) کار ناکەن[٦٦٠].

**سێیەم:** ئەنجامەکەی سەرەوە دەمانگەیێنێتە ئەو راستییەی کە لێك جیاکردن لەگەڵ سەردەمدا ناگونجێت [٦٦١]چونکە لێك جیاکردن مایەی هێواش کردنی کارەکانی حکومەتەو سەردەمیش کاری خێرای دەوێت.

---

[654]J. Meynaud, The Executive in the Modern State, International Social Science Bulletin, Mvol. 10,no. 2, p. 137.
[655]W. J. Shepard, Executive, Op. Cit., p. 680.
[656]Ibid

[٦٥٧] دکتۆر محمد کامل لیلة، النظم السیاسیة، ص٦٠.

[658]J. Meynaud, Op. Cit., p. 173.

[٦٥٩] بروانە بۆ نموونە، مۆریس دیڤرجێ، النظم السیاسیة، ل ١٠١.

[660]John Dickinson, Checks and Balances, Encyl. of the Social Sciences,Vol. 3, p. 364.

[٦٦١] بروانە رۆبێرلۆ دی ماتیی، لە، مستقبل الدیموقراطیة ومفاهیمها، ل ١٧٩.

**چوارەم:** بنەماکە وەکو زەمانەتێك بوو دژیئستبداد بەڵام راستی ئەوەیە کە رێگە لەو ئستبدادە ناگرێت و لە جیاتی ئەوە دەبێتە هۆی ململانەو دوو دڵی[662].

**پێنجەم:** بە پێی(میشال دێبرێ): لێك جیاکردن وجودی نییە چونکە مەسئولیەتی ژیانی کۆمەڵایەتی پارچە پارچە ناکرێت و ئەو دەستوورانەی کە دەسەڵات دەکەنە چەند بەشێك کۆمەڵگە رووەو پشێوی دەبەن[663].

**شەشەم:** لێك جیاکردن هۆیەکە بۆ وون بوونی مەسئولیەت[664]، چونکە هیچ دەزگایەك ناتوانێت بەرپرسیار بێت لەبارەی هەموو شتەکان و لە هەندێك رووداودا بەرپرسیار دیار نابێت.

**حەوتەم:** لە هەمووی گرنگتر بۆ مەبەستی کتێبەکەمان ئەوەیە کە بنەماکە سوودی بۆ حوکمی گەل جێگەی گومانە چونکەوەك(لۆول) دەڵێت بەش کردنی دەسەڵاتی سیاسی بۆ ئەم بەشە بچووکە زۆرانە وا لە هاوڵاتی دەکات کە بایەخ بە هیچیان نەدات و کۆنترۆڵی دەسەڵاتی سیاسی بەجێ بهێڵێت بۆ ئەو سیاسیانەی کە سیاسەت پیشەیانە[665].

بەکورتی ئەم بنەمایە زیاد لە پێویست جێگەی هیوا بووو دوایی دەرکەوت کە ئەم هیوایە لە جێگەی خۆیدا نەبوو.

[662] د. زینكو هاورێکانی، نظام الحکم.. ، ل ١٧.

[663] جان–ماری بنوا، لە، المثقفون والدیمقراطیة، ل ٣٤.

[664] دکتۆر ابراهیم درویش، الدولة.. ، ل ٣١٤.

[665] J. Dickinson, Checks and Balances, Op. Cit., p. 364.

لە ئەمەریکاشدا کە نیزامی (وەستاندن و هاوسەنگی)قبوول کراوە پرسیار کراوە لە لایەن قوتابییە نوێکانی سیاسەت(باسیش لە سییەکانی ئەم سەدەیە) لەبارەی سوودی ئەمە بۆ گەل(هەمان سەرچاوە)، واتە گومانیان هەبووە لەبارەی سوودەکەی بۆ گەل.

# دووەم: بنەمای باڵایی دەستوور
# (مبدأ علو الدستور)

دەوترێت کە هەبوونی نیزامێکی دەستووری مەرجێکەبۆ دیموکراسیی، ئەو دەستوورەش پێویستە باڵا دەست بێت.

باڵایی دەستوور یەکێکە لە ڕووەکانی بنەمای سەروەریی یاسا (سیادة القانون)[٦٦٦]. لەبارەی یاساشەوە کێشەی سەرەکی ئەوەیە کە ئەو کەسەی کە بیەوێت یاسا دەربکات پێویستە بگەڕێتەوە بۆ چیو بۆ کێ، واتە (سەرچاوەی یاسا)چییە.

خودا سەرچاوەی یاسایە لای ئەو کەسانەی بڕوایان بە(یاسای خودایی) هەیە. جگە لە (یاسای خودایی) چەند تیۆرێك هەن لەم بارەیەوەو لەبارەی سەروەریی دەوڵەت و ئەو یاسایەی کە حوکمی دەوڵەت دەکات. یەکێك لە تیۆرە کۆنەکان یاسای سروشتی (القانون الطبيعي)ە کە هەروەها (یاسای عەقڵ) یشی پێ دەوترێتو کە دەڵێت یاسا لە سروشتی شتەکانەوە هەڵدەقوڵێت، هەروەها تیۆری (مافەکانی تاکەکەس) کە دەڵێت مرۆڤ لەگەڵ بوونو هاتنە دنیایەوە مافی بۆ دروست بووە، هەروەها تیۆری سنوور بۆخۆ دانان (التحديد الذاتي للسيادة) کە یاسا بەدەستکردی دەوڵەت دەزانێت بەڵام دەوڵەت بە خواستی خۆی پابەندی دەبێت[٦٦٧].

ڕۆژئاوا سەرچاوەی خودایی‌ی یاسای خستۆتە ئەو لاوە ئەویش لەبەر چەند هۆیەکی مێژوویی بەتایبەتی هەڵوێستی خراپی کەنیسە بەرامبەر لەزانستو حوکمی جەماوەری ... ڕۆژئاواییەکان سەرچاوەی خودایی بە (غەیبی) دەزانن، غەیبیش لای ئەوان واتای نازانستی دەدات. بۆیە لەم بوارەدا ئەو تیۆرانەیان داهێناوە بەڵام بەبێ

---

[٦٦٦] دكتور عبد الحميد المتولي، الوجيز في النظريات ...، ل ٢٨٥.

[٦٦٧] لەبارەی ئەم تیۆرانەو تیۆری تر بڕوانە، دكتور محمد كامل ليلة، النظم السياسية، ل ٢٢٠ بەدواوە.

ئەوەی بزانن کە ئەمانەس هەروا غـەیبین[168]، پاشـان ئەمـەیان زانـیو جگـە لـەوە عـەیبی جۆرلوجۆریان بۆ دەرکەوت.

سەبارەت بە سەرچاوەی دەستوور ئەو پرسیارە خۆی فەرز دەکات:

یاسادانەرەکان پابەندی دەستوورن واتە ئەو یاسایەی کە دەری دەکەن پابـەندی دەستوورەو نارێك نیيە پێی، بە واتایەکی تر دەستوور سەرچاوەی بالآیە بـەلآم ئایا ئـەو کەسانەی کە دەستووری وڵاتەکە دادەنێن پابەندی چین؟[169] لێرەدا پێچە دەورەیـەکمان هەیە:

١- کردارێکی دیاری کراو کردارێکی رەوایە ئەگەر پابەندی یاسا بێت.

٢- یاساکەش رەوایە ئەگەر پابەندی دەستوور بێت.

٣-دەستووریش رەوایە ئەگەر خواستی دانەرەکانی ئەو دەستوورە یـەك بێت لەگەڵ خواستی گەل.

٤- ئـەم دوو خواسـتە کـاتێك هـاوجووتن کـە دانـەرانی دەسـتوورەکە نوێنـــەری خەڵکەکە بن.

٥- بەلآم پێویستە دانەرانی دەستوور بەپێی یاسا نوێنەری خەڵك بن.

٦- دەبێت ئەم یاسایەش پابەندی دەستوور بێت.

بەم شێوەیە گەڕاینەوە خاڵی سەرەتا [170]، یان وەکو دەڵێن ئەنجامەکە سفرە.

بێ گومـان یاسـای خودایـی خـۆی لەبـەردەم هیـچ پێچەبەدەورەیــەکدا نـابینێت چونکە:

١- کردارەکە رەوایە ئەگەر پابەندی یاسا بێت.

---

[168] بەتایبەتی (یاسای سروشتی) و(مافەکانی تاکە کەس) کە سەرچاوەکە دەگەڕێننـەوە بـۆ شـتێك کـە قابلی تاقی کردنەوە نییە.

[169] بڕوانە، دکتور عصمت سیف الدولە، الطریق الی الدیمقراطیة، ل ٢٥.

[170] بڕوانە سەرچاوەی سەرەوە، ل ٩٠.

٢- یاساش ڕەوایە ئەگەر پابەندی دەستوور بێت (یان شەریعەت ئەگەر دەستوور باس لەو مەسەلەیە نەکات).

٣- دەستووریش ڕەوایە ئەگەر پابەندی شەریعەت بێت.

لەم حاڵەشدا دەوەستین‌و ناگەینەوە خاڵی سەرەتا. دیارە عەلمانیەکان بەو سەرچاوە خوداییەی یاسا ڕازی نین.. ئارەزووی خۆیانە بەڵام دەبێت دان بنێن بەدوو شت:

یەکەمیان: تیۆرەکانیان (غەیبی)ن‌و ئەوان غەیبییەت بەعەیبێکی دەزانن لە یاسای خوداییدا.

دووەمیشیان: پێچە بەدەورەی بیرو باوەڕەکانیان‌و خولانەوە بەدەوریدا... بەڵام خۆیان بەوە دەخەڵەتێنن کە بۆچوونەکەیان زانستییە.

***

هەرچەندە جۆرە پیرۆزییەك دراوە بە دەستوور بەڵام ئەم دەستوورە زۆر جار دەبێتە گەمەی دەسەڵاتداران لە کاتی دانان و پەسەندکردنیدا، گەمەی گەورەتریش لە کاتی تەفسیر کردنیدای بەدی دەکرێت.

نموونەیەك لەسەر دانانی دەستوور بەپێی ئارەزووی دانەرانی دەستووری ویلایەتی (ماسا چوسێتس) ی ئەمەریکی (یاسەکەش لەساڵی ١٩٥٠یە) کە ئەو ژن هێنان‌و شوو کردنە بەیاسایی نازانێت کە نێوان کەسێکی سپی‌و کەسێکی ڕەشە، نەك هەر ڕەشیش بەڵکو کەسێکی ((تێکەڵ)) هەروەها کەسێك کە سێیەك (١/٣) یان زیاتری خوێنەکەی ڕەش بێت[٦٧١]. برگەیەکی تری دەستوورەکەش دەڵێت کە هەر کەسێك بڵاوکراوە یان نووسراوی دەستی بڵاو بکاتەوە یان لە چاپ بدات یان دابەشی بکات کە هاندانی خەڵکی تێدا بێت بۆ یەکسانیی کۆمەڵایەتی یان ژن خواستنی نێوان سپی‌و ڕەش ... ئەو کەسە کارێکی بەئەنجام داوە کە یاسا سزای دەدات بە جزا(غرامة) کە لە پێنج سەد دۆلار زیاتر

---

[٦٧١] ئەلبێرت کان، الخيانة العظمى، ج٣، ل١٣٢. بەڵام لە وەرگێڕانێکی کوردی ئەم کتێبەدا بەناونیشانی(مصرع الديمقراطية في العالم الجديد) وترلوە (یەك لەسەر هەشت) ...(ل ١٢٢) ناشزانین کامیان ڕاستە.

نەبێت یان بەند کردن بۆ ماوەیەك كە لە شەش مانگ زیاتر نەبێت یان هەردوو سزاكە پێكەوە[172]. نموونەیەکی ترمان نوێترە ئەویش دەستووری تورکیا کە مەرجی پاراستنی نیزامی عەلمانی (یان راستتر: ئایینی عەلمانیی)ی تێدایەو کە خواستی دەستەیەکی عەلمانیی فەرمانڕەوایە.

لەبارەی تەفسیر کردنی دەستووریشەوە نموونەی زۆر هەیە بۆ نەمانی قودسیەتیەکەی. دەستوور باس لەمەسەلە گشتییەکان دەکاتو زۆربەی هەرە زۆری شتەکانی جێهێشتووە بۆ قازیەکان تا بڕیار بدەن دەستوورین یان نەء. سەرۆکی قازییەکانی ئەمەریکا (هیوز) بەڕاشکاوی وتبووی: ئێمە پابەندی دەستوورین بەلام دەستوور ئەو شتەیە کە قازییەکان بڕیاری لەسەر دەدەن... دواییش ئەم قسەیەی (هیوز) بەفراوانی کەوتە بەکار هاتن[173]

نموونەیەك لەسەر تەفسیرکردنی دەستوور چاك کردنی پێنجەمی دەستووری ئەمەریکییە کە بێ بەشکردنی هەر کەسێك لەژیان یان ئازادیی یان سامانی خۆی لە لایەن حکومەتی هەر ویلایەتێکی ئەمەریکی قەدەغە دەکات، مەگەر بەپێی یاسا... بەلام ئەم (بەپێی یاسا)یەش دەگەڕێتەوە بۆ قازییەکەو ئەو بڕیاری لەسەر دەدات[174]

جگە لەم تەفسیر کردنەش چەسپاندنی دەستوور تەگەرەی تێ دەخرێت لەلایەن بەهێزەکانەوە، بۆ نموونە چاك کردنی ژمارە(١٥)ی دەستووری ئەمەریکی رێگە دەگرێت لە بێ بەش کردنی هاوڵاتی لەدەنگدان بە هۆی رەگەز یان رەنگ.. بەلام ئەمە لە زۆر حاڵەتدا جێ بە جێ نەکرابووو چەندین کۆسپ خرابوونە بەردەم دەنگدانی رەشپێستەکان بەتایبەتی لە ویلایەتەکانی باشووردا[175]. بۆ نموونە ساڵی(١٩٦١) لەو ویلایەتانەداو لە

---

[172] سەرچاوەی سەرەوە.

[173] ه. زینكو ماوریکانی، نظام الحکم...، ل ٤٥.

[174] سەرچاوەی سەرەوە، ل ١٠٤.

[175] بڕوانە سەرچاوەی سەرەوە، ل ١١٥-١١٦، هەروەها لبقی و پۆش، منهج السیاسة.. ، ل ١٣٦-١٣٩.

کوێ زیاتر له سێ ملیۆن و حەوت سەد هەزار کەس کە بۆیان هـەبوو دەنـگ بـدەن تەنـها شتێك لە یەك ملیۆن زیاتر ناویان بۆ دەنگدان نووسرابوو[176].

لە دوو ناوچەی (وێبستەر) و(بەیکەر) ڕەشپێستەکان زۆرینەی خـەڵك بـوون بـەڵام هیچیان لە لیستەکانی دەنگداندا نە نووسرابوون، لە ناوچەی تریشدا ئەوان زۆرینەن بەڵام تەنها ٣٪ی ئەوانەی کە مافیان هەیە ناویان نووسرابوو[177].

ئـەنجامی ئـەم موناقەشـە کورتـەش ئەوەیـە کـە دەسـتوور ئـەو شـتە نییـە کـە ئومێدیکی گەورەی لەسەر بینا بکرێت و تا باروبۆخی سیاسی و ئابوریی وڵات چاك نەکرێت دەستوور بۆ بەرژەوەندیی هێزە سیاسی و ئابوورییەکان دادەنرێت، یان بەلای کەمەوە لە پێناوی ئەو بەرژەوەندییەدا تەفسیری دەکرێت و لەکاتی پێویستیشدا پشتگوێ دەخرێـت. باس کردنی هەر وڵاتێکیش وەك وڵاتێکی دەستووری خۆ گێـل کردنـە لـە دەسـەڵاتی ئـەو هێزانە.

***

ئەگەر دەستووریەتیش بکەینە مەرجی دیموکراسیی، ئـەوا دیموکراسـی دەکەوێتـە بەر ڕەخنەو چونکە لەم لایەنەوە جیاوازی نابێت لە گەڵ نـیزامێکی نـا دیموکراتـی ئەگـەر دەستوورەکەی لەلایەن خەڵکەوە پەسەند کرابێت. حاڵەتـە هـەر خراپەکـەش ئەوەیـە کـە خەڵکی ئەو وڵاتە دەستوورێك پەسەند بکەن کەهەموو دەسەڵاتەکان بدرێن بە یەك کەس و چیـتر هـەڵبژاردن نـەکرێت و حزبـەکان قەدەغـە بکرێـن... دەسـتوورێکی وەهـاش دەستوورێکی دیموکراتییە چونکە ڕەزامەندیی گەل لەسەر بووو تەعبیر یکە لە ((حوکمـی گەل)). بەڵام ئێمە ئەم ناڕەحەتییـە ناکەینـە تووشـی ((دیموکراسیخوازان)) و ئـەو رایـە دەهێنینەوە کە دەڵێت: دەستووریەت و دیموکراسیی لە ڕووی تیۆرەوە جیاوازان بەڵام لـە ڕووی عەمەلییـەوە نزیکـن لـە یـەك[178]... واتـە (بـاڵایی دەسـتوور) – یـان لای هـەندێك: سەروەریی یاسا – چیتر بە بنەمایەکی دیموکراسیی نەزانین و بیخەینە پـاڵ بنـەمای (لێك جیاکردنی دەسەڵاتەکان) کە ئەویش هەروا بەرگەی پێشبڕکێکەی نەگرت.

---

[176] لیلی و رۆش... ، ل ١٢٥–١٣٦.

[177] سەرچاوەی سەرەوە، ل ١٣٨.

[178] رەنی، سیاسة الحکم، ج١، ل ٢٧٥.

# کۆتایی باسی بنەماکانی دیموکراسیی

بەم شێوەیە لە (تصفیات نهائیة)دا -بەزمانی تۆپی پێ- تەنها بنەماکانی (سەروەریی گەل)و (حکومەتی نوێنەرایەتی) و(ئازادیی) دەمێننەوە بەلام پێشتر سەلمێندرا کە (نوێنەرایەتی) چەند پەیوەندی بە ((حوکمی گەل))ەوە هەیە، هەروەها زانیمان چۆن (ئازادیی) لەسەرەتا لەگەڵ ((حوکمی گەل))دا ناڕێکە.. کەواتە لە (تصفیات)دا تەنها (سەروەریی گەل) دەمێنێتەوە، بەلام هەر ئەو بنەمایەش بوو کە یەکەم بنەما بوو حەقیقەتی دەربکەوێت.

چی دەمێنێتەوە لە باسی دیموکراسیی؟

چەند باسێکی ترمان ماوە ئەگەر خوێنەر بە ئارام بێت.

# بەشی شەشەم
# چەند بابەتێکی تری دیموکراسیی
## یەکەم: سەربەخۆیی‌ی قەزا

وتمان مەبەستی (لێك جیاكردنی دەسەڵاتەكان) پاراستنی ئازادییەكان بوو بەڵام راستی ئەوەیە كە مسۆگەر كردنی مافو ئازادیی هاوڵاتیان دەگەڕێتەوە بۆ سەربەخۆیی‌ی قەزا نەك بۆ لێك جیاكردنی دەسەڵاتەكان[٦٧٩]. بەڵام قەزا لە زۆر حاڵەتدا سەربەخۆ نییە، بەڵگەش زۆرن:

قسەكەی سەرەوە لەبارەی پەیوەندیی مافو ئازادیی هاوڵاتی بەسەربەخۆیی‌ی قەزاوە قسەی چەند كەسێكە، كە یەكێكیان (لاسكی) یەو كە لەگەڵ ئەوشدا دەڵێت كەوا هەموو دەسەڵاتێكی قەزایی دەسەڵاتی بەجێهێنان دای دامەزرێنێت بۆیە كەم جار قەزا بەتەواوەتی سەربەخۆ دەبێت[٦٨٠]. دەشڵێت كە دامەزراندنی قازییەكان حزبایەتیی تێدا هەیەو نموونەش لەسەر ئەوە دەهێنێتەوە[٦٨١]. ئەگەر لەلایەكی تریشەوە قازیەكان لە لایەن دەسەڵاتی بەجێهێنانەوە دانەمەزرێنرێنو لە جیاتی ئەوە خەڵك هەڵیانبژێرێت وەك هەندێك ویلایەتی ئەمەریكی ئەوا وەزعەكە باشتر نابێت بەڵكو بەپێچەوانەوە؛ هەڵبژاردنی قازییەكان خراپترین رێگەیە[٦٨٢].

لە ئەمەریكاداو جگە لە دەسەڵاتی بەجێهێنان، ئەندامانی ئەنجومەنی پیرانو رێكخراوە حزبییەكانی دوو حزبە گەورەكە دەستیان لە دەستنیشان كردنی قازییە

---

[٦٧٩] هـ. لاسكی، اصول السیاسة، ج١، ل ١٦٦، هەروەها م. دیفرجێ، النظم السیاسیة، ل٨١، هەروەها:
H. Laski, Liberty, Op. Cit., p. 446. :

[٦٨٠] هـ. لاسكی. سەرچاوەی سەرەوە.

[٦٨١] سەرچاوەی سەرەوە، ج٤، ل١٤١.

[٦٨٢] سەرچاوەی سەرەوە، ل ١٣٨.

فیدرالییەکان هەیەو دەشێت قازییەکان لێنەهاتووبن.. ئەمە لەسەر ئاستی حکومەتی مەرکەزی، لە ویلایەتەکانیشدا وەزعەکە خراپترە[682].

هۆی دامەزراندنی قازییەکەش هاوڕێتی و حزبایەتییە. ساڵی (1885) 90٪ ی قازیە فیدرالییەکان ئەندام بوون لە حزبەکەی سەرۆك کۆمارو لە زۆربەی حاڵەتەکاندا ئەندامی کارا بوون[684]. ساڵی (1885) ویلسن دەیووت کەوا تەنها لەماوەیەکی کورتدا بڕیارەکانی قەزای فیدرالی دژ بە بنەماکانی حزبی فەرمانڕەوا بوون[685].

زانیمان کەوا دەسەڵاتی قەزا پەلی هاویشتووە بۆ بوارەکانی تر.

ئەم دەست تێ وەردانەش بەزۆری لەبەر بەرژەوەندیی تیزلمی سیاسیو ئابووری وڵاتەکەیە. لە ئەمەریکادا هەڵوێستی ئەو کەسەی کە پاڵێوراوە بۆ وەزیفەیەکی قەزایی لەبارەی مەسەلە سیاسیو ئابوورییەکانەوە گەورەترین ئەهەمیەتی هەیە بۆ دامەزراندنی[686]. واتە بۆ نموونە و بەر لە هەموو شتێك نابێت دژ بە سەرمایەداری و بەرژەوەندیی سەرمایەداران بوەستێت.

سەرۆك (فرانکلین رووز ڤێلت) کە بنەمای ڕێککەوتنی نوێ New Dealی هێنایە کایەوە بەمەبەستی دابەشکردنی ... دانپەروەری بۆ چینە هەژارەکان.. تووشی کێشە بوو لەگەڵ کۆمپانیاکاندا، دادگای باڵای ئەمەریکیش لایەنی کۆمپانیاکانی گرت و بڕیارێکی رووز ڤێلتی رەت کردەوە کە لە بارەی دەست نیشان کردنی سەعاتەکانی کاری کرێکاران و لەبارەی کرێکارانەوە بەگشتی بوو.

رێگەی سەرەکیی دادگا لەم مەسەلانەدا تەفسیر کردنی دەستوورە، بێ گومان تەفسیر کردنی بەو شێوەیەی کە هێزەکانی وڵات مەبەستیانەو کە بە شێوەیەکی سەرەکی بریتین لە هێزە ئابوورییەکانو بەرادەیەکی کەمتر کۆمەڵەکانی فشار.

---

[682] تێرینست گرینیت، نظام الحکم في الولایات المتحدة، ل ١٥٤.

[684] ئۆ. رەنی، سیاسة الحکم، ج٢، ل٢٣٩(بەپێی جاك پێلتاسۆن)

[685] W. Wilson , CongressionalGovernment, p. 45.

[686] هـ. لاسکی، الدولة...، ل ١٨٨.

هۆكانی تری تەفسیر كردنی دەستووریش حزبەكانە كە گۆڕانـی هێزی نێـوان ئـەو حزبانە گۆڕانكاری بەسەر تەفسیرەكانی دادگای باڵای هێناوە هەرچەندە ئەم گۆڕانە خـاو بوو[٦٨٧].

لەفەرەنساشداو بەر لەسەدەیەك باسی ستەمكاریی قازییەكان كراوە ئـەویش چونكە قەزا تاكە دەسەلاتە كە چاودێریی لەسەر نییە[٦٨٨]، ئەمڕۆش رەفتارەكانیان باشـتر نەبووە چونكە بەپێی سەرچاوەیەكی سەرەتای حەفتاكانی ئەم سەدەیە باسـی رەخنـەی زۆرینەی خەڵك لە كارەكانی قەزا كراوە[٦٨٩].

# دووەم: نهێنی لە حوكمدا

یەكێك لەو دیاردانەی كە لە هەموو جۆرەكـانی حوكمدا هەیەو لـە زیـاد بووندایە، دیاردەی نهێنییە (السریە)، واتـە دەزگاكـانی حكومـەت بەشێكی كارەكانیـان بـە نـهێنی دەهێڵنەوە. خەڵك وا دەزانن كە نهێنی تەنها لە كاری (موخابـەرات) دا هەیـە لـە كـاتێكدا ئەم نهێنییە سەرجەم دەزگاكانی حكومەت دەگرێتەوە.

نهێنی هەر هەبووە بەڵام لەم سـەردەمەدا لـە زیـاد بووندایـە، دوو هـۆش هـەن لـە پشتی ئەمەوە:

١– گەورەبوونی ململانەی جیهانی: دیارە كە لە حاڵەتی ململانەدا ئەو لایەنەی كە كارەكانی ئاشكران زیاتر خۆی تووشی شكست هێنان دەكات.

٢– گەورە بوونی دەسەلاتی كەمایەتی: چونكە ئاشكرابوونی كارەكانی كەمایـەتی زیان بەدەسەلاتەكانیانو بە خواستی زیاد كردنی ئەو دەسەلاتانە دەگەیەنێت.

---

[687] W. Wilson, Op. Cit, p. 45.

[٦٨٨] گوستاف لوبۆن، روح الجماعات، ل ١٥٧ پەراوێز.

[٦٨٩] ستوتزلو جیرار، استطلاع الرأی العام، ل ٢١٦.

دەتوانین هۆیەکی سەرەکیی تریش بلێین ئەویش سلبیەتی جەماوەر کە پێشتر باسمان کردبووو کە ڕێگە بۆ بەردەوام بوونی ئەم نهێنییە خۆش دەکات. لەناو ئاستەکانی کاری نهێنیشدا تەنها دوو ئاست دەلێن (پەرلەمان)و (دەسەلاتی بەجێبهێنان) وباس لە (موخابەرات) ناکەین کە هەموو دەزانین چەند بە نهێنی کار دەکات:

١- نهێنی لە پەرلەماندا: باسمان کرد چۆن زۆربەی کۆبووەکانی لیژنەکانی پەرلەمان نهێنین‌و ئەوان کاری ڕاستەقینەی پەرلەمان دەکەن. خەلکیش بەچەند ڕووالەتێك دەخەلەتێنن وەکو ڕێگە دان بە هەموو هاولاتیان کە ئامادەی کۆبوونەوەکانی پەرلەمان بن، یان لە هەندێك لە ولاتدا، پەخش کردنی موناقەشاتی پەرلەمان لە تەلەفزیۆندا.

٢- نهێنی کارەکانی دەسەلاتی بەجێبهێنان: ئەم دەسەلاتەش بەشی گەورەی نهێنی لە دەزگاکانی دەولەتدا پیادە دەکات، (شیپارد)سێ تایبەتی لە سەرجەم کاری بەجێهێنان دەژمێرێت کە ئەم سێ کارە جێگەی رەغبەتن‌و کە یەکێکیان ئەوەیە((هەندێك جار نهێنی لە کارکردندا)) [690].

یەکێك لە بوارەکانی نهێنی لایەنی ئابووری‌و دارایی‌یە. (لیدەرەر) دەلێت کە لە ئەمەریکادا ڕێگە نادرێت هاولاتیان تەماشای دەفتەرەکانی مەسرەفی حکومەت بکەن، هەروەها دەفتەرەکانی شارەکان‌و ناوچەکان‌و حکومەتی ویلایەتەکان لە هەموو ئەمەریکادا [691]، ئەمەش هەرچەندە ئەو مەسرەفانە بەو پارەیە دەکرێن کە لە هاولاتیان دەسەندرێت ئەویش لە ڕێگەی باجەوە. واتە هاولاتی کە باج بە حکومەت دەدات (باجی ئەو ولاتانەش زۆرترین لە ژمارەو گەورەترین لەقەبارە) بۆی نییە بزانێت پارەی ئەو باجە لە چیدا سەرف دەکرێت.

بوارێکی گرنگی تری نهێنی بواری پەیوەندییەکانی دەرەوەیە کە بوونەتە کارە تایبەتییەکەی فەرمانڕەوایان‌و بەشێوەیەکی گشتیش کاری چینی سیاسی [692].

---

(690)W. J. Shepard. Executive. Op. Cit. p. 683.

[691] ولیام لیدەرەر، أمة من غنم، ل١٩.

[692] شارل رۆر گبیب، لە المثقفون والدیمقراطیة، ل١١٦.

بێ گومان لە جیهانێك کە یاسای(مانەوە بۆ هێز) دەچەسپێنێت کاروباری دەرەوە لای دەسەڵاتداران لەوە گرنگترە کە بیخەنە بەردەم گەل لە پێناوی بەدی هێنانی دیموکراسییدا.

لایەنێکی گرنگتر لایەنی سەربازییە. کەسیش نکوڵی لە گرنگیتیی نهێنی لەم بوارەدا ناکات بەڵام بەناوی ئەم گرنگیتییەوە نهێنی ئەو مەسەلانەشی گرتۆتەوە کە ئاشکرابوونیان پێویستە.

ئەفسەرێکی گەورەی ئەمەریکی کتێبێکی بڵاو کردبووەوە بە ناوونیشانی (لە پشت دەرگا داخراوەکاندا)و تیایدا باسی بەرنامەیەکی سەربازی دەکات کە ئەمەریکا لەسەری دەڕۆشتو پێشە ولیان دەیانزانی هەڵەیەو ویەبێ ئەوەی ئەم راستییە بۆ گەل ئاشکرا بکەن [٦٩٣]. ئەمەش لە سییەکانی ئەم سەدەیە، بەڵام لەو کاتەوە لایەنی سەربازی لە گەشەسەندندایەو نهێنی بەهەمان ئەندازەو رەنگە زیاتریش لە گەڵیگدا گەشەندەی سەندووە.

لایەنی سەربازیش هۆیەکی گەورەو سەرەکییە بۆ پەل هاویشتنی نهێنی بۆ بوارەکانی تری کاری دەوڵەت. (لیدەرەر) باسی ئەو شاڵاوە ترسە دەکات کە لە پاش دروستکردنی بۆمبای ئەتۆمی سەری هەڵدا، شاڵاوێکی ترس لە پێناوی نهێنیدا ئەوەکو رووسەکان بەو دەسکەوتە بزانن، لەوە بەدواش وشەی

((نهێنی)) لەسەر هەوو شتێکدا دەنووسرا. نهێنیش بەم جۆرە وا لای حکومەت تەشەنەی کرد کە هاوڵاتی چیتر ((نەیدەزانی ئەم بیرۆکراتانە چی دەکەن.. ج جای ئەوەی بتوانێت کۆنترۆڵیان بکات)) [٦٩٤].

وەنەبێت زانیاری لە هاوڵاتیان بە تەنیا بشاردرێتەوە (تازە حسابی ئەوان تەواو بوو) بەڵکو تەنانەت لە لێپرسراوانیش دەشاردرێنەوە.

هەر بەپێی (لیدەرەر) راپۆرتەکان لەبارەی بەرنامەکانی ئەمەریکا لە جیهاندا بەمافی دەسەڵاتی بەجێهێنان دەزانرێن بۆیە تەنانەت کۆنگرسیش ناتوانێت تەماشایان

---

[٦٩٣] جۆن بیتی (و)، الستار الحدیدي حول أمریکا، ل ١٠٠.

[٦٩٤] ولیام لیدەرەر، أمة من غنم، ل ١٠٥.

بکات[٦٩٥]، هەمان شتیش بۆ ئەو راپۆرتانە کە کارەکانی ئەمەریکا لە جیهاندا هەڵدەسەنگێنن بە تایبەتی ئەگەر ئەو راپۆرتانە مەترسییەك یاخود سەر نەکەوتنێك پیشان بدەن[٦٩٦]. ئیحتکارکردنی زانیارییەکان لەلایەن دەسەڵاتی بە جیهێنانەوەو شاردنەوەی زانیارییەکان لە کۆنگرس کۆنگرسی رۆژ لە دوای رۆژ بێ تواناتر کردووە بۆ دەست کەوتنی ئەو زانیاریانەی کە بۆ کارەکانی خۆی زۆر گرنگن[٦٩٧].

بەڵام دەسەڵاتی بەجێهێنان زانیاری تەنانەت لەسەرۆکی ئەو دەسەڵاتە (واتە سەرۆکی ئەمەریکی) دەشارێتەوە بۆ نموونە سەرۆك هاری ترومان (کە ١٩٤٥ تا١٩٥٣ سەرۆك بووە) ژمارەیەك شتی نەدەزانی لەبارەی سیاسەتی دەرەوەی ئەو وڵاتەی کە ئەو سەرۆکی بوو، ئەوانەش کە دەستیان گرتبوو بەسەر کارەکانی سەرۆکایەتیو وەزارەتی دەرەوەدا زانیارییە گرنگەکانیان لێ دەشاردەوە[٦٩٨]. بەر لە ترومانیش سەرۆك (رووز فێلت) بۆ کورەکەی خۆی باس کردبوو کە چەند تووشی زەحمەت دەبێت تا لە رێگەی زۆرزانەکانی وەزارەتی دەرەوە بگاتە راستییەکان[٦٩٩].

نهێنی لە کاری حکومیدا دیاردەیەکی تایبەت نییە بەجێهێنان ئەمەریکا بەڵکو دیاردەیەکە لە رۆژئاوادا[٧٠٠] هەیە... ناشڵێین سەرجەم جیهان چونکە نهێنی لە کاری حکومەتەکانی وڵاتە ((دواکەوتووەکاندا)) شتێکی زانراوە، لێرەشدا مەبەستمان لە جیهانی ((پێشکەوتوو)) ی دیموکراتی کە تیایدا گەل((خۆی حوکمی خۆی دەکات))!.

ئەگەر بشپرسین: دەوری راگەیاندنو ئازادیی قسەکردن چییە؟ پێویستە بگەڕێینەوە بۆ باسی (سنوورەکانی ئازادیی)و (سنوورەکانی راگەیاندن).. ئەمەش ناکەینو لە جیاتی ئەوە یەك دوو قسە لەم بارەیەوە دەهێنینەوە.

---

[٦٩٥] سەرچاوەی سەرەوە، ل١٠٧-١٠٨.

[٦٩٦] سەرچاوەی سەرەوە، ل١٢٨. ؟

[٦٩٧] هـ. شیللەر، المتلاعبون بالعقول، ل٦٨، هەروەها بڕوانە ل٧٢-٧٣.

[٦٩٨] جلن بیتی، الستار الحدیدي ....، ل ٦٥.

[٦٩٩] سەرچاوەی سەرەوە.

[٧٠٠] بڕوانە نموونەیەکی بەریتانی لە: ئێرنست گریفیث، نظام الحکم في الولایات المتحدة، ل٦٤.

(لیڤی ورۆش) دەڵێن کەوا هەرچەندە دەزگاکانی راگەیاندن باسی چالاکییە حکومییەکان دەکەن بەڵام ئەمە شتێکی ئیعتیراف پێ کراوە کە گرنگترین وپڕ مەترسیترین کاری حکومەت دوور لە چاوی جەماوەر بەئەنجام دەهێنرێت [701]. (ئۆستن رەنی)ش لە بارەی تەلەفزیۆن بە تایبەتی دەڵێت کە دەزگاکانی راگەیاندن ئابڕووچوونەکانی بیروکراتەکان بڵاو دەکەنەوە بەڵام ململانە هەر زۆرەکانو هەرە ناڵۆزو گرنگەکانی نێوان بیروکراتەکان لەبارەی مەسەلە سیاسییەکانەوە وەکو نەزانراو وان لە لایەن جەماوەری تەلەفزیۆن [702].

ئەمەش هەمووی لە ئاستی حکومیدایە، ئەگەر ئاوڕێکیش لە کاری هێزەکانی تر بدەینەوە (کۆمەڵکانی فشار، هێزە ئابووریەکان،...) نهێنییەکان گەورەترو گەورەتر دێنە بەرچاو چونکە ئەم هێزانە زیاتر پێویستیان بەنهێنییە.

لەناو گێژاوی کاری نهێنیشدا دیموکراسیی، حوکمی گەل، هیچ واتایەکی نامێنێتو تەنها توێکڵەکەی دەمێنێتەوە.

---

[701] بڕوانە؛ لیڤی ورۆش، منهج السياسة الامريكية الداخلية، ل ١٢٤.

[702] بڕوانە، قنوات السلطة، ل١٧٣

# سێیەم: دیموکراسیی و پەروەردە

زۆر لەبارەی گرنگێتیی پەروەردە بۆ دیموکراسیی وتراوە. پەروەردەو فێرکردن لەم بوارەدا بریتین لە رۆشنبیرکردنی هاولاتیان و بەرزکردنی ئاستی رەوشتە. (جۆن دیووی)ی ئەمەریکی دیموکراسیی نەك تەنها وەك شێوەیەکی حوکم تەماشا دەکات بەڵکو هەروەها وەك شێوازێکی ژیانی کۆمەڵگەش بۆیە پەروەردەی بە پێویست زانیوە بۆ سەرکەوتنی حکومەتێك کە لەسەر ئەساسی دەنگدانی گشتیدا دامەزراوە[703]. (جۆد)ی بەریتانیش دەڵێت کە دیموکراسیی بەدی نەهاتووەو بەدیش نایەت تا هاولاتیان پەروەردە نەکرێن لەسەر بەئەنجام دانی ئاکامە پێویستەکانی دیموکراسیین[704].

بەپێی (پارتێلومی)ی فەرەنسیش دەبوایە بەر لە بەخشینی مافی دەنگدانی گشتی میللەت پەروەردەی سیاسی بکرایە نەوەك ئێستا کە بە پێچەوانەوە دیموکراسیی خۆی کورەکانی پەروەردە دەکات، دەشڵێت کەوا بەشداری کردنی کتوپڕی خەڵکو بێ ئامادە کردنیان لە بەڕێوەبردنی کاروباری گشتی لە فەرەنساو لە رووسیادا* کارەساتی بەدوای خۆیدا هێنا[705].

بە رواڵەت پەروەردە دەوری گەورەی هەیە بەڵام پێویستە هەروەها باسی بابەتی پەروەردەکردنەکەو ئەو کەسانەی کە بەم پەروەردەیە هەڵدەسن بکرێت. سەرمایەداران، بۆ نموونە، پەروەردەیەکی تایبەتیان مەبەستە. دەزگاکانی راگەیاندن لەدەستی ئەواندایە، ئەوەندەش بەهێزن کە کارێکی دیاریان هەیە لەسەر حکومەت، بەڵکو کاری ئەوان سەرجەم بیروبۆچوون و شێوازی کۆمەڵگەشی گرتۆتەوەو بەهاکانی سەرمایەدارییان لە مێشکی خەڵکدا چاندووە. بەهای گەورەی سەرمایەداریش ئەوەیە کە مرۆڤ گەورەترین

---

[703] جۆن دیووی، الدیمقراطیة والتربیة، ل ٨٩-٩٠.

[704] س. جۆد، الحریة في القرن العشرین، ل٢٧٠.

* دیارە مەبەستی لە فەرەنسای پاش(١٧٨٩)و روسیای پاش کودێتای ((دیموکراتی))ی (١٩١٧) کە ئەوەندەی پێ ی نەچوو شۆڕشی کۆمۆنیستی تشرینی یەکەمی (١٩١٧) بەدوایدا رووی دا.

[705] دکتۆر عبد الحمید المتولي، الوجیز...ل٢٤٩+ پەراوێز (٢).

دەستکەوتی ماددی لەدەست بخاتو ئەمەیە پێوانەی گوزەرانی باشە... (هەلپەی ژیان)و (هەلپەی ماددە)ش بوارێکی کەمتر بۆ هاولاتی دەهێلێتەوە بۆ ئەوەی بایەخ بە کاروباری کۆمەلگەو بەتایبەتی لایەنی سیاسی بدات. جا ئەگەر نەخشەی سەرمایەدارانیش بچێتە پال ئەم تێروانینە بۆ ژیان دەبێت چ پەروەردەیەك لەبەردەم ئەم دوانەدا سەرکەوتوو بێت؟.

(لاسکی) دەلێت کە دەستکەوتەکانی سەدەی (١٩) کە بەهۆی هونەری فێرکردنەوە هاتنەدی، لە سەدەی (٢٠)دا هونەری پروپاگندە پەکی خستن[٧٠٦]، (جۆد) یش چارەسەرێکی هەیە بۆ چەولشەکاریی راگەیاندن ئەویش فێرکردنی قوتابییەکان کە مەیلی رۆژنامەکان بناسنو پێیان بووترێت کە زۆربەی ئەو شتانەی کە رۆژنامەکان دەیلێن راست نییە[٧٠٧].

بەلام ئەمە چارەسەرێکی سلبییەو قوتابی فێری تەنها گومانو دوودلی دەکات. جگە لەوەی کە ترس هەیە ئەمجارە دەسەلاتداران قوتابییەکان ئاراستە بکەن کە بڕوا بە فلانو فیسار دەزگا نەکەنو بەم شێوەیە دەست بگرن بەسەر بیرکردنەوەیاندا.

بەکورتی ئەمە چارەسەرێکی خەیالییەو بە وردبوونەوە دەگەینە ئەنجامەکەی (شیللەر) کە فێرکردن هەرەشەی ئەوەی لەسەرە کە مل کەچ بکرێت بۆ دەزگاکانی قازانج (هەروەها دەزگا سەربازییەکان) هیوا بەستنیش بە فێرکردنو پەروەردە لە خەونێکی خۆشو ئاواتێکی دوور زیاتر نییە.

---

[٧٠٦] هـ. لاسکی، اصول السیاسة، ج٢، ل١٣.

[٧٠٧] س. جۆد، الحریة..، ل ٢٧٣.

# چوارەم: حوکمی خۆجێیی
## (الحكم المحلى)
## Local Government

حوکمی خۆ جێیی (ناوچەیی) یاخود حکومەتی خوجێیی[٧٠٨]، حکومەتی ناوچەیێکی وڵاتەکەیە، بۆ نموونە شارێك کە ئەنجوومەن و حاکمی خۆی هەیە و کاری باری شارەکە بەڕێوە دەبات. ئەم حوکمەش چەسپاندنی بنەمای ئامەرکەزییەتە.

بۆ چوونی باویش هەیە کە حوکمی خۆ جێیی برەو بە دیموکراسیی دەدات، هەروەها راهێنانێکە لەسەر دیموکراسیی ئەویش لەبەر ئەوەی کە رێژەیەکی گەورەتری خەڵك بەشداری دەکەن لەچاو حوکمی مەرکەزی هەروەها لەبەر چەند هۆیەکی تریش غەیری ئەمە[٧٠٩]، تەنانەت هەندێك کەسیش دەڵێن کە حوکمی خۆجێیی و دیموکراسیی هاووجوتن[٧١٠]. بەپێی (دوڤابر)یش دوو نیزام هەن بۆ چاودێری کردنی دەوڵەتی دیموکراتی: هەڵبژاردن و پەرلەمان لە لایەك و نیزامی نا مەرکەزی لە لایەکی تر[٧١١].

لەگەڵ هەموو ئەو بۆ چوونانەیکە حوکمی خۆجێیی پەسەند دەکەن، ئەم حوکمە رووبەڕووی رەخنە بووە یەکێك لەوانە رەخنەی (لانگرۆد)ە Langrod کە دەڵێت تەجروبە دەری خستووە کە مەرج نییە لە حوکمی خۆجێیدا راهێنان لەسەر دیموکراسیی بەدەست بکەوێت[٧١٢]. (بولوا)ش کە ئەم قسەیەی هێناوەتەوە دان بەوەدا دەنێت کە

---

[٧٠٨] لەبارەی مێژووی ئەم حوکمەو چەسپاندنی بڕوانە:
Willaim A. Robson, Local Government, Ency. of the Social Sciences, Vol. 9, P. 574ff.

[٧٠٩] بڕوانە: رمزی، سياسة الحكم، ج٢، ل٢٥٦-٢٥٧.

[710] J. Boulouis, Local Government as a Basis and Training in Democracy, International Social Science Bulletin, Vol. 5, no1, P. 40.

[٧١١] جاك دۆندیو دوڤابر، الدولة، ل١١.

[712] J. Boulouis, Op. Cit., p. 41.

وەلام دانەوەی پرسیاری ((ئایا ئەم حوکمە چەمکێکی پەروەردەی دیموکراتییە ؟)). بە(بەڵێ) یان بە (نەخێر) ملهورییەکی گەورەیە[٧١٣]. دەشڵێن خەڵکێکی زۆرتریش لەم حوکمە دا بەشداری دەکەن بەلام بە پێچەوانەوە بەلگەی زۆر هەن کە خەلکەکە بایەخی پێ نادەن هەرچەندە دەبوایە بایەخێکی گەورەتریان پێ بدایە چونکە راستەو خۆ پەیوەندیی بە ژیانی خۆیانەوە هەیە. لەبابەتی هەڵبژاردنیشدا زانیمان رێژەی بەشداری کردنی خەڵك لە هەڵبژاردنە ناوچەییەکاندا چەند نزمەو کە لە ئەمەریکادا (٢٥٪) تا (٣٠٪) یە. لە ولاتانی تری رۆژئاواشدا ئەمە دیسان بەدی دەکرێت[٧١٤].

لەم حوکمەداو بەپێی (لانگرۆد) دەوری هاولاتی هەندێك جار لاوەکییەو تا رادەیەك شکلیو سنوورداره[٧١٥]. ئەم حوکمە پێویستی بە پسپۆرییە (تخصص) چونکە کێشەی هونەری (تەکنیکی) ی تیادا بەدی دەکرێت. ئەو پسپۆرێتییەش وا لە هاولاتی دەکات کە بەشداری نەکات لە بەڕێوەبەرایەتییەك کە رۆژ بەرۆژ زیاترو زیاتر لە نهێنییەکانی تێ ناگات[٧١٦].

ووتمان بۆ چونێکی باوە کە دەڵێت ئەم حوکمە خزمەت بە دیمۆکراسی دەکات، بەلام (لانگرۆد) بە پێچەوانەی ئەمە دەڵێتو سەرنجمان رادەکێشێت بۆ ئەوەی کە دیموکراسیی بەپێی پێناسەکەی ((یەك دەخات)) و((یەکسان دەکات)) لە کاتێکدا حوکمی خۆجێیی ((پەرت دەکات)) بۆ پارچەی بچووك.. دیموکراسیی بەپێی جەوهەرەکەی خۆیەوە رووەو مەرکەزییەت نەك پەرت کردن دەچێت بۆیە ئەم حوکمە دژ بە دیموکراسییە[٧١٧].

---

[713]Ibid, p. 40.

[٧١٤] بۆ فەرەنسا بڕوانە، رۆبێر پیللو، المواطن والدولة، ل ٩٥. لەبەر ئەوە بۆ نموونە بایەخ نەدانی خەلکەکە بە کارو باری ئەنجومەنەکان لە کوردستاندا (مەبەست کوردستانی سەر بەعیراق) شتێکی نا ئاسایی نییە.

[715]J. Boulouis, Op. Cit., p. 41.

[716]Ibid, p. 38.

[717]Ibid. p. 23.

دەتوانین ئەوەش بڵێین کە ئەم حوکمە هەستی ناوچەیی زاڵ دەکات لەکاتێکدا دیموکراسیی دەبەوێت هەستەکان رووەو سەرجەم گەل‌و وڵات ئاراستە بکات.

رەخنەیەکی تری (لانگرۆد) ئەوەیە کە ئەم حوکمە هەندێك جار خزمەتی کەمایەتیی ناوچەیی‌و کۆمەڵەی سیاسی‌و چەند هێزێکی دژ بە دیموکراسیی دەکات لە جیاتی ئەوەی نوێنەرایەتیی خواستە راستەقینەکانی گەل بکات[718].

ئەگەر قسەکەی (رۆبسن) یش راست بێت کە لە سییەکاندا ووتبووی ئەویش زیاد بوونی دەسەڵاتەکانی حکومەتی خۆجێیی لەگەڵ زیاد بوونی دەسەڵاتی مەرکەزیدا[719]، ئەو کاتە دەردەکەوێت ئەم حوکمە چەند زیان بە حوکمی مەرکەزی دەگەیەنێت چونکە لەو حاڵەتەدا دوو هێزی بەتوانا لەیەك وڵاتدا پەیدا دەبن، حکومەتی مەرکەزی لەلایەکو حکومەتی ناوچەییان لە لایەکی ترو ئەمەکێشەو ململانە لە نێوانیاندا دروست دەکات.

بەکورتی: حکومەتی تەقلیدیی خۆجێیی لەگەڵ تیۆری نوێی دیموکراسییدا ناگونجێت[720]و ئەو حوکمەی کە جێگەی هیوا بوو بۆ گەشەسەندنی دیموکراسیی‌و بۆ راهێنان لەسەر ئەو دیموکراسییە، وەکو شتەکانی تر سەلماندنی کە لە هیوایەکی خەڵەتێنەر زیاتر نییە.

718Ibid, p. 30.

719W. A. Robson, Op. Cit., p. 584.

720J. Boulouis, Op. Cit., p. 25.

# پێنجەم: دیموکراسیی و سروشتی گەلان

زانراوەکە هەموو مرۆڤێك لەوەی تر دەچێتو گەلان لەیەکتر دەچن، بەلام گومان لەوەشدا نییە کە هەر مرۆڤێك چەند تایبەتییەکی هەیە کە لە مرۆڤانی تر جیای دەکەنەوەو هەر گەلێك سروشتێکی تایبەتی خۆی هەیە کە مۆرکێکی دیاری کراو پێوەیە.

ئەو هۆکارانەش زۆرن کە سروشتی تایبەت بەگەل دەبەخشن، هۆکاری مێژووییمان هەیە، هۆکاری سیاسی، ئابووری، .... تەنانەت جوگرافیش (ئەمەی دواییشیان دەورێکی گەورەی هەیە کە کەم کەس هەستی پێ دەکەن).

لە ئەنجامی ئەمەشدا گەلانی رۆژهەلات لە گەلانی رۆژئاوا لەچەند روویەکەوە جیاوازن، گەلانی رۆژهەلاتیش لە نێوان خۆیاندا جیاوازییان هەیە، گەلانی رۆژئاواش بەهەمان شێوە.

نموونەش لەسەر ئەوە گەلانی لاتینی (وەکو فەرەنسییەکان، ئیتالیەکان،...تاد) کە لە گەلانی ئەنگلۆ سەکسۆنی لە هەندێك تایبەتیدا جیان، بۆ نموونە گەلانی لاتینی لایەنی کۆمەلایەتیی بەسەریاندا زاڵە واتە سۆشیالیزم لە ناویاندا بلاوترە، لە کاتێکدا ئەنگلۆسەکسۆنییەکان زیاتر فەردین و سۆشیالیزم کەمتر لایان پەسەندە، گەلانی ئەنگلۆ سەکسۆنیش وەکو یەك نین، ئەوەتا ئینگلیزەکان زیاتر حەز بە تەنیایی دەکەن لە کاتێکدا لایەنی کۆمەلایەتیو تێکەلاوی لای ئەمەریکییەکان بەهێزترە.

دیموکراسییو هەر ئاینێکی زەمینی تر بەرهەمی باروبۆخی تایبەتە. هەندێکیش لە هۆکارەکانی دروستبوونیان لە هەموو گەلێکدا هەن (بۆ نموونە حەز نەکردن بە زوڵم)و بەشێکی زۆری تریشیان پابەندی ئەو شوێنو کاتەیە.

بەبێ کوێدانیش بەو ئەسڵە زەمینییە سنووردارەش، هەوڵ درا کە ئەم ئایینە زەمینیانە کە دیموکراسیی یەکێکیانە... بەجیهانی بکرێن.

نووسەرێکی رۆژئاوایی باسی نیزامی پەرلەمانی بەریتانی دەکات کە چۆن رەگەکانی دەگەڕێتەوە بۆ رێکخستنێکی کۆمەلایەتیی ئەرستۆکراتی، بەلام ولاتەکانی تری ئەورووپاو بێ رەچاو کردنی ئەم بناغەیە ئەم نیزامەیان خواستووەو کە ئەمە هۆیەکی

فەشەل هێنانیان بوو[721]. ئەی دەبێت وەزعی وڵاتانی ڕۆژهەڵات چۆن بێت کە جیاوازییەکەیان گەورەترو قووڵترە؟

ئەوەی کە مەبەستمان بوو لەم بەشەدا ئەوەیە کە لەبەر جیاوازی لە نێوان سروشتی گەلان کارێکی هەڵەیە هەر نیزامێکی حوکم وەکو خۆی بخواسترێت، بەلام دیموکراسیی نەك هەر خواستراوە بەڵکو بە جیهانیش کراوە بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئێمە خۆمان بەکەم دەزانین، بۆ چوونی هەڵە لەبارەی نرخی بچووکمان بەئاسانی لە مێشکماندا جێگەی خۆی دەکاتەوە، ئەم خۆ بەکەم زانینەش هانی داوین کە بیرو باوەڕو نیزامی حوکم... وەکو جلو بەرگو مۆدێلی سەیارە... لەدەرەوە بهێنینە وڵاتمان بەبێ گوێدان بەو ڕاستییەی کە ئەم بیرو باوەڕو شێوەی حوکمو دەزگایانە بەرهەمی زەویو کەش و هەوایەکی ترن و بەبێ ئاوڕدانەوە لە کەموکورتی وعەیبەکانیان.

## شەشەم: کۆنی و بێ هێزی دیموکراسیی

لەو بڕوایە داین کە فراوانترین پۆلێن کردنی جۆرەکانی حوکم لە ڕووی ژمارەی بەشداربووانەوە بریتییە لەوەی کە ئەو جۆرانە بۆ دوو جۆری سەرەکی دابەش بکەین: (حوکمی جەماعی) و (حوکمی فەردی).

مەبەستمان لە (حوکمی جەماعی) ئەوەیە کە یەك کەس بە ڕەهایی حوکم نەکات، بەڵکو حوکمەکە بریتی بێت لە حوکمی فەرمانڕەوایەکی تاك + شوورا، یان بریتی بێت لە حوکمی کۆمەڵێك کەس (زۆر بن یان کەم).

حوکمی لەو جۆرە لە سەرانسەری جیهاندا هەبووە، لای کۆمەڵگە سەرەتاییەکانی ئەفەریقاو لای ئەولەی ئەمەریکای باکوورو باشوور (هیندییە ئەمەریکییەکان)و لای زۆر کۆمەڵگەی تری سەرەتایی هەبووەو تا ئێستا ماوە.

لەو کۆمەڵگانەدا حاکمی ڕەها وجودی نەبووەو نییە. پێشەوای خێڵەکە بە تەنیا حوکم ناکات بەڵکو ئەنجوومەنێك یان زیاتری لە پاڵدا هەبوو. یان بەلای کەمەوە دەبوایە حیسابی بۆ کۆمەڵگەکە بکردایە.

---

[721]C. J. Friedrich, Separation of Powers, Op. Cit., p. 665.

لەبەر ئەو هەستە ڕۆژئاواییەش کە ئەورووپای کردۆتە مەرکەزی جیهان و کە پێویستە جیهان بە دەوری ئەورووپادا بخولێتەوە بیریارانی ڕۆژئاوا (یان هەندێکیان) ناوی (دیموکراسیی سەرەتایی) لەم جۆرە حوکمەی کۆمەڵگە سەرەتاییەیان ناوە. لەڕاستیشدا وەك چۆن باس لە حوکمی ڕاستەقینەی کەمایەتی لە دیموکراسییەکەی ڕۆژئاوادا دەکەین، وەهاش دەتوانین باس لە حوکمی کەمایەتی لەو کۆمەڵگە سەرەتاییانە بکەین؛ (ئەنجوومەنی پیران) یان (ئەنجوومەنی جەنگاوەران) یان هەردووکیان پێکەوە، یان هەر دەزگایەکی تر.. مەرکەزی حوکمی کۆمەڵگە سەرەتاییەکانە.

خێڵە دڕندەکانی ئەورووپای کۆنیش (ئەنجوومەنی هەموو جەنگاوەران)یان هەبوو، بەر لەوانیش و لە باشووری عێراقدا لەوە دەچێت لە سەرەتای سەرهەڵدانی شارستانیەتی سۆمەری، هەر شارێکی سۆمەری ئەنجوومەنی هەبووە. وەك چۆن لە چیرۆکی (گلگامێش و ئاگا)دا دەردەکەوێت. (گلگامێش) کە پادشای شاری (ئوروك) بوو پرس بە ئنجوومەنی پیران دەکات لەبارەی شەڕ دژی (ئاگا)وە بەلام کاتێك گلگامێش وەلامی ئەو ئەنجوومەنەی بە دڵ نابێت ڕوو دەکاتە (ئەنجوومەنی جەنگاوەران)[722]. جگە لەوەش ئەفسانەی سەرهەڵدانی بوونەوەر باسی (ئەنجوومەنی خوداوەندەکان)ی تێدایەو کە دیارە ئەمە ڕەنگدانی وەزعێکی سیاسیی کۆنی عێراق کە تیایدا حوکمی شووراو ئەنجوومەن هەبوو.

بەلام ئەم حوکمە جەماعییە تا سەر نییە و لەگەڵ سەرهەڵدانی دەوڵەتی مەرکەزیو پاشان ئیمپراتۆریەت حوکمی فەردی یان لە باشترین حاڵەتدا حوکمی کەمایەتییەکی تەسك دەچێتە جێگەی. ئەمانی حوکمی جەماعی زۆر زوو لای سۆمەرییەکان نەما. لە یۆنانی کۆنیشدا بایەخەکەی لە دەست دا پاش دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتی ئەسکەندەری مەکدۆنی بەڵکو زووتر و پێش ئەوە (دیموکراسی) ڕووبەڕووی ڕەخنەی زۆر ببووەوە. لە ڕۆماشدا تا دەوڵەتەکە فراوانتر دەبوو پایەی (ئەنجوومەنی پیران) زیاتر دادەبەزی.

---

[722] بۆ ئەم داستانە بڕوانە طه باقر، مقدمة في أدب العراق القديم، ١٢٦-١٢٨.

بێگومـان دامـەزراندنی دەوڵـەتی مەرکـەزی و ئیمپراتۆریـەت تەنـها یەکێکـە لـە هۆکارەکانی نەمانی حوکمی جەماعی بەڵام گومانمان لەوەشدا نییە کـە هۆکـارێکی هـەرە گرنگە ئەگەر هۆکاری سەرەکیش نەبێت.

لەبەر ئەوە ناتوانین هەبوونی حوکمی رەها بە دیاردەیەکی لە سـەدا سـەد خـراپ بزانین هەرچەندە دژی ئەم جـۆرە حوکمەشـین. بـەم پێیـەش پێویسـتە چـاو بـە زاراوەی (ئستبدادی رۆژهەڵاتی– الإستبداد الشرقي) بخشێنینەوە. ئەم جۆرە ئستبدادە بریتییە لە حوکمی تاکە کەسێك یان کۆمەڵێك کە وڵات بۆ خۆیان دەخەنە گەڕو لەگەڵ نەبوونی هیچ دەزگایەکی دەستووری.

ئەم زاراوەیەش لە رۆژئاواوە بۆمان هاتووە، هەر لە رۆژئاواشەوە (بەها)کەیمان پێ گەیشتووەو وەکو هەموو جارێك زۆر رۆژهـەڵاتی جوویانەتـەوە. ئستبدادی رۆژهـەڵاتی لـە راستیدا لەگەڵ سەرهەڵدانی دەوڵەتی مەرکەزی و گەورەدا سەری هەڵدا، واتە هـەنگاوێکی گەشەسـەندنی مێژوویـی بـوو، کەسیش موناقەشـەی دەوری دەوڵـەتی گـەورە لەسـەر شارستانی بە تایبەتیش لایەنی ئاوەدانی ناکات. دەوڵەتی گەورە واتای سامانی بەشەریو دارایـی زۆر دەدات. ئەگـەر کۆمەڵگـە سـەرەتاییەکانی ئەفـەریقاو ئەمـەریکای بـاکوورو باشوور لەسەر دەستی دەوڵەتێکی گـەورەدا یـەکیان بگرتایـە زۆر لـە رووەکـانی حوکمـی جەماعییان لە دەست دەدا. لە حاڵەتی ئەواندا ئەو بـە نـاو (دیموکراسـییە سـەرەتایی)یـە یەکێك ئەبوو لە رواڵەتەکانی دواکەوتنو بێ هێزی.

کەواتـە ئەگـەر بـاس لـە دیموکراسـیی سـەرەتایی یـان دیموکراسـیی کـۆن بکـەین پێویستە هەروا باس لە کۆنیی دیموکراسیی بکەین... ئەوەش بێ ئەوەی لە یادمان بچێت باس لە بێ هێزییەکەشی بکەین.

دیموکراسیی بەرهەمی کاتو شـوێنو بـارودۆخی تایبەتییـە، بۆیـە لەگـەڵ گۆڕانـی ئەمانـەدا دیموکراسـیی زیـاتر لـەواقع دوورتـر دەکەوێتـەوە. (گراهـام والاس) باسـی مەفهوومێکی فیکریـی پـەتیی لـەبارەی سروشـتی مرۆڤـەوە دەکـات کـە سـەرچاوەی بزوتنەوەی دیموکراسییە، ئـەم مەفهومـە (والاس دەڵێـت) سـاڵ بەسـاڵ لـە واقـع دوورتـر دەکەوێتەوە[٧٢٢]. بەڵگەو شایەتیی زۆریش هەن لەسەر دووریی دیموکراسـیی لـە واقـعو لـە

[٧٢٢] گراهام والاس، الطبيعة البشرية في السياسة، ل ١٧٣.

ئەدجامدا کۆنبی دیموکراسیی. لە بەشەکانی رابردووشدا هەندێکێك لەو بەڵگانـەمان زانـی، لەخوارەوەشدا کورتیان دەکەینەوەو بەڵگەی تریان دەخەینە پاڵ.

باسکردن لـە کۆنبی دیموکراسیی شـتێکی سـەیرە لای ئـەو گەلانـەی کـە تـازە رزگاریان بووە لە دیکتاتۆریەت وکە دیموکراسیی و دەزگاکانی شتێکی نوێن لـە ژیانیـاندا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو گەلانە هەر زوو بۆیـان روون دەبێتـەوە کـە دیموکراسـیی ئـەوە نەبوو کـە خـەونیان پێـوە دەدیو زوو ئـەو راسـتییە ئاشـکرا دەبێـت کـە دیموکراسـیی ئاواتەکانیان بەدی ناهێنێت، بەڵام هێشتا لە کۆنبی دیموکراسی بێ ئاگان.

ئـەوەی باسمـان کردبـووو ئـەوەی ئێسـتا باسـی دەکـەین لـەبارەی کۆنبیـی دیموکراسییەوە ئەم خالانەی خوارەوەیە:

١- لێك جیاکردنی دەسەڵاتەکان بنەمایەکی کۆنە.

٢- پەرلەمان دەزگایەکی کۆنە کە لەگەڵ سەردەمدا ناگونجێت.

٣- دەزگاکانی دیموکراسیش بە شێوەیەکی گشتی کۆنن، (لاسکی) لەوەش زیـاتر دەڵێـت کـە دیموکراسـیی بـە هـەموو جۆرەکانیـەوە دەزگـا گونجاوەکـانی خـۆی نەدۆزیوەتەوە[٧٢٤]. ئەمەش دوای جەنگی دووەمی جیهانی وتبوو وئەگەر تـا ئـەو کاتـە دەزگا گونجاوانە نەدۆزرابێتەوە، وەزعەکە ئەمڕۆ خراپـترە چونکـە لادان لـە دیموکراسیی گەورەتر بووە. (دیڤرجێ) ش دەڵێت کەلەکاتێکدا دیکتاتۆرییەتە کۆنەکان نـوێ کرانـەوە، نیزامە دیموکراتییەکان هێشتا رێگە تەقلیدییەکان دەگرنە بەر کە لەگەڵ پێداویستییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی ئێستادا ناگونجێن[٧٢٥].

٤- کارەکـانی دیموکراسـیی بە هێواشـی دەڕۆن بـە جۆرێـك کـە لەگـەڵ چـەرخی خێرایی (عصر السرعة) دا ناگونجێن، زۆر بـاس لـە کـارە هێواشـەکانی پەرلـەمان کـراوە وەکو بۆ نموونە؛ پەرلەمان بازاڕی ئەو موناقەشاتانەیە کە کۆتاییان نایەت[٧٢٦]، یان وتراوە کە نیزامی دیموکراتی کارەکانی هێواشتر دەکات لە چاو نیزامە ئستبدادییەکان[٧٢٧]. یـان

---

[٧٢٤] هـ. لاسکی، اصول السیاسة، ج١، ل٧٤.

[٧٢٥] م. دیڤرجێ، النظم السیاسیة، ٢٨-٢٩.

[٧٢٦] ئێدوارد بنێش، هذه هي الديمقراطية، ل٧٧(بنێش قسەی رەخنەگران دەهێنێتەوە).

[٧٢٧] هـ. لاسکی، اصول السیاسة، ج، ل٧٤.

وەکو (جۆد) وتبووی کە هەموولان رێکن کە پێویستە چاو بخشێنرێت بە نیزامی پەرلەمانیی بەریتانیدا چونکە کات لەکارەکانی ئەو پەرلەمانەدا بە فیڕۆ دەدرێت و مەسەلە بێ نرخەکان کاتێکی زۆری وا دەبەن کەسەبر بە مرۆڤ ناهێڵن لە کاتێکدا مەسەلە گرنگەکان بەبێ لێکۆڵینەوەی پێویست پەلە لەبریاردان لەبارەیانەوە دەکرێت[728].

٥- (جۆد) هەروەها دەڵێت کە کارەکانی پەرلەمان لە پاشماوەی رابوردوون و زۆربەیان دەگەرێنەوە بۆ سێ سەدە لەمەو بەرو لەئەسڵدا بەکەڵکی پێداویستەکانی کۆمەڵگەیەکی ساکار دەهاتن[729]. بەمەرجێك نیزامی پەرلەمانی لە بەریتانیادا نموونەی نیزامی بەهێزو جێگیرەو وڵاتانی زۆر لاسیبانکردبووەوە... قسەکەی (جۆد) یش زیاد لە شەست ساڵە وتراوە.... واتە پەرلەمان ئەمڕۆ کۆنتر بۆتەوە.

٦- هەروەها سکاڵای سۆشیالیستەکان دەهێنێتەوە کە دەیانوت کەوا بەهۆی ناڵۆزیی ئیجراائاتی پەرلەمان پێویستە چارەکەسەیەك سەرف بکرێت تا زۆرینەیەکی سۆشیالیست لە پەرلەماندا یاسای وا دەربکات کە سۆشیالیزم بخاتە ناو نیزامی حوکمدا[730].

٧- لە ئەمەریکاشداو لەبارەی کاری لیژنەکانی کۆنگرسەوە(هەمفری) باسی لێپرسراوێك دەکات کە دەبوایە لە بەردەم (١٣) لیژنە ئامادە بوایە سەبارەت بە یاسایەکی دیاری کراو ئیتر: ((چۆن گەل بەتەما بێت بەرێوەبەرایەتییەکی کارێگەری هەبێت ئەگەر سەرۆکانی فەرمانگەکان لە راکردنی ماوەی درێژدا(سباق المسافات الطويلة) بەشداری بکەن؟))[731].

بەمەبەستی چارەسەرکردنی ئەم کارە خارەی پەرلەمان دوو رێگە پێکەوە پیادە کراون:

أ) بەهێزکردنی دەسەڵاتی بەجێهێنو سپاردنی ژمارەیەك لەو کارانەی کە ئەسڵەن هی پەرلەمانە بەو دەسەڵاتە.

---

[728] س. جۆد، الحرية...، ل ٢٦٨.

[729] سەرچاوەی سەرەوە.

[730] سەرچاوەی سەرەوە، ل٥٥.

[731] بروانە، هیوبێرت هەمفری، في سبيل البشرية، ل ١٧٥.

ب) لێکۆڵینەوەو موناقەشە کردنی پرۆژەی یاساکان لە لایەن لیژنەکانەوە، پاشان موناقەشە کردنی لە پەرلەماندا بەڵام هێشتا کارەکانی ئەو لیژنانەش، وەك هەمڤری باسی کرد، هەر هێواشن‌و کاتێکی زۆر دەبن، لە لایەکی ترەوە هێشتا موناقەشـە لـە پەرلـەماندا کاتی زۆر دەخایەنێت.

هەردوو چارەسـەر کردنەکـەی سـەرەوەش لادانـن لـە دیموکراسیی چونکە کـەم کردنـی دەسـەڵاتەکانی سـەرجەم پەرلەمانـە وەك دەزگایـەکی جـەماعی، چـارەش نییـەو پێویستە لە پێناوی خێرایی لە کـاردا لادان هـەبێت لـە دیموکراسـیی.. بـەڵام هێشـتا ئـەو خێراییەش بەدەست نەکەوتووە.

لەم بارەیەشەوە نوکتەیەکی دروسـتکراوەکمان دێتـەوە یـاد کە گوایـە کۆمـەڵێك چەکداری شیوعی (لە کوردستاندا) نەفەر هەڵگرێکی سەربازی دەبینن‌و بڕیار دەدەن لێـی بدەن بەڵام کۆمەڵێکیان دەڵێن بـا لێـی نـەدەین چونکـە ئەمـە مـاڵی میللەتـەو دوایی کە چوینە سەر حوکم دەبێتە هی خۆمان، ئیتر لەناو خۆیاندا موناقەشەی ئەمە دەکـەن‌و لـەو کاتانـەدا نەفـەر هەڵگرەکـە تێدەپـەڕێت. خـەڵکیش لای خۆمـان ماوەیـەك بـەو نوکتەیـە پێدەکەنین بەبێ ئەوەی بزانن کە ئەم نوکتەیە شتێکی واقعیە لە نیزامێکی دیموکراتیدا.

ئەم کارە خاوەی دیموکراسیی‌و ئەم سەردەمە خێراییەی کە تێیدا دەژین وای لـە هەندێك کردووە بڵێن کە دیموکراسیی ئەوەندە کۆنە کـە بەکـەڵکی چەسپاندن نایـەت لـە سەردەمی چوونە ناو بۆشاییی ئاسمان (عصر الفضاء)[٧٣٢]، بەڵام بێ گومان لای ئـەو دووا کەوتووانەی کە لە سەر کەناری شارستانیدا دەژین، ئەم ئایینە ئەو پەڕی نوێیە.

لەبەر ئەم کۆنییەو لەبەر هۆی تر، دیموکراسیی وەك شـێوازێکی بێ هـێزی حوکـم خۆی پیشان دەداو پێویستی بە شـتی تـر دەبێـت بـۆ خـۆ بـەهێزکردنی، ئەگـەر چـەند ڕوویەکی بێ هێزی دیموکراسیی بژمێرین ئەمانە کۆدەکەینەوە:

١- ئـەو مـاوە کەمـەی کـە لێپرسـراوان دەیبەنـە سـەر لـە حوکمـدا (بـە هـۆی هەڵبژاردنەوە) هۆکارێکە بۆ کەم کردنی دەسەڵاتی حکومی[٧٣٣]. ئەو ماوە کەمـەی مانـەوە لە حوکمدا حکومەت هان دەدات – وەك (بیردۆ) دەڵێت – کە خـەبات لـە پێنـاوی دیفـاع

---

- پاندۆهر، معنی الدیمقراطیة، ل ١٢.

بروانە، لیفی و رۆژ، منهج السیاسة، ل ١١٩.

کردن لە خۆی بکات نەك لە پێناوی حوکم کردن، لە لایەکی ترەوە یەکەم شت کە نەیارەکانی ئەو حکومەتە بایەخی پێ بدەن لابردنی حکومەتەکەیە... ئەمەش دەبێتە مایەی شلۆقیو ئیفلیجی[٧٢٤].

٢- ڕوویەکی تری لاوازی ئەوەیەکە ئەوەندەی لایەنگرانی فاشیەتو کۆمۆنیزم دڵیان گەرمە بۆ بیرو باوەڕەکەیان، ئەوەندە لایەنگرانی دیموکراسیی دڵ گەرم نین بۆی[٧٢٥]. یان با بڵێین: دیموکراسیی ئایینێکی ساردە. بە بڕوای ئێمەش ئەم ساردییە سوودێکی هەیە ئەویش دریژە دان بە تەمەنی ئەو ئایینە. دڵ گەرمیی لاوان بۆ نەتەوە پەرەستیو فاشیەتو کۆمۆنیزم تا سەر نەبووو هەر کە ئەو ئایینە زەمینییانە بوونە ئایینی دەسەڵاتدار چیتر نەیانتوانی لاوان لەدەوری خۆیاندا کۆبکەنەوە، نازییەت نەبێت کە تەنها (١٢) ساڵ لە حوکمدا بووو ماوەی تاقیکردنەوەی مانەوەی پێ نەدرابوو. لەلایەکی تریشەوە ئەو ((ساردی)) یە بە کەڵکی کۆمەڵگەیەکی ((مەڕناسا)) دێت کە دەیانەوێت خۆش بژینو رابوێرنو هیچی تر. کەواتا ((ساردیی)) دیموکراسیی شتێکی ((خراپ)) نییە بەڵام هەر ئەم ساردییەیە کە ناتوانێت هانی جەماوەر بدات بۆ خەباتێکی سەختی دوورودرێژ[٧٢٦].

٣- ڕوویەکی تری بێ هێزیی دیموکراسیی ئەوەیە کە بەدی هێنانی کاتو کارێکی زۆری دەوێت، بەڵام نەمانی ئاسانە. وەك (مەکنایڤەر) دەڵێت: گۆڕانی تۆلیگارشیەت (حوکمی کەمایەتی) بۆ دیموکراسیی ئامادە کردنێکی دوورو درێژی دەوێت بەڵام دەتوانرێت دیموکراسیی ببێتە تۆلیگارشیەت لە ڕێگەی کودێتاوە[٧٢٧]، هەرچەندە (مەکنایڤەر) مەبەستی لەواتە ناسروەکەی تۆلیگارشیەتە واتە بەرەسمیو لەبەرچاوان کەمایەتی حوکم بکات ئەگینا ئەگەر بگەڕێینەوە سەر باسی ئەو کەمایەتییانەی کە لە

---

[٧٢٤] ج. بیردۆ. الدیمقراطیة، ل ١٦٣ بەدواوە.

[٧٢٥] س. جۆد، الحریة..، ل ٢٦٩.

[٧٢٦] بێ گومان سێ شۆڕشەکەی مێژووی دیموکراسیی (شۆڕشی ئینگلیزیو ئەمەریکیو فەرەنسی) ماوەیەکی کەمیان خایاند و پێویستییان بە خەباتێکی دوورو درێژ نەبوو جگە لەوەی کە بیرو باوەڕی دیموکراتی تەنها یەك چەمك بوو لەو شۆڕشانە وتاکە پاڵپێوەنەر نەبوو.

[٧٢٧] ر. مەکایظفر، تکوین الدولة، ل٢١٩.

پشتی پەردەوە حوکم دەکەن دەزانین کە گۆڕانی دیموکراسیی بۆ ئۆلیگارشیەت خێراتر ڕوو دەدات... بەڵکو دەمێکێشە ڕووی داوە. دەبێت ئەویش بڵێین کەوا ئێمە کە بڕوامان بە نیزامی حوکمی ئیسلامی هەیە دەزانین کە حوکمی ئیسلامی پوخت بە هەمان شێوە بە زەحمەت و خەباتێکی زۆر دێتە دی بەڵام گۆڕانی بۆ حوکمی تاکە کەسێك (یان لادان تیایدا بە شێوەیەکی گشتی) زوو ڕوو دەدات، لەوەشدا دوو ڕاستی تۆمار دەکەین:

١- ئەمە واقعەکەیە کە دەبێت دانی پێدا بنێین بەڵام دیموکراسییخوازان ئیعترافی پێ ناکەن‌و دیموکراسیی ڕاستەقینە وەك نیزامێکی هەمیشەیی پیشان دەدەن هەرچەندە دەمێکە وانەماوە ئەگەر ئەسڵەن وابوو بێت.

٢- لادان لە حوکمی ئیسلامیدا هەندێك ڕوو دەگرێتەوە: وەك نەمانی یان تەسك بوونەوەی بازنەی شورا، ستەم کردنی حاکمەکان، ... بەڵام ئەو لادانەی کە ڕوو دەکاتە دیموکراسیی کرۆکی دیموکراسی دەگرێتەوە کە بریتییە لە گۆڕانی بۆ حکومێکی پشت پەردەی کەمایەتی... یان گۆڕانی ڕەسمیی‌و تەواوەتیی دیموکراسیی بۆ نیزامێکی تر. ئەوەندەش بەسە بزانین کە حوکمی ئیسلامی بەهەموو ئەو لادانەی کە ڕووی تێکردبوو (١٣٠٠) ساڵی خایەند‌و هێشتا چارەکەسەدەیەکیش تێنەپەڕیبوو بەسەر نەمانی کە هەوڵی زیندوکردنەوەی درا لە لایەن کۆمەڵە ئیسلامییەکانەوە لەسەرەتای سەدەی بیستدا. ئەمەش لە کاتێکدا دیموکراسییەکەی یۆنانی کۆن نەیتوانی دوو سەدە تەواو بکات‌و ئەم دیموکراسییە نوێیە لەمە کەمتری بڕیوە کەچی دووچاری مەترسیی زۆر بووەو زۆر بەر لەوەی هەرەس بهێنێت بۆتە حوکمی کەمایەتی.

٣- هەرچەندە پێویستە لە دیموکراسییدا گەل ئاگاداری هەموو کاروبارەکانی فەرمانڕەوایان بێت بەڵام بینیمان چۆن نهێنی بە ڕادەیەکی گەورە پیادە دەکرێت، ئەمەش نیشانەیەکی تری بێ هێزیی دیموکراسییە چونکە لە دیموکراسیی ڕاستەقینەدا بازنەی نهێنی زۆر تەسکە بەڵام ئەگەر نهێنی کەم بکرێتەوە دەوڵەت بێ هێز دەبێت.

٤- بێ هێزییەکی تر لە مەیدانی پەیوەندییەکانی دەرەوەدا دەبینرێت کە کێشەی زۆر لەم بوارەدا نێوان حکومەت‌و پەرلەماندا ڕوودەدات[٢٣٨]. فەرەنسا چارەسەری ئەم کێشەیەی تارادەیەکی گەورە کردبوو بەوەی کە پێی دەستوورەکەی ئەم بوارەی کردۆتە

---

[٢٣٨] ج. د. دوڤابر، الدولة، ل٧٧.

مەیدانی کاری سەرۆك كۆمار بەڵام بەم چارەسەرە دەسەڵاتی شوورای گەل (پەرلەمان) لەم بوارەدا لا برلو لادانێکی تر لە دیموکراسیی بەرپاکرا لە پێناوی بەهێزی حوکمدا... بەولتایەکی تر بۆ ئەوەی فەرەنسا دیموکراتیتر بێت دەبوایە ئەم بووارە بەش بکرایە نێوان دوو دەسەڵاتی یاسادانان و بەجێهێنان بەڵام بەم شێوەیە دەبوایە سیاسەتی دەرەوەی ولات وەك سیاسەتێکی دوو دڵی پڕ کێشە بما یەوە.

٥- ئەگەر بمانەوێت دیموکراسیی بچەسپێنین پێویستە قەناعەتمان هەبێت بە ولاتێکی بچووك کە نەتوانێت شان بدات لەشانی هێزە گەورەکانی جیهان. ئەگەر خوێنەوەریش بادی مابێت؛ دیموکراسییە پوختەکەی (دیموکراسیی راستەو خۆ) سەلماندبووی کە بەکەڵکی ولاتێکی بچووك دێت. شێوەی (دیموکراسیی پەرلەمانی)ش هەروایە ئەگەر دیموکراسییەکی پەرلەمانی پوخت بێت... لەمەشەوە دەتوانین بە قەناعەتەوە دیموکراسیی ناوبنێن (لادێ کراسی) یان (دێکراسی) یان(گوندۆکراسی) یان هەر ناوێك لەم بابەتە.

رازی بوونیش بە ولاتێکی بچووك واتای رازی بوون بە هێزێکی بچووك دەداتو رێگە خۆش دەکات لەبەردەم دەوڵەتە گەورەکاندا کەدەست بخەنە کاروبارمانەوە، دەوڵەتە گەورەکانی رۆژئاوا لەسەردەمێکدا هێزیان بۆ خۆیان پەیدا کرد کە ولاتانی ((دوا کەوتوو)) خەویان لێ کەوتبوو بۆیە کەس نەیتوانی دەست بخاتە کاروباری ناوخۆیان، تەنانەت ئەگەر ئەمەش روویدایە وەکو دەستێوەردانی ولاتانی ئەوروپا لە کارو باری فەرەنسای پاش ١٧٨٩ ئەو ولاتە ژێر خانی ئابووریو توانای بەشەریی ئەوەندە بوو کە بتوانێت دیفاع بکات یان ئەگەر کەوت هەڵبستێتەوە.

لەمەوە هۆیەکی هەوڵی ئەوروپا بۆ یەکخستنی ولاتەکانیان دەزانینو دەرك بە جیاوازیی نیزامی ئیسلامی دەکەین کە هەوڵ بۆ دەوڵەتی جیهانی دەدات لەگەڵ دیموکراسییخوازانی لای خۆمان کە بە عەقڵیەتی (لادێکراسی)و (گوندۆکراسی) بیر دەکەنە. لەبەر ئەوە با بە دەسەڵاتدارێتیی ئەمڕۆی رۆژئاوای((دیموکرات)) نەخەڵەتێن چونکە رۆژئاوا لەو کاتەدا خۆی بەهێز کرد کە رۆژهەلات نوستبوو، رۆژئاواش لە رێگەی غەیری دیموکراسییەوە (شۆرشی پیشە سازی) خۆی بەهێز کرد بۆیە (گۆستاف لوبۆن) خۆشحاڵ بیوو کە دەستکەوتە زانستییەکان بەر لەبەدی هاتنی دەسەڵاتی جەماوەر

رووناکییان بینیو گەشەیان سەند بەدیهێنانی ئەو دەستکەوتانە کارێکی زەحمەت دەبوو[729].

***

رووەکانی کۆنیو بێ هێزیی دیموکراسیی زۆرنو هەموو ئەمانە لەگەڵ شتی تری دیموکراسیی ئەم ئایینەزەمینییە دەکەنە ئایینێکی دوور لە واقع، دوور لەگیانی سەردەم، بۆ مەبەستی بە زۆر گونجاندنیشی لەگەڵ واقعداو بۆ مەبەستی بە هێزکردنی وڵاتان ئەوان ناچار بوون لێی لا بدەن، سەرەتا بە لادان لە دیموکراسیی پوخت(دیموکراسیی راستەوخۆ)و پەسەند کردنی دیموکراسیی نوێنەرایەتی، پاشان بەهێزکردنی دەسەڵاتی بەجێهێنان، پاشان... تاد، لەگەڵ هەموو هەنگاوێکیشدا گەل ساڵ لەدوای ساڵ دوورتر دەکەوتەوە لەحوکمو باشتر دەردەکەوتو روونتر دەبووە کە حوکمی راستەقینە حوکمی کەمایەتییە، ئەگەر بەدوای خەیاڵیشدا بگەرێین حوکمێکی دیموکراتی لاوازو بێ هێز دەستگیر دەکەین.. بەڵام هێشتا بەتەواوەتی دیموکراتی نییە.. چونکە ((بەتەواوەتی دیموکراتی)) قەد نەبووەو قەد نابێت.

# حەوتەم: کەڵبەکانی دیموکراسیی

وڵاتەکانی رۆژئاوا خۆیان بەهێز کردبووە.. بەڵام ئەم هێزەیان لەچیدا بەکار هێنا؟

دەسەڵاتداران لەناو وڵاتی خۆیاندا((یاسای هێز)) یان پیادە کردو حوکمی پشت پەردەی کەمایەتییان دامەزراند. لەدەرەوەی وڵاتەکەشیاندا هەمان یاسایان چەسپاند لەگەڵ درندێتییەکی کەم وێنەدا.

مێژووی رۆژئاوای دیموکرات مێژووی داگیر کردنو رووتاندنەوەی وڵاتانە، مێژووی رەگەز پەرەستیو تیۆری باڵایی ((مرۆڤی سپی)) یە. بۆ داپۆشینی ئەو مێژووە رەشەش دەهۆڵیان لێدەدا بۆ شارستانییەکەیان لێدەداو گەلانیان بەو دەهۆڵ لێدانە ورپکاس کرد. ئەوەشیان لەیاد نەچووە ئەو تۆمەتەی کە ئەوان بەر لەهەموو کەسێك دەگرێتەوە بخەنە پاڵ ئەمو ئەو ویە درندەو ناشارستانییان بزانن. یۆنانییە دیموکراتە

---

[729] گۆستاف لوبۆن، روح الجماعات، ل٥٤.

کۆنەکان هەموو میللەتێکی ... بە (بەربەری) دەزانی*. دیموکراتە نوێکانی ڕۆژئاواش لەوان خراپتر بوون. گەلانیان بەبەربەرو دوا کەوتوو وپلە دوو دزانی بەڵام دوایی تر فێر بوون چۆن دووروو ...و خۆیان بە هەڵگری پەیامی شارستانی پێشان بدەن‌و داگیرکردن‌و ڕووتاندنەوە بە ((پێشخستنی)) گەلان بزانن. ڕاستە پێشخستن... بەڵام بەرەو کۆیلێتی‌و هەڵدێر.

دیموکراتەکان‌و غەیری دیموکراتەکانی ڕۆژئاوا لەیادیان نەچوو بۆ داپۆشینی تاوانەکانیان بڵێن کە ئیسلام داگیر کەر بوو وئیسلام بە شمشێر بڵاوبۆتەوە. بەڵام لەناو هەموو میللەتێکدا چەند مرۆڤێکی خاوەن (انصاف) هەن، هەرچەندە کەس گوێیان بۆ ناگرێت ... ئەو مرۆڤە کەمە خاوەن(انصاف) انە حەقیقەتی دەسەڵاتدارانی خۆیان ئاشکرا کردووەو حەقیقەتی گەلانیشیان ووتووە.

یەکێك لەوانە (گی دو شیر)ە کە کتێبێکی لەبارەی ئیستعمارەوە نووسیوە بریا هەر کەسێك کە بە درۆکانی دەسەڵاتدارانی ڕۆژئاوا خڵەتاوە بیخوێنیایە.

(دو بوشیر) لەبارەی داگیر کەری ڕۆژئاوایی دواوە، بەڵام ئەوەی کە جێگەی سەرنجە ئەو تێگەیشتنە لە شەڕەکانی عەرەبە موسڵمانەکان کە دەتوانین بەم چەند خاڵانە کورتیان بکەینەوە:

١- فراوانکاریی ئیسلامی ئیستعمار نەبووە چونکە مەرجی ئیستعماری تێدا بەدی نەهاتبوو نە لە رووی ئەساسەوەو نە لە رووی بنیاتەوە. ئەم فراوانکارییە نەیدەویست گەلان ملکەچ بکات یان سامانی ئابووری لە وڵاتە گیراوەکاندا بۆ بەرژەوەندیی سەرکەوتووەکان (واتە عەرەب) بەتەنها بێت.

٢- ئیسلام زۆری لە گەلان نەکرد کەواز لە ئاینەکەیان بهێنن.

٣-ئەو کەسەی کە دەبووە موسڵمان مافەکانی موسڵمانانی وەردەگرت‌و بۆی هەبوو دەور ببینێت لە حوکمدا.

٤- لە فراوانکاریی ئیسلامیدا هیچ نەتەوەیەك یان ڕەگەزێك لە هیچ ساتێکدا نەبووە سەروەر بەڵکو سەروەریی هی ئاین بوو.

---

* هەرچەندە (دیورانت) لە (قصة الحضارة) دا دەڵێت کە مەبەستی ئەوان لە (بەربەرەکان) ئەوانەن کە بە زمانێکی غەیری یۆنانی قسەیان دەکرد نەك بە سووك زانینیان بەڵام ئایا ئەمە ڕاستە؟

٥- فراوانکاریی ئیسلامی ژیانێکی نوێی خستە بەردەم خەلکی وڵاتە گیرلوەکان‌و یەکسانی کردن لەگەڵ خۆیدا لە کاتێکدا داگیرکەری (نەصرانی) کە خەڵکەکەی دەکردە نەصرانی لە باشترین حاڵەتدا یەکسانییەکی (روحی)ی پێ دەبەخشن [٧٤٠].

چەند کەس گوێی لەمە گرتووە؟ نازانین چەند کەسن بەلام بێ گومان کەمن... هۆکەشی زانراوە؛ ئەوان ئامادە نین حەقیقەتی ناشیرینی خۆیان ئاشکرا بێت‌و غەیری خۆیان وەك پاڵەوانێکی مرۆڤایەتی‌و رەوشتی بەرز دەربکەوێت، لەبەر ئەوە کەس نەهۆڵ بۆ کتێبێکی وا لێ نادات بەلام لە دەهۆڵ لێدان زیاتر دەکەن بۆ کەسێك کە پێچەوانەی ئەوە بڵێت. مێشك سڕاوەکانی لای خۆشمان زۆر بەستە زمانن: تاوانبارەکان خۆیان دەکەنە پاڵەوان، ئێمەیش سووکایەتی بە گەلانی ((دووا کەوتوو)) دەکەن... مێشك سڕاوەکانیشمان پێ دەکەن.

ئەمە یەکەم‌و پڕ مەترسیترین تاوانی دیموکراسییخوازانی رۆژئاوایە.. بەرپا کردنی هەموو جۆرێك تاوان دژی منو تۆ پاشان رووی رەشی خۆیان بە دروشمێك داپۆشن‌و منو تۆ وەك نەوەی پێشینێکی درندە پیشان دەدەن.. بەشێوەیەکی کورتتر: مێشکمان دەسڕنەوە.

ئینجا با تاوانەکان بناسین: هەموو تاوانەکانیش نا چونکە بۆ ژمارەی هەموویان پێویستە هەموو ژیانمان سەرف بکەین.

***

سەرەتا با بزانین تیۆری (ئاشتی ودیموکراسیی) چۆن دامەزراوە.

وتراوە کەوا نیزامی دیموکراتی بەکەڵکی ئەوە نایەت کە مێشکی گەل ئامادە بکات بۆ جەنگ، لەمەشەوەو لەسەدەی نۆزدەدا زۆر وترابوو کە (ئاشتی) یەکێکە لە واتاکانی وشەی (دیموکراسیی) [٧٤١]، بەلام لەگەڵ ئەویشدا وڵاتە دیموکراتەکان پڕ چەك بوون،

---

[٧٤٠] بۆ هەموو ئەمانە بڕوانە: گی دو بوشیر تشريح جثة الاستعمار، ل ١١٨-١١٩. (دو بوشیر) دوو مەفهوومی هەیە: (ئیستعمار) کە وڵاتێك پیادەی دەکات کە هێزێکی ووشکایی هەیە... لەگەڵ (ئیمپریالیزم) کە ئیستعمارێکی دەریاییە، واتە هێزی دەریایی بەکار دەهێنێت، ئیسلامیش لای ئەو هیچیان نییە.

[٧٤١] دێلیسل بێرنز، الديمقراطية، ل ١٥٨.

سیاسەتی دەرەوەشیان هەر وەکو سیاسەتی دەوڵەتە کۆنەکانە (کە دیموکرات نەبوون)[742]، واتە لەسەر ئەساسی زۆرە ملێو داگیرکردنی گەلان دامەزراوە.

تەفسیری ئەم نارێکییە یەکێك لەم دوو تیۆرەی خوارەوە دەیکات:

١- یان ئەوەیە پەیوەندی نێوان گەلان وەکو پەیوەندی نێوان پاشایانی ئەوسایە، واتە دیموکراسیی لە بواری پەیوەندییەکانی دەرەوەدا بریتیە لە ئستبداد.

٢-یان ئەوەشە سیاسەتی دەرەوە بەکەڵکی دیموکراسیی نایەت، واتە دیموکراسیی شتێکی ناوچەییەو بۆ سنووری وڵاتە دیموکراتەکە خۆیەتیو دیموکراسیی بۆ پەیوەندییەکانی نێوان دەوڵەتاندا ناچەسپێت[743].

بە واتایەکی تر: دیموکراسییەکەی ئەمەریکا لە کوردستاندا (بۆ نموونە) یەکسانە بە ئستبدادو وەکو پەیوەندی نێوان پاشاو هاوڵاتیانی ستەم لێکراوە (بە پێی تیۆری یەکەم) یان ئەوەیە ئەمەریکا دیموکراسیی بۆ وڵاتی خۆی بەکار دەهێنێتو ناتوانێت پیادە بکات کاتێك مامەلە لەگەڵ کوردستاندا دەکاتو پێویستە شتێکی تر پیادە بکات کە هەر ئستبدادە (بەپێی تیۆری دووەم).. لە هەردوو حاڵەتەدا یاساکە (ئستبداد)ەو دیموکراسیی بەکەڵك نایەت. ئەم دوو ئەنجامەش رابەری تێکەیشتنن لە سیاسەتی دەرەوەی وڵاتە دیموکراتەکان.

ئەمە تیۆر، نموونە عەمەلییەکانیش ماوەن.

هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانی دیموکراسییەوەو هەر لەسەر ئاستی ناو خۆی هەر وڵاتێکی دیموکراتی توندوتیژی رێگەی بەدی هاتنی دیموکراسیی بوو. بیریاران سێ شۆرشی (ئینگلیزیو ئەمەریکی وفەرەنسی) بەرووداوی گرنگی مێژووی دیموکراسیی دەزانن، هەرسێکیان شۆرشی خوێناوی بوون. رەخنەش لەمە ناگرین چونکە شۆرش پێویست بوو لەبەر ئەوەی کە دەسەڵاتداران (پاشا، یان دەرەبەگەکان، یان وڵاتی داگیرکەر) ئاشتییانە دەستیان هەڵنەدەگرت لە (امتیازات) یانو تاکە رەخنە کە هەبێت ئاراستەی تاوانەکانی شۆرشی فەرەنسی دەکرێت.

---

[742] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٣١.

[743] بروانە سەرچاوەی سەرەوە.

له پاش ئەم شۆڕشانە مرۆڤایەتی سەردەمی زێرینی خۆی نەبینی بەڵکو بە پێچەوانەوە؛ بیرۆکەی ئیرادەی گشتی جەنگی سەختترو درێژ خایەنتری پێشکەش بە مرۆڤایەتی کرد... با چەند برگەیەکیش لە کتێبەکەی جەنەراڵ (فۆلەر).. (بەڕێوەبردنی جەنگ) بهێنینەوە:

جەنگە کۆنەکان جەنگێکی سنووردار بوون (حروب محدودە) جەنگی نێوان پادشایان بوون، مەبەستی ئەم جەنگانەش تەنها داگیرکردنی ناوچەکانەو لەشەڕەکاندا دوو لەشکرەکە هەوڵیان داوە نەجەنگێنو خۆیان لەشەڕ دوور دەخستەوە. بەڵام پاش شۆڕشی فەرەنسیو کە وشەکانی (ئازادیی گەل) و(ئیرادەی گشتی)و (جمهوریەت) هاتنە کایەوە جەنگەکان بوونە جەنگی نێوان میللەتانو وەحشیگەرییەکی گەورە سەری هەڵدا.

(فۆلەر) باسی رۆژی (٢٠) ی ئەیلوولی ساڵی(١٧٩٢) دەکات کە لە شکری شۆڕشی فەرەنسیو لەشکری پروسیا (گەورەترین ئەمارەتی ئەڵمانیا پێش یەکخستنی وڵاتەکە) بەیەك گەشتن، فەرماندەی پروسیش پاشە کشێی کرد لە مەیدانەکەو تەنها بۆمبا بارانێکی خەست روویدا.. لەو کاتەدا شاعیرو فەیلەسووفی ئەڵمانی(گوتە) ئامادە بوو وبە هاوڕێکانی وت: لەم شوێنەوەو لەم رۆژدا سەردەمێکی نوێ لە مێژووی جیهاندا دەست پێ دەکاتو هەمووتان دەتوانن بڵێن کە ئێوە ئامادە بوون کاتێك خۆری ئەم سەردەمە هەڵهات.

پاش سەد ساڵیش جەنەراڵی فەرەنسی (فۆش) کاری ئەم بۆمبارانە خەستەی دوو لەشکری پروسیو فەرەنسییەکەی بەم رستەیە کورت کردەوە: جەنگی پادشایان کۆتایی پێ هاتو جەنگی گەلان دەستی پێ کرد[٧٤٤].

(فۆلەر) دەڵێت: جگە لە جەنگە ئاینییەکانی ئەورووپا، ئەو جەنگە ئەوروپییانەی کە ئیقاعێکی شێتانەیان هەبوو بریتی بوون لە ململانەی دیموکراتی کە تەوژمەکەیان لە (ئیرادەی گشتی) یەوە وەردەگرت. قسەی مامۆستایەك دەهێنێتەوە کە باسی جەنگەکانی دەوڵەتە دیموکراتە کۆنەکانی یۆنان دەکات کە چۆن هەموو جۆرە وێرانییەکی بێ سوودیان لەگەڵ خۆدا هێناو قسەی نووسەرێکی تر دەهێنێتەوە کە چۆن جەنگەکانی

---

[٧٤٤] جەنەراڵ. ج. ف. س. فولەر، ادارة الحرب، ل٣٨-٣٩.

(سویسرا)ی دیموکرات لە سەدە ناوڕاستەکاندا دڕندێتییەکی سامناکیان پیادە دەکردو بێ شەرمانە گوێیان نەدەدایە مافەکانی دەوڵەتە دراوسێکان جگە لە دڕندێتی عەمدیو نەبوونی هیچ ڕەحمو بەزەیی.

ڕەفتاری لەشکرە دیموکراتەکانی شۆڕشی فەرەنسیش هەمان دڕندێتیی پیادە کرد. مێژوناسی بەریتانی (تۆینبی) تووشی زەحمەت دەبوو بۆ تێگەشتن لەو هۆیەی وای لە دیموکراسیی کردووە گوێ نە داتە خەبات دژی جەنگ، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەموو تواناو ووزەکەی دەخاتە پێناوی جەنگو دەپرسیت چۆن دەکرێت دیموکراسیی وەك هێزێکی دژ بە کۆمەڵگە کار بکات لە کاتێکدا دیموکراسیی ((گیانی ئینجیلەکان دەکاتە هەناسەو هێزە بزوێنەرەکەی بریتییە لە خۆشەویستی))[715].

(فۆلەر) دەڵێت ئەمڕۆ (سەرەتای شەستەکانی ئەم سەدەیە) وەڵامی پرسیارەکەی (تۆینبی) هەیە ئەویش کە هێزی بزوێنەری دیموکراسیی بریتی نییە لە خۆ شویستنی کەسانی تر بەڵکو ڕقو کینەیە بەرامبەر بەهەر شتێك کە لە دەرەوەی خێڵەکە یان کۆمەڵەکە یان حزبەکە یان میللەتەکەیە ... (ئیرادەی گشتی) بانگەشە بۆ جەنگی سەرەتاسەری (الحرب الشاملة) دەکات[716].

پەرەسەندنی سەربازی پیادە لای کۆندۆرسێیفەرەنسی(١٧٤٣-١٧٩٤) هۆی گەشە سەندنی دیموکراسییە[717]، بەڵام فوللەر پێچەوانەکەی دەڵێت واتە:تفەنگی فتیلە دلر سەربازی پیادەی دروستکردو ئەمیان دیموکراسیی دروستکرد چونکە دەبوایە سەربازەکە توانای کوشتنی هەبوایە(بە هۆی تفەنگە پێشکەوتووەکە) تا بەسەری نێزە یەکسانی بسەپێنێت[718].

---

[715] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٤٩-٥٠

[716] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٥٥.

[717] بۆیە باسی سەربازی پیادە دەکات چونکە ئەوسا زیاتر بایەخ بە (سوار) دەدرا کە زیاتر ئەرستۆکراتین بەڵام لەگەڵ حوکمی کۆماریو بەسەربازکردنی خەڵك (تجنید) سەربازی پیادە (کە لە عامەی خەڵك بوون) ژمارەیان زۆرتر بوو.

[718] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٤٣.

دیموکراسیش کە بەسەری نێزە لە ئەوروپادا سەپێنرابێت ئیتر دەبێت رەفتاری لەگەڵ گەلانی جیهاندا چۆن بێت؟

دیموکراسیی ئەگەر حوکمی گەل بێت پێویستە یەکێك لە واتاکانی ئەمێشتنی داگیر کەر بێت[749]. چونکە گەل حوکمی خۆی ناکات ئەگەر وڵاتەکەی داگیر کرابێت، دەشزانین کەوا گەورەترین داگیرکەرو وڵاتە دیموکراتەکانی ئینگلتەرا، فەرەنسا، هۆڵەندا.. تاد بوون و پاش ئەوان ((داگیر کردنی نوێ)) پەیدا بووە کە ئەمەریکا گەورەترین نوێنەریەتی.

زۆربەی بیریارانی دیموکراسیی بەزەحمەتیان زانی کە دیموکراسیی لای گەلانی رەنگدار دا بچەسپێت[750]، واتە ئەوانە کە سپی نین، وەکو ئەفەریقای رەش و چین و رۆژهەلاتی ئاسیای زەردو ئێمەی ئەسمەر.

ئەمەش راستە بەڵام (لاسکی) دەڵێت کە لایەنگرانی دیموکراسیی دەڵێن کە ئەم بۆچوونە واتای ئەوەیە کە گەلانی سپیی پێشکەوتوو دەست بگرن بەسەر گەلە رەندارەکاندا[751].

وەك وتمان لێرەدا ناکرێت باسی تاوانەکانی وڵاتە دیموکراتەکان بکەین چونکە ئەوەندە زۆرن لاپەرەکانی مێژووی نوێ و هاوچەرخیان رەشکردۆتەوە... تەنها ئەم چەندە خاڵەی خوارەوەش بۆ ئەم مەبەستە بەسن:

١- دیموکراسیی قەد رەگەز پەرستی و خۆ بەزل زانینی داگیرکەری چارەنەکردووەو قەدیش چارەسەری ناکات.

٢- نیزامە دیموکراتەکان ئازادیی بە پێی بەرژەوەندی تەفسیر دەکەن. (رەسل) رەخنەی لەم پێوانەیە گرتووەو دەڵێت: کاتێك ئێمەی بەریتانی دەڵێین ((قەد نابینە کۆیلە)) هەست دەکەین کە دەبینە کۆیلە ئەگەر ئازادیی ئەوەمان نەبێت دژی هەروڵاتێك هەر تاوانێك هەبێت بیکەین[752].

---

[749] دکتور ملحم قربان، لە، مستقبل الدیمقراطیة ومفاهیمها، ل ١٣١.

[750] H. J. Laski, Democracy, Op. Cit. p. 82.

[751] Ibid.

[752] ب. رەسل، هل للأنسان مستقبل، ل ٩٥.

٣- ئەو نیزامانە بەپاڵ بانگەشەی ئازادیی‌و دیموکراسیی پاڵپشتی دیکتاتۆرەکان دەکەن چونکە پاراستنی بەرژەوەندییەکان لە ئازادی‌و دیموکراسیی گرنگترە.

مێژووی نوێ‌و هاوچەرخیش پڕە لە نموونەی ئەو رژێمە دیکتاتۆرییانەی ئاسیاو ئەفریقیاو ئەمەریکای لاتینی کە ئەمەریکاو بەریتانیاو فەرەنسا... تاد پشتیان دەگرتن. بۆ نموونە دیکتاتۆرەکەی ئەوسای کۆریای باشوور (سنگمان ری) کە نەك هەر ئەمەریکا پشتی دەگرت بەڵکو هەروەها رۆژنامەگەرییەکەی ئەمەریکا وەسفی گەورە گەورەشیان دەکرد وەك: پیاوە پیرە مەزنەکە، جەنگاوەری ئازا لە پێناوی ئازادیدا[٧٥٣]... دەزگایەکی ئەمەریکیش (مەدالیای ئازادییەکان)ی پێ بەخشی‌و میدالیای تر وەکو ئەوانەی کە (چیانگ کای شێك) دیکتاتۆری تایوان‌و (نگو دین دیم) ی دیکتاتۆری ڤێتنامی باشوور[٧٥٤].

(لیدەرەر) کە باسی لەمانە دەکات لەبارەی دیموکراسییە کارتۆنییەکی (چیانگ کای شێك)ەوە دەدوێت‌و باسی حاڵەتێکی هەڵبژاردنی (کای شێك) دەکات کە چۆن موخالفی دەستووری تایوان بوو، کاتێکیش (لیدەرەر) ئەمە بە لێپرسراوێکی ئەمەریکی دەڵێت ئەمیان وەڵامی دەداتەوە: ئەمە راستە بەڵام شت لەبارەیەوە مەنووسە.. بۆ چی ئابروو چونەکانی خۆمان بڵاو دەکەیتەوە؟ ئەمە زیان بە هاوپەیمانەکانمان دەدات‌و یارمەتیی کۆمۆنیستەکان دەدات[٧٥٥]

ململانەی رۆژئاوا دژی کۆمۆنیزم هۆیەکی سەرەکی بوو بۆ بێ دەنگ بوون لە دیکتاتۆرەکان، بگرە بەهێزکردنیان. وەك چۆن ئەمڕۆ ترس لە ئیسلامییەکان هۆی کۆمەك کردنی دیکتاتۆرە نوێکان‌و دەوڵەتانی دیموکراسیی کارتۆنیی تر*. بەڵام ئیسلامییەکان هێشتا خاوەنی دەوڵەتی گەورە نین تا ببنە ئەو مەترسییە، لەمەشەوە ئاشکرایە کە رۆژئاوا هەر لەدوا رۆژی وڵاتانی خۆی ناترسێت بەڵکو بۆ ئەم قۆناغانەی ئێستا لە نەمانی دەوری خۆی وەك دلگیر کەرێکی‌نوێ دەترسێت. سەرکەوتنی ئیسلامییەکان واتای نەمانی

---

[٧٥٣] و. لیدەرمر، أمة من غنم، ل ٦٦.

[٧٥٤] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٧١ پەراوێز.

[٧٥٥] سەرچاوەی سەرەوە، ل ٥٧.

* (کارتۆنی تر)، واتە لە دیموکراسیی رۆژئاوا کارتۆنی تر چونکە ئەوەی رۆژئاوا (کارتۆنی)یە.

دەست ڕۆشتنی ڕۆژئاوا لە ڕۆژهەڵات دەگەیەنێت. لەبەر ئەوە لە ژێر رووکەشێکی دیموکراسییەوە (کە هەموو کەس پێی ناخەڵەتێ) کۆمەکی دیکتاتۆرەکانو جەنەڕاڵەکان دەکەن، لە میسرو لە تونسو جەزائیرو تورکیا... تا دەگاتە بچووکترین دیکتاتۆر کە یەکێکیان (یاسر عەرەفات)ە کە نووسەرو دکتۆری فەلەستینی (ادوارد سعید) ناوی ناوە دیکتاتۆری بچووک، لەوەڵامی رەخنەکانی ئەویش کتێبەکانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی فەلەستین قەدەغە کران بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەمەریکاو ئەورووپاو ئیسرائیلی دیموکرات بە عەرەفات رازین. وەکو پەیامنێری ناوداری ڕۆژنامەی (ئیندیپێندنت)ی بە ریتانیش (فیسك) دەڵێت: ئیسرائیلییەکان دەزانن کە عەرەفات دیکتاتۆرە بەڵام رازین بە کردارەکانیو دیموکراسییەکی راستەقینەیان ناوێت چونکە ئەو کاتە عەرەفات لە هەڵبژاردندا دەدۆڕێت[٧٥٦].

هەر ڕۆژئاوای دیموکراتیشە کە پاڵ پشتی ئەو وڵاتە دیکتاتۆریانە دەکات کە ئەنجامی هەمیشەیی هەڵبژاردنەکانیان ٩٩ ٪ بۆ حزبی حاکم وەکو (تونس) ی کاتی(بورقیبە)، کاتێکیش (بورقیبە) پیر بووو توانای نەما بەرامبەر شاڵاوەکە بوەستێت شانۆگەری ئینقلابیی (اصلاحی) نمایش کرایەوەو دیکتاتۆرێکی تر هێنرایە سەر شانۆ بۆ ئەوەی جارێکی تر بێ نابڕوویانە گاڵتە بەخەڵك بکاتو ژمارە سیحرییەکی ئەنجامی هەڵبژاردن دووبارە بکاتەوە. یان دیکتاتۆرێکی پیری تر ئەویش (سوهارتو)ی ئەندونوسیا کە (٣٢) ساڵ دیکتاتۆری ئەو وڵاتە بوو بەڵام کە ئەویش پیر بووو پێی نەماو ناڕەزایی بەرزبووە فەرمانی بۆ دەرچوو کە دەست لەکار بکێشێتو ((ڕێگە بدات بەگۆڕانکاریی دیموکراتی)) وەك وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا وتبووی[٧٥٧]... نەشیوت بۆ چی بەر لەم (٣٢) ساڵە ئەم قسەیە نەکرا.

دیسان ڕۆژئاوا(هەروەها ئیسرائیل) ی دیموکرات بوو کە پەیوەندی پتەویان بە ڕژێمی ئەوسای باشووری ئەفەریقا هەبوو، ئەو ڕژێمەی کە بەشێوەیەکی رەسمی

---

[٧٥٦] گۆڤاری فلسطین المسلمة، ژمارە ١١، ١٩٩٥/١١/١٢، ل ١٦.

[٧٥٧] رادیۆی لەندەن، ١٩٩٨/٤/٢٠ ڕۆژی دوایی (سوهارتو) – وەك هەموو کلکێکی تر- دەستی لە کار کێشایەوە ! لەم رووداوەشدا مێشك سڕاوەکان تەنها یەك شتیان لا گرنگە (لا چوونیدیکتاتۆرێك) بەڵام راستییەکی سەرخۆە جێگەی نابێتەوە لە مێشکیاندا.

کەمایەتییە سپی پێستەکە ڕەگەز پەرستی دژی زۆرینە ڕەش پێشتەکە پیادە دەکردو لەبەر چاوی هەموو جیهاندا لە هەموو مافێکیان بێ بەش کردبوون. هەمووشی چەند ساڵێکی کەمە ئەو ڕەگەز پەرستییە ڕەسمییە گوایە نەماوە.

٤- ڕۆژئاوا وازی لە داگیر کردن نەهێناوە بەڵکو تەنها شێوازەکەی گۆڕیوە، شێوازی ئەم جارەی ئەوەیە کە داگیر کردنی نوێی پێ دەوترێت. ئەم داگیر کەرە چیتر بە لەشکر وڵاتەکە داگیر ناکاتو تیایدا بمێنێتەوە بۆ ئەوەی دوایی بەزەبری چەکو شۆڕش لە وڵاتە دەربکرێت، ئەو داگیر کەرە چیتر ڕۆڵەکانی خۆی نادات بە کوشت.

شێوازی ((مۆدێرن))ی داگیرکەر ئەوەیە کە چەند چینێک لەناو ئەو وڵاتە دروستبکرێن کە کلکایەتیی داگیر کەر بکەنو کارەکانی بۆ ئەم ئەنجام بدەن بەتایبەتیش دووچینی کارێگەر؛ چینی دەسەڵاتدار کە زەبری هێز دژی گەلەکەی بەکار دەهێنێتو چینێکی بەناو ((ڕۆشنبیر)) کە کلکایەتی بۆ داگیر کەر لای خەڵك شیرین بکات.

داگیر کەری نوێ چیتر لەسەر خاکی خۆیداشەڕ ناکات... ئەمەریکاو فەرەنسا (بۆ نموونە)ئەوەندە گێل نین دژی یەکترو لە وڵاتی خۆیاندا شەڕ بکەن بەڵکو جیهان پڕیتی لە پێشەوایانی گێلو خۆ پەرستو پڕە لە میللەتی سلبیو خەولێکەوتوو.. ئەمانە کە شەڕیان بۆ دەکەن.

لەم ململانەیەی نێوان هێزە گەورە دیموکراتەکانی ڕۆژئاواشدا میللەکان دەکەونە ژێر پێ. قەسابخانەکانی (ڕواندا) ش کە نزیکی یەك ملیۆن کەس بوونە قوربانیان باشترین نموونەیە. شەڕی نێوان دوو خێلی (توتسی)و(هوتو) شەڕی نێوان ئەمەریکاو فەرەنسایە. فەرەنسا دەستی دەڕوات لە ئەفەریقا، ئەمەریکاش دەیەوێت ئەو دەربکاتو خۆی بچێتە جێگەی، لەمەشدا سەرکەوتنی گەورەی بەدەست هێناوە... لەوەش بەدواوە گرنگ نییە یەك ملیۆن کەس بکوژرێن، وا بزانە ملیۆنێك مێشو مەگەز کوژراون.

٥-داگیر کەری کۆنیش کە وڵاتە داگیرکراوەکانی جێهێشت هەزارو یەك کێشەی بۆ ئەو وڵاتانە جێهێشت کە یەکێکیان دابەش کردنی ئەو وڵاتانە بەو شێوەیە کە بە ئاسانی کێشە لە دوارۆژدا سەرهەڵبداتو داگیرکەر پاش ئەوەی کە لە دەرگاوە دەرکرا بتوانێت لە پەنجەرەوە بێتەوە ناو. کێشە جۆراو جۆرەکانی ئەفریقیاو ئاسیاش ئەنجامی چەند هۆیەکن کە ئەمە هۆی سەرەکییانە... هەمووشمان دەزانین کێو چۆن کوردستانی دابەش کردو کێشەی بۆ کوردو بۆ گەلانی دەوروبەری دروست کرد.

جگە لەم پاشماوەیەی داگیرکەری کۆن، داگیرکەرەکە شتی زۆری تری بۆ بەجێ هێشتین وەك نەخوێندەواریو دواکەوتنی زانستیو ئابووریو چینێکی فەرمانڕەوای خوێن مژ.

٦- هەموو تاوانەکانی وڵاتە دیموکراتە کانیش لە لایەکو دووڕووییەکەیان لە لا یەك. لە لایەکەوە وڵاتانیان داگیردەکرد، ئازادییەکانیان زەوت دەکرد، لەلاکەی تریشەوەو لە وڵاتی خۆیاندا باسی ئازادییان دەکرد. باسی حوکمی گەل دەکەن بەڵام دیکتاتۆرێك بەسەر میللەتی داگیر کراودا دەسەپێنن.

وەك (بۆڵدوین) یش دەڵێت: لایەنگرانی حزبی لیبرال (ئازادیخواز) دەیانزانی کە ئەمە نارێکییە کە لە وڵاتی خۆیاندا ئاڵای ئازادیی بەرز بکەنەوە بەڵام چاو بپۆشن لە حوکمی فەردی لە وڵاتە داگیر کراوەکانی ژێر دەستیان[٧٠٨]. ئەمەریکاو بەریتانیا دەیانویست گەلان بۆ خۆیان بەکار بهێننو لە هەمان کاتدا ببنە هاوڕێیان[٧٠٩].

بەکورتی ئەم سەردەمە درێژترین سەردەمی مرۆڤایەتییە چونکە وەکو جاران بەرژەوەندییەکان ماونو داگیر کردن ماوە، بەڵام لەبەر ئەوەی دروشمەکانی دیموکراسییو ئازادیی ومافی مرۆڤ زیادیان کردووە بەرژەوەندییەکان لە پشتی ئەم دروشمانەوە دەشار درێنەوەو پەنا دەبرێتەوە بەر درۆکردنو خەڵەتاندن.. مرۆڤی نەزانی زۆریش هەن کە ئامادەن بخەڵەتێن.

***

دەزانین کە ساڵی (١٩٩١) لە جەزائیردا هەڵبژاردنێکی گشتی کراو لەخولی یەکەمدا ئیسلامییەکان زیاد لە ٨٠٪ ی دەنگەکانیان بەدەست هێنا بەڵام کودێتایەکی سەربازی روویداو هەڵبژاردنەکە هەڵوەشایەوەو ئیسلامییەکان گیران. رۆژئاوای دیموکراتیش چ بە ئاشکرایی‌و چ لە ژێرەوە موبارەك بایی لەم کودێتایە کردو سەلمێنرا کە دیموکراسیی بەمەرجی تایبەتەوە پەسەند دەکرێت.

---

[٧٠٨] ل. د. بۆڵدوین، الدیمقراطیة أمل الانسانیة الأکبر. ل ١٢٧.

[٧٠٩] سەرچاوەی سەرەوە، ل ١٣٢ هەروەها دەڵێت خەڵەتاندن هۆکارێکی پێویست بوو بۆ گەشە سەندنی دیموکراسیی (ل ٨٨).

رەنگە خوێنەر چاوەڕێی کردبێت هەر لەسەرەتاوە باسی ئەزموونەکەی جەزائیر بکەمو لەسەری بڕۆم، بەلام دڵنیام کە لە ناو قەرەباڵغیی راستییەکانی ئەم کتێبەدا خوێنەوەر جەزائیری لەیاد چووەو ئیستا ئەو ئەزموونەی جەزائیر لە لای بۆتە شتێکی بچووك. سبەینیش خەلك لە یادیان دەچێتو دەچێتە پاڵ دەیان نموونەی تری مێژووی دووڕوویی ولاتە دیموکراتەکان... بەلام کێ دەرس وەردەگرێت؟

## هەشتەم: بلاوکردنەوەی دیموکراسیی بە شمشێر

زۆر باسی ئەوە کراوە کە ئیسلام بە شمشێر بلاو کراوەتەوە، زۆریش رەخنە دەگیرێت لە مەفهوومی ناردنی شۆڕش بۆ دەرەوە (تصدیر الثورة) بەلام کەمتر باسی سەپاندنی زۆرە ملێی دیموکراسیی (بێ گومان دیموکراسییەکی کارتۆنیتر لەوەی رۆژئاوا)و بۆ چوونی سالی (١٩٥٣) دەیوت: ئەمڕۆ لە هەموو رۆژێکی تر زیاتر پێویستە مەفهوومە ئەخلاقییەکانی دیموکراسیی بفرۆشین بەلکو تەنانەت بیکەینە جەنگاوەر (یان خەباتگێڕ)[٧٦٠].

ئەوەندەش کە (تصدیر الثورة) لایان کارێکی ناڕەوایە ئەم بلاوکردنەوە زۆرە ملێیەی دیموکراسییان لا پەسەندە.. رەنگە بلێن کە دیموکراسیی بیرو باوەڕێکی مرۆڤانەیەو ئەمە بۆی رەوایە، بەلام هەلگرانی بیروباوەڕەکانی تریش بیرو باوەڕەکانی خۆیان بە باشترین رێباز بۆ مرۆڤایەتی دەزانن. گومانیشی تێدا نییە کە ناردنی دیموکراسیی بۆ ولاتان شەرعیەت دەدات بە ناردنی بیروباوەڕەکانی تریش هەروەها، کە یەکێك لەوانە ئیسلامە، ئیسلامیش ئەو بەلگەیەی بەدەستەوەیە بۆ ئەمەو دیموکراسیی بەلگەیەکی وای نییە دیموکراسیی وەکو ئیسلام ئاینێکی ئاسمانی نییەو لەلایەن خواوە کە سەرچاوەی بوونەوەرە نەهاتووە. دیموکراسیی ئاینێکی زەمینییەو شمشێرەکەی خۆی هەلکێشاوە بێ ئەوەی لە ناوێنەدا تەماشای دیمەنەکەی خۆی بکات. ئاینێکی شەڕو پڕو گیان پڕ لە پینەو نارێکی.... قسە بەوانە دەلێت کە بیروباوەڕەکانیان

---

[760]Ann Van Wynen Thomas, The Semantics of International Law, p. 53.

(تصدیـن) دەکەن، خۆشـی شمشـێرێکی تیـژی هەڵگرتووە... بۆ چیـش؟ نـەك هـەر بـۆ ڕووخاندنی حکومەتە نەیارەکانی ڕۆژئاوا بەڵکو هەروا بۆ گۆڕینـی شـێوازی بیرکردنـەوەو ژیانی گەلانیش.

کـارە سـەربازییەکەی ئیسـلام بریتـی بـوو لـە ڕووخـاندنی حکومەتـە نامو‌سڵمانەکان[٧٦١] و پاش ئەوە دەرگای ئیسلام بۆ خەڵك کراوەتەوەو بێ زۆرە ملێ: ﴿ لا إكراه في الدين﴾ زۆرە ملێ لە ئایندا نییە. مەبەستەکە لا بردنـی ڕژێمـەکان بوو... بـەڵام دیموکراسـیخوازان کـارێکی تریـان هەیە، ئـەوان ڕژێمـەکان دەڕووخێنـن لـەوەش زیـاتر حوکمێکی ((دیموکراتی)) دەهێننە جێگەی[٧٦٢]، واتە بـیرو بۆچوونـی خەڵکەکە دەگۆڕن‌و ئـەو کەسـەی کـە ئـاینێکی تـری هەیـە پێویسـت دەکـات خـۆی لەگـەڵ دیموکراسـییدا بگونجێنێـت.. بۆیـە لـە سـەردەمی داگیر کـەری نوێدا پێویستە ئیسـلام خـۆی لـە گـەڵ دیموکراسییدا بگونجێنێـت... بـەڵام بـۆ چـی دیموکراسـیی خـۆی لەگـەڵ ئیسـلامدا نـاگونجێنێت؟ بۆ چـی لـە ڕۆژئـاوادا دیموکراسیی بـەرەو ئیسلامیەت نابـەن؟ وەڵامەکـە ئاسانە: چونکە دیموکراسیی ئاینێکی داگیر کەرە قژ زەردو چاو شینەکەیە.. ئـاینی ئـەو کەسەیە کە ئـەمڕۆ بـە هێزە. باشـە ئـەی ئەگـەر سبەینێ ڕۆژئـاوا دیموکراسیی فڕێدایە زبڵدان‌و ئاینێکی تری بۆ خۆی هەڵبژارد؟ گریمان ڕۆژئاوا بوو بە فاشی.. دەبێت ئـەمجارە هەروەها ئیسلام خۆی لەگەڵ فاشیەتدا بگونجێنێت... یاسای بەهێز ئەوەیە کە ئـاینێکی ئاسمانی نـەمری وەك ئیسـلام خـۆی لەگـەڵ ئـاینێکی زەمینـی کـاتی وەك دیموکراسـیی بگونجێنێت.

ئینجا با بپرسین، بڵاو کردنەوەی دیموکراسیی بۆ چی؟ ئەگەر بزانین دیموکراسـیی لە وڵاتێکی بچوکی بێ هێزدا چی دەگەیێنێت؟ وەڵامی ئەم پرسیارە دەدۆزینەوە.

---

[٧٦١] نازانم هەندێك کورد شێوەنی چی دەکەن ؟ دەڵێن ئیسـلام بەشـمشێرهاتە کوردسـتان بـەڵام ئیسلام کام حکومەتی کوردی روخاند؟ کام حکومەتی کوردی لە کوردستاندا هەبووە ؟ ئەو کوردانەش کە دژی موسڵمانەکان شەڕیان دەکرد، بۆ فارس‌و ڕۆم شەڕیان دەکرد، بۆیە هەمووی چەند شەڕێکی کەم بوون لە کوردستاندا.. ئەو کوردە تەنانەت لەدەرەوەی کوردستانیشدا شەڕیان بۆ فارسەکان دەکرد.

[٧٦٢] بێ گومان ئەمە بۆ هەموو وڵاتێك نییە بەڵکو بۆ ئەو وڵاتانەی کە مەبەستیانە.

دیموکراسیی لە وڵاتێکی بێ مێژدا یەکسانە بە (پشێوی)... کە لـەم پشێوییەشـدا کڕینی پیشەواکان‌و حزبەکان ئاسانە، ئاژاوە نانەوە لەناو وڵاتەکەدا ئاسانترە، میللـەتیش پارچـە پارچـە دەبێت‌و نـاتوانێت هێزەکـانی خـۆی کۆبکاتـەوەو ئاڕاسـتەی ئامـانجێکی بەرزیان بکات..

(ئیسـوکرات) ی یۆنـانی ئامۆژگـاریی (فیلیـپ) ی پاشـای (مـەکدۆنیا) ی کردبـوو سەبارەت بە چۆنێتیی دەست گرتن بەسەر وڵاتی یۆناندا وتبووی: پەیمانی ئازادیی بدە بە شارە (ئەیۆنی)یەکان[٧٦٣] و وشەی ئازادیی لە ئاسیادا بڵاو بکەرەوە چونکـە کـاتێك ئـەم وشەیە لەناو یۆنانیەکاندا بڵاوبـووەوە ئیمپراتۆرییەتەکـەمان (=ئـەثینا)و ئیمپراتۆریـەتی (سپارتا) تێك شکان[٧٦٤].

وڵاتی ئازادیی ئەو سەردەمانەش ئەوە بوو کە گـەل فـەرمانڕەوا بێت کـە ئەمـەش دەکاتـە دیموکراسـیی. ئامۆژگارییەکـەی ئیسـوکراتیش ئـەمڕۆ خراوەتـە مـەیدانی عەمەلییەوە؛ وشـەی دیموکراسـیی لـەناو وڵاتـاندا بڵاوبکەنـەوە وڵاتـەکان پارچـە پارچـە دەبن‌و قەد ناتوانن ئیمپراتۆرییەت دروست بکەن‌و هەر ئێوە سەروەر دەبن. وڵاتان دەبنە پاشکۆی ئێوە، نەك هەر لە رووی سیاسی‌و ئابوورییەوە بەتەنیا، بـەڵکو لـەوەش زیـاتر لـە رووی ژیارەوە(حضارة). ئینجا پەیوەندی نێوان (ئاغا)و (رەنجبەر) بەدی دێت... ئاغـای بەهێزو رەنجبـەری ژێـر دەسـتە، ئاغـای مۆدێـرن‌و رەنجبـەری دوا کـەوتوو... رۆژئـاواش دەبێتە قیبلەی رەنجبەرەکان. پێوانەکان دەبنە پێوانـەی رۆژئـاوا، هـەر پێشـێلکارییەکی دیموکراسییش لە وڵاتی رەنجەرەکاندا پرسـیارێك‌و نارەزاییـەکی ئـەو رەنجبەرانـەی بـەرز دەکاتـەوە: تەماشـای دیموکراسیی ئاغـا بکـەن چۆنـە.. کـەی ئەمـە دیموکراسییە ئێمـە هەمانە؟

---

[٧٦٣] شارە ئەیۆنیەکان ئەو شارە یۆنانییانە بوون کە لەسەر کەناری دەریای ئیجە لە رۆژئاوای تورکیـادا بوون.

[٧٦٤] فۆلەر، ادارة الحرب، ل ٣٥ پەراوێز. وەرگێڕی عەرەبی نووسیویەتی (سوکرات) بـەڵام ئەمـە هەڵەیـەو لەوەدەچێت فولەر (ئیسوکرات) ی نووسیبێت کە خەنیبێکی وڵاتی یۆنان بوو.

دیموکراسیی نوێترین‌و کورترین رێگەیە بۆ پاشکۆیەتی ئێمەو سەروەریی ئەوان. رێگە کۆن‌و سەرنەکەوتووەکە ئەوەبوو ئێمە بکرێینە (نصرانی) ئیتر گرنگ نییە نەصرانییەکی بەتەقوا بین یان نا چونکە مەبەست ئەوەبوو کە گەورەترین کۆسپ: ئەویش جیاوازیی ئایین، لەبەردەم زاڵبوونی خۆیاندا لابەرن، بەڵکو باشتریشە بۆ ئەوان تۆ نەصرانییەکی بەدکار بێت؛ زینا بکەیت، سوو بخۆیت، درۆ بکەیت، مەشروب بخۆیتەوە... چونکە مرۆڤی فاسدو لەزەت پەرست دەستە مۆترەو زووتر دەبێتە کۆیلە.

داگیر کەری نوێ جگە لە نەصرانی کردنی خەڵك رێگە کورتو ئاسانەکە دەگرێتە بەر... بچووك کردنەوەی جیاوازییەکەی لەگەڵ ئێمەدا بۆ ئاستی ((جیاوازیی فیکری))... پێمان دەڵێن: ئاساییە موسڵمان بن‌و لەهەمان کاتدا دیموکرات. ئەمە سەرەتایە ئاکامەکەش وەرگرتنی هەموو بە هاکانی رۆژئاواو لەدەست دانی کەسایەتیمان.. پاشان بە نەصرانی کردنمان ئاسانتر دەبێت و ئیتر لەمەو دوا لە جیاتی جیهادو ئازایەتی لە وەڵامی هەر زیللەیەکی سەر رووەتی راستمان رووەتی چەپمان وەردەچەرخێنین. ئیتر ئەمەریکا بۆچی دیموکراسیی بڵاو نەکاتەوەو بۆچی لەکات و شوێنی پێویستدا شمشێر بەکار نەهێنێت بۆ بڵاوکردنەوەی؟

منیش کە دیموکراسیی نیشانەی کۆیلێتیی میللەتەکەم بێت‌و هەنگاوێکی خەساندنی ئەم میللەتەم بێت مافی خۆم نییە رەفزی بکەم؟ من هەموو ئایینێك رەفز دەکەم کە ئەمە ئەنجامەکەی بێت چ جای ئەگەر ئایینێکی زەمینی کەم‌و کورتو پڕ لە عەیب‌و ناڕێکی ؟

بڵاوکردنەوەی دیموکراسیی بە شمشێر نیوەی چیرۆکەکەیە نیوەی تریشی ئەوەیە کە رەچاوی چەند ئعتبارێك دەکرێت:

١-دیموکراسیی بۆ هەموو وڵاتێك نییە چونکە وڵاتی وا هەیە پێویست بە دکتاتۆرییەت دەکات.

٢-پێویستە ئەو وڵاتەی کە بۆ دیموکراسیی هیدایەت کراوە پرۆژەکانی ئاغا جێ بەجێ بکات.

٣- بۆ پاراستنی ئەو رژێمانەو رێگە گرتن لە گۆڕانیان بۆ رژێمێکی دوژمنی ئاغا پێویستە دیموکراسیی لەو وڵاتانەدا لەوەی رۆژئاوا کارتۆنیتر بێت.

بەم شێوەیەش دوو ئەنجام بەدی دێن: دیموکراسییەکی کارتۆنی کە بە هێزی و گەندەڵی‌و خەساندن‌و کوژاندنەوەیی گیانی شۆڕشگێڕی بهێنێتە بەرهەم... بەپاڵ ئەمەش ئاغا بەم بانگەشەی دیموکراسییە خۆی وەك پێشەوای هەلگرانی بەهایەکی بەرزی مرۆڤایەتی پیشان دەدات.

لە ئەنجامیشدا خۆمان لەبەردەم جۆرێکی نوێی دیموکراسییدا دەبینینەوە؛ جۆرێك کە ناوی لە کتێبەکاندا نییەو خۆشمان نازانین ناوی چی لێ بنێین، بۆیە جارێ بیر لەناوەکەی ناکەینەوەو بەشێوەیەکی کاتی پێی دەڵێین (مەهزەلەی مەهزەلەکان) چونکە مەهزەلەکان بریتین لە جۆرەکانی دیموکراسییەکەی رۆژئاوا، ئەوانەی رۆژهەلاتیش لەوان پر مەهزەلەترن. نموونەکانیش زۆرن کە یەکێکیان شانۆگەرییە کۆمیدییەکەی دیموکراسیی لە تورکیاو میسرو تونس کە ئاماژەمان بۆ کردبوو، نموونەیەکی کۆنتر نموونەی بریتانیاو میسر کاتی پادشایی کە چۆن بەریتانیا حکومەتەکانی بەسەر میسردا دەسەپاندو پاشان هەر خۆشی لە ناوی دەبردن، یان وەکو تەماشاکەر خۆی پیشان دەدا بەڵام لەژێرەوە دوژمنایەتیی دەورووژاند لە نێوان حزبەکان[765].. خۆشیان ئەوەیان ویستبوو چونکە ساڵی (١٩١٩) شۆڕشێکیان بەرپاکردبوو لە ژێر سەرکردایەتی حزبی(وەفد) و(سەعد زەغلول)ی پێشەوای. (چێرچل)ی وەزیری ئەوسای بەریتانی پرسی میسرییەکان چییان دەوێت، وتیان دەڵێن ((پەرلەمانێكو دەستوورێکمان دەوێت)).. ئەویش ووتی: یارییەکەیان بدەنێ یاریی پێ بکەن[766].

وڵاتان دڵیان بەو یارییە خۆشە، پێشەولکانیشمان پێی دەوڵەمەند بوون، زمان حاڵی ئەمەریکاش ئەمڕۆ دەڵێت: یاری بەم شتانە بکەن‌و شتە گەورەکان بۆ من جێبهێڵن.

***

فیکرە کۆنەکەی ئەوسا ئەوە بوو دیموکراسیی بە کەڵکی گەلانی دوا کەوتوو نایەت ئەمەش کرابووە بەهانە بۆ داگیر کردن‌و ((پێشخستنی)) ئەم گەلە دواکەوتووانە. فیکرەی ئەمڕۆش (لەپاش جەنگی دووەمی جیهانەوە) ئەوەیە کە دەبێت دیموکراسیی لەهەمەو

---

[765] نوال محمد عمر، له، مستقبل الديمقراطية ومفاهيمها، ل ٢١٠-٢١١.

[766] محمد قطب، مذاهب فكرية معاصرة، ل ٢٥٥.

ولاتێکدا بەقەرار بێت ئەویش لەبەر هەمان هۆ رەنگە سبەینێش بڵێن دیموکراسیی بە هیچ شێوەیەك بۆ رۆژئاواش خۆی بە کەڵك نایەت بەڵام ئیستا ئەمەش دەکرێتەوە بەهانەی خۆ سەپاندن بەسەر ولاتاندا.. کرۆکەکە یەك شتە، شتێکی ئاشکرایەو زۆربەی خەڵك دەیزانن، بەڵام هەر ئەو خەڵکە زۆرەن کە بە توێکڵەکە خەڵەتاون.. ئەو کەسەش کە نەخەڵەتاوەو راو بۆچوون و کەسایەتیی خۆی هەیە شمشێری لێدانی سەربازی و شمشێری گەمارۆی ئابووری دیپلۆماسیی و شمشێری پیلان بەسەر سەریدا هەڵکراون.

شمشێرەکەی دیموکراسیی ئەوەندە تیژە کە بەتەواوی لەگەڵ دیموکراسیی خۆیدا ناگونجێت هەروەك چۆن شمشێری داگیرکەری ئەوسا تا سەر ئێسقان لەگەڵ ئینجیلەکەدا ناڕێك بوو، بەڵام وەك چۆن پێویست بوو شمشێری ئینجیل هەڵگرەکان تیژ بێت بەهەمان شێوە پێویستە شمشێری رابەرانی دیموکراسیی تیژ بێت.. یاسای ((مانەوە بۆ بەهێز)) ئەوەی دەوێت.

# بەشی حەوتەم
# نیزامی سیاسی لە ئیسلامدا
# ... بەراوردییەك

لێرەدا تەنها ئەوەمان بۆ دەكرێت كە بە كورتی ئاماژە بۆ چەند خاڵێكی نیزامی سیاسی لە ئیسلامدا بكەین و تەنها بەراوردیان بكەین لەگەڵ دیموكراسیی ئەگینا سەرجەم نیزامی حوكمی ئیسلامی پێویستی بە لێدوانێكی زۆرە. ئەم خاڵە كورتانەش لەسەرچاوەی شەرع (قورئان و سوننەت) و لە چەسپاندنەوە وەرمانگرتوون.

كەسێكی رۆژئاوایی لۆمەی لەسەر نییە ئەگەر وا بزانێت ئیسلام نیزامێكی حوكمی دیاریكراوی نەبێت بەڵام ئەمە بەمەرجێك كە یەك شت لەبارەی ئیسلامەوە نەزانێت، ئەگینا ئەو رۆژئاواییەی كە تەنها مێژووی ئیسلامی خوێندۆتەوەو هیچی تر لەبارەی ئیسلامەوە نەزانێت گومان لەوە ناكات كە ئیسلام نیزامی حوكمی تایبەتی هەیەو ئیسلام تەنها شتێكی (روحی)نییە. ئەو رۆژئاواییە ئەگەر گومانی لەوە هەبێت كەسێكی دەبەنگە. بەڵام لەو دەبەنگتر ئەو كەسە رۆژهەڵاتییەیە كە دەیان سەرچاوەی ئیسلامیی لەبەردەستدایە بەڵام ئەو راستییە نازانێت.

با ئەم چەند لاپەرەیەی خوارەوەش بانگەوازێك بێت لە ئێمەوە بۆ هەر لێكۆڵەرەوەیەك كە بڕوای بە دیموكراسیی هەیە بۆ ئەوەی چەند ساڵێكی تەمەنی خۆی تەرخان بكات بۆ ناسین نیزامی حوكمی ئیسلامی و تا بۆی دەربكەوێت كە دەتوانێت كارێكی بەرهەمدارلری گەورە بەئەنجام بهێنێت و پێشنیاری دەزگای نوێی حوكم بكات، ئەمەش لە جیاتی كاری ئێستای كە تەنها لاسایی كردنەو هیچی تر.

***

گرنگترین تایبەتی لە نیزامی سیاسیی ئیسلامی ئەوەیە كە لەگەڵ واقعدا گونجاوەو بەرهەمی باروبۆخێكی تایبەتی و كاتی یان تێڕوانێكی كەموكورتی بەشەری نییە.

واقعییەتی ئەم نیزامەش لەدوو خاڵدا خۆی دەبینێتەوە:

١- نیزامەکە ژمارەیەك بنەمای گشتیی هەیە. دەشزانین تا بنەماکان کەم‌و گشتی بن نیزامەکە شیاوترە بۆ ئەوەی بچەسپێنرێت بەسەر چەند کات‌و شوێن‌و بارودۆخێکی جیا جیادا. ئەمە لە کاتێکدا دیموکراسیی چەند بنەمایەکی وای هەیە کە ئەگەر نەچەسپێنرێن چیتر ناوی نانرێت دیموکراسیی.

٢- ئیجتیهاد لە فیقهی ئیسلامیدا دەرگایەکی کراوەیە. لە شێوەی حوکمیشدا ئەم دەرگایە ئەو پەڕی کراوەیە.

نموونەیەکی واقعییەتی ئیسلام کە لە فەرموودەکاندا بەدی دەکرێت مەسەلەی بەردەوامیی (چەرخی زێڕینی داپەروەری)یە، ئیسلام دەتوانێت حوکمی ئەو پەڕی داپەروەری دابمەزرێنێت (دایشمەزراندبوو) بەڵام لە هەمان کاتدا دەڵێت:بەهەشت لەم زەوییەدا نییەو حوکمی داپەروەری تەواو تا سەر نامێنێت، بۆ نموونە ئەو فەرموودە (صحیح)ەی کە باس لە پێنج قۆناغی ئیسلامی دەکات کە یەکەمیان پێغەمبەرایەتییە، دووەمیان خیلافەتێك لەسەر ڕێڕەوی پێغەمبەرایەتی دەڕوات، پاشان حوکمێکی پادشایی ئاسا کە مافی خەڵك نادات (کەئەش دەوڵەتی ئومەوی‌و عەباسی‌و عوسمانی دەگرێتەوە)، چوارەم قۆناغ حوکمی پادشایی[٧٦٧] زۆرە ملێ (کە ئەم سەردەمەیە کە تیایدا دەژین)، پێنجەمیش حوکمی خیلافەت کە دیسان لەسەر ڕێڕەوی پێغەمبەران دەڕوات[٧٦٨].

فەرموودەی تریش هەن باسی قۆناغی تری حوکم لە زەویدا دەکەن هەرچەندە وەکو فەرموودەکەی سەرەوە کۆنەکراونەتەوە لە یەك زنجیرەدا.

---

[٧٦٧] (پادشایی – الملوکیة) زاراوەیەکی سیاسیی ئیسلامیە کە هەموو جۆرە حوکمێك دەگرێتەوە کە حوکمی تاك پیادە دەکات (دەتوانین هەروەها بڵێین حوکمی کەمایەتی)و لەڕێگەی نائەرعییەوە پارە لەخەڵك کۆدەکاتەوەو لە ڕێگەی نا شەرعییەوە سەرفی دەکات.. تاد مەبەستیش لێی هەبوونی (پادشا)یەکی رەسمی‌و ئاشکرا نییە.

[٧٦٨] فەرموودەیەکی (صحیح)ە ئیمام ئەحمەد ریوایەتی کردووە.

بەلام لە لایەکی ترەوە دیموکراسیی خۆی وەکو سەردەمێکی زێرین پیشان دەدات، بەڵکو هەیشە پشبینیی تەمەن درێژیی بۆ دەکات.... ئەمەش کە ئەو پەڕی بێ ئاگایی لە واقعی گەندەڵی حوکمە دیموکراتەکان و بێ ئاگایی لە رەوتی مێژوو دەگەیەنێت.

کەواتە(سەردەمی زێرین) ئەگەر هەبێت بەردەوام نابێت، ئەمیش تەنانەت حوکمی ئیسلامیش دەگرێتەوە بەلام جیاوازی ئیسلام لێرەدا ئەوەیە:

١- لادان لە ئیسلام کەمترە، چونکە دانپەروەری ئیسلام لەسەر بناغەی یاساو بریاری حوکمی و لەسەر حوکمی شەرع بەتەنیا دانەمەزراوە بەلکو هەروەها لەسەر بناغەیەکی ئەخلاقیش. ئەم بناغەیەش رەوشتی خەڵك راست دەکاتەوەو رەفتارەکانی حاکمەکان تا رادەیەك (ضبط) دەکات. بینیشمان چۆن چارەسەری دوایەمین و گرنگی دەردەکانی دیموکراسیی لای دیموکراسیخوازان بریتییە لە پەروەردە.

٢- لەبەر ئەوەو پاش نەمانی سەردەمی زێرینیش بەشێکی گەورەی رەوشتی بەرز لەناو خەڵکدا دەمێنێتەوە بۆیە ئەگەر نیزامی حوکمی ئیسلامی گەندەڵ بێت نیزامی کۆمەلایەتی درەنگتر و بەرادەیەکی کەمتر گەندەڵ دەبێت.

ئینجا زۆر بە کورتی لە بارەی لایەنەکانی نیزامی حوکمی ئیسلامی بدوێین و بزانین چەند واقعی ترو کودجاوترن لە دیموکراسیی.

## یەکەم: شوورا

بینیمان چۆن دەبێت بەپێی شێوە پوختەکەی دیموکراسیی ئەنجومەنی هەموو هاولاتیان هەبێت بەلام ئەمە تەنها بۆ ولاتێکی زۆر بچووك بە کەڵك دێت، چارەسەری ئەم عەیبەش بە لادانێك لەو دیموکراسییە کراوە ئەویش کە پەرلەمان هەبێت کە نوێنەری خەڵکەکە بێت. ئەمەشیان دوایەمین چارەسەرەو ئەگەر پەرلەمان نەبێت دیموکراسیی نابێت. کەواتە دیموکراسی نیزامێکی وشکە (جامد)و پابەندی دەزگایەکی دیاریکراوە کە هەرچەندە سەلماندوویەتی کەوا لەگەڵ گیانی سەردەمدا (سەردەمی خێرایی) ناگونجێت بەلام هەر ناتوانن وازی لێ بهێنن.

لە ئیسلامیشدا تەنها بنەمای شوورا هەیە ئیتر هەر سەردەمێكو شوێنێكو بارودۆخێك بەو شێوازە بچەسپێنێت كە بۆی دەگونجێت:

١- لەسەربازیدا شوورا شێوازێكی تایبەتیی هەیە كە بریتیە لە پرس كردن بە راوێژكاران پاشان بڕیار هی فەرماندەیە... بەلام دەبێت بە پێی دیموكراسیی بڕیارەكان بەزۆرینەی دەنگ بێت ئەمەش كە هیچ سوپایەك نایكات چونكە تیا چوونی تەنكیدی بەدواوەیە.

٢- بۆ حوكم دەتوانرێت دەستەی شوورا بریتی بێت لە هەموو گەل كە فەرمانڕەوا پرس بە هەموویان یان ژمارەیەكی زۆریان بكات (دەڵێن عومەری كوڕی الخطاب تەنانەت پرسیشی بە منداڵان دەكرد) یان لە جیاتی ئەوە پەرلەمانێكی هەڵبژێردراو هەبێت (گەل هەڵی بژێرێت یان حاكم خۆی هەڵیبژێرێت)، دەشتوانرێت دەستەیەكی بچووكی راوێژكاران هەبێت لە جیاتی پەرلەمان... ئیتر هەر كامیان بێت گرنگ ئەوەیە شوورا هەبێتو فەرمانڕەوا ئستبداد پیادە نەكات.

٣- دەتوانرێت شوورای (مُلزِم) بێتو اتە حاكم پابەندی بڕیاری راوێژكارانی بێت، دەشتوانرێت (مُعلِم) بێت واتە حاكم پرسیان پێ دەكات بەلام بڕیاری دوایەمین هی خۆی بێت[٧٦٩]

بەم شێوەیە شوورا بنەمایەكی (مرن)ە لە كاتێكدا شوورای دیموكراسیی كە خۆی لە پەرلەماندا دەبینێتەوە (هەروەها ئیستفتاءە پێشنیار.... تاد) بنەمایەكی (جامد)ە، دیموكراسییش ئەگەر پەرلەمانی هەبێت لەگەڵ سەردەمدا ناگونجێتو ئەگەر نەیبێت چیتر پێی ناوترێت دیموكراسیی.

---

[٧٦٩] ئایا شوورای ئیسلامی (مُلزِم)ە یان(مُعلِم)ە؟ دوو بۆچوونی جیاواز هەیە. ئێمەش هەرچەندە لێكۆڵینەوەیەكی وامان لەم بارەیەوە نەكردووە بەلام وای بۆ دەچین كە ئەمە بەجێهێڵراوە بۆ خەڵكەكە خۆیان رێك بكەون لەسەری. بەلام چونكە ئەم بڕیارەمان دەچێتە خانەی (فەتوا)، نایكەینە بڕیاری دوایەمین.

# دووەم — نوێنەرایەتی و ئەنجوومەنەکان:

لە تیۆری دیموکراتیدا کێشەی گەورەی نوێنەرایەتیمان بیلێن کە چلێن:

١- ئەمە حوکمی گەل نییە یەك ئەندامی پەرلەمان نوێنەری دەیان هەزار کەس بێت

٢- پاش حسابات ئەم ئەندامە نوێنەری ئەمانیش نییە بەڵکو نوێنەری کەمایەتییە

٣- سەرجەم پەرلەمانیش بۆ خۆی کەمایەتییە

لای ئێمە کێشەی وا نییە [٧٧]، چونکە نیزامی ئیسلامی وەکو دیموکراسیی لەسەر بناغەی ئەحوکمی گەل (یان: حوکمی خەیاڵیی گەل)و نە نوێنەرایەتی دامەزراوە. ئەگەر پەرلەمانێکی ئیسلامی هەبێتو هەر ئەندامێکی ئەو پەرلەمانە نوێنەری تەنانەت یەك ملیۆن کەسیش بێت هیچ لە شەرعییەتی حوکمی ئیسلامی ناگۆڕێت. لەمەوە دەزانین کە هەبوونی پەرلەمان لەگەڵ نیزامێکی حوکمی ئیسلامیدا دەگونجێت زیاتر لە دیموکراسیی.. بەڵام خەڵك ئەمە نازانن.

لەدەوڵەتیئیسلامیدا دەتوانین دوو ئەنجوومەن دابنێین، یەکەمیان ئەنجوومەنێك خەڵك هەڵیبژێرێتو ئەوەی تریان ئەنجوومەنی (زانایان). کاری ئەنجوومەنی دووەم بریاردان لەسەر شەرعیەتی بڕیارەکانی ئەنجوومەنی یەکەمو بڕیارەکانی دەسەلاتی بەجیهێنان. زانیشمان کە لە ژمارەیەك وڵاتی ڕۆژئاواییدا دوو ئەنجوومەن هەیە کە جێگەی رەخنەی زۆر کەس بوون چونکە ئەنجوومەنی دووەم بە زیاد دەزانن و دەڵێن کە ئەمەیان بەرهەمی بارودۆخێکی مێژوویی بووە چیتر سوودی نییە بەڵام ئەو وڵاتانە هەر هێشتوویانەتەوە.

---

وەنەبێت نوێنەرایەتی لە ئیسلامدا هەر نەبێت چونکە لەبەیعەتی (عەقەبە)ی دووەمدا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)بەر لە کۆچ کردنی دلوای لەو (٧٥)کەسەی مەدینەی کرد کە ئەوەیان (١٢) نەقیب هەڵبژێرن.. هەر نەقیبێکیان نوێنەری تیرەکەی خۆی بێت لەمەشدا رێـزەی زۆری دوو عەشیرەتی (ئەوس)و (خەزرەج) کرا، دووەم ژمارەی زۆرتر بوو بۆیە نۆ (نقیب)یان هەبوو.

وتبوومان کە عەیبێکی پەرلەمان بریتیە لە کارە هێواشەکانی کە بەکەڵکی سەردەم نایەن چارەسەرێکی ئەمەش بە هێزکردنی دەسەڵاتی بەجێهێنان بوو.
لای ئێمەش ئەم دەسەڵاتە هەر لەسەرەتاوە بەهێزە.

## سێیەم — دەسەڵاتی بەجێهێنان:

کە واتە دیموکراسیی بە ناچاری لە ئەسڵێکی خۆی لایدا (کەسەروەریی پەرلەمانە)و دەسەڵاتی بەجێهێنانی بەهێز کرد.. واتە واقیع ئەمەی پێ کرد لە کاتێکدا نیزامی ئیسلامی هەر لەسەرەتاوە رەچاوی واقعی کردووەو پێویستی بە کێشەی وا نەبووە تا حساب بۆ ئەم واقعە بکات.

دەسەڵاتی بەجێهێنان دەستێکی باڵای هەیە بەڵام بەبێ ئەوەی کە دەسەڵاتەکەی رەها بێت چونکە پابەندی چەند سنوورێکە کە گرنگترینیان سنووری شەرعە کە هەرچەندە دەتوانێت خۆی لە هەندێك فەرمانیەوە بدزێتەوە بەڵام ناتوانێت بە تەواوەتی بیخاتە ئەو لاوە چونکە لەو حاڵەتە شۆرشی چەکداری میللەت رێگەی پێ دراوە لە لایەن شەرعەوە بەڵکو (واجب)یشەو دەبێت بەرپا بکرێت.

## چوارەم: قەزا:

ئەویش هەر لە سەرەتاوەو بەبێ ململانەسەربەخۆیی بۆ دابین کراوە، تەنانەت لەبەشێکی سەردەمەکانی لا دانیشدا قەزا هەیبەتو سەربە خۆیی هەبووو بەزۆری لەو کاتانە ئەو هەیبەتو سەربەخۆییەی لەدەست دا کەقازییەکان خۆیان ترسنۆك یان فاسد بوون.

نموونەکان لەبارەی دەوری قەزا ئەوەندە زۆرو پرشنگدارن کە هەقە قەزا لەسایەی دیموکراسییدا ئارەقی شەرمەزاری بڕێژێت.

هاوڵاتی لە ئیسلامدا زەمانەتی قەزاییی زۆرە وەکو: حورمەتی خانوو، مافی ـ ـەی جاسووسیی لەسەر نەکرێت، لەسەر شتی ئاشکرا موحاسەبە بکرێت نەك لەسەر

شتی ناو دڵو دەروونە، لە ڕێگەی تەنها گومانەوە تاوانبار نەکرێت، زۆری لێ نەکرێت ئعتراف بکات،... تاد[771] . . .

## پێنجەم: لێك جیاکردنی دەسەڵاتەکان

زانیمان کە ئەم بنەمایە وەکو زەمانەتێك بۆ ئازادیی‌و مافەکانی تاکەکان تەماشا دەکرا بەڵام دەرکەوت کە جێگەی هیوا نەبوو چونکە:

١- کۆن بووەو بەکەڵکی سەردەم نایەت.

٢-بۆیە لایان داوە لێی وتا رادەیەك دەسەڵاتەکانیان تێکەڵ بەیەك کردووە.

لە ئیسلامیشداو بەبێ ئەوەی ئەمە بکرێتە بنەمایەکی نیزامەکە، لێك جیاکردنەکە تا رادەیەك هەیە وەك چۆن تێکەڵ بوونەکەش تا رادەیەك هەیە. نموونەیەکی لێك جیاکردنەکە چاودێرەکانی شەرع(زاناکان یان ئەنجوومەنی زانایان ئەگەر هەبێت)و سەربەخۆیی قەزا، نموونەی تێکەڵبوونەکەش بڕیار یان یاسا دەرکردن لە لایەن دەسەڵاتی بەجێهێنانەوە.

## شەشەم – دەستووریەت:

هەرچەندە دیموکراسیی‌و دەستووریەت یەك شت نین بەڵام لە دیموکراسییدا زۆر تەئکید لەسەر دەستووریەت کراوە. لە ئیسلامیشدا دەکرێت دوو دەستوور هەبن یەکەمیان دەستووری باڵا (قورئان‌و سوننەت یاخود شەرع بەشێوەیەکی گشتی) دووەمیشیان دەستوورێکی خواروو کە مەسەلە وردەکان دەست نیشان بکات.

---

[771] بۆ ئەم زەمانەتانە بڕوانە: محمد قطب، مذاهب فكرية معاصرة، ل ٢٣٧بەدواوە.

# حەوتەم — یاسادانان

یاسادانان لە ئیسلامدا دوو بەشە:

ئەوەی کە مافی شەرعە

٢- ئەو یاساو بڕیارانەی کە شەرع هیچ لەبارەیانەوە نالێت (وەکو: یاسای جۆنێتیی هەڵبژاردن، یاسای هاتووچۆ...)

سەبارەت بە جۆری یەکەمیش دوو تایبەتی بەدی دەکرێن:

١-(انضباط): مەفهومی (انضباط) لە زانستەکاندا بایەخێکی گەورەی هەیە. یاسادانانی ئیسلامیش (منضبط)ە واتە رێگە نادرێت مرۆڤ لە خۆیەوە قسە بکات بەڵکو دەبێت ئەو یاسایە بە پێی بنەما شەرعییەکان بڕیاری لەسەر بدرێت.

لە وڵاتە دەستوورییەکاندا، دەستوور رێگەی سەرەکیی(ضبط)ی تەشریعە، واتە دەبێت یاساکان لەگەڵ ئەو دەستوورەدا بگونجێت، بەڵام درێژترین دەستوور بریتییە لە بەڵگەنامەیەکی بچووک بۆیە رێگەی نارەزووو لادان کراوەیە.

٢-بەڵام لەگەڵ ئەو (ضبط)ەش (مرونة) یێکی گەورە هەیە چونکە (اجتهاد) بوارێکی فراوانە، بەڵام بەپێی ئەوە کە (ضبط)ەکە زاڵە. ئەمەش گرنگترە بۆ رێگە گرتن لە پشێویی یاسادانانو زاڵبوونی بەرژەوەندیو نارەزوو.

# هەشتەم: هەڵبژاردن:

زانیمان کە هەڵبژاردن دیموکراسیی پوخت بەدی ناهێنێتو کە هەتا ئەگەر نیزامی هەڵبژاردن بێ عەیبیش بێت ئەم هەڵبژاردنە بەشدارییەکی بەهێزی هاوڵاتتیان بە خۆیەوە نابینێت. بەڵام زانیشمان هەروا کە لە هەموو قۆناغەکانی هەڵبژاردندا (لەدەستنیشانکردنی پاڵێوراوەکانەوە تا دابەش کردنی کورسییەکانی پەرلەمان) حوکمی گەل زیاترو زیاتر بەناخی زەویدا دەچێت.

لە ئەنجامی ئەمەشدا هەر نیزامێکی تر کە (حوکمی گەل) ناکاتە ئەساسی خۆی لە دیموکراسیی زیاتر لە گەڵ هەبوونی هەڵبژاردندا دەگونجێت.

# نۆیەم — ئازادییەکان:

لە هیچ نیزامێکدا ئازادیی تەواوەتی نییە، سنوورەکانی ئازادیشمان لە دیموکراسییدا بینی. لە نیزامی ئیسلامیشدا ئازادیی سنووری هەیە بەڵام جیاوازییەکەی ئەوەیە کە ئەو سنوورانە بەپێی شەرعو یاسا بڕیاریان لەسەر دراوە لە کاتێکداو وەك بینیمان بەشێکی ئازادییەکانی ڕۆژئاوا بە شێوەیەکی (نظری) هەن بەڵام لە واقعدا سنووریان بۆ دانراوە.

سەرچاوەی ئازادیش لە ئیسلامدا هەروەها جیاوازە، سەرچاوەکە عبودیەتە بۆ خودا لەمەشەوە مرۆڤ بەسەر هەموو عبودیەتێك زاڵ دەبێت. ئازادیی لە ئیسلامداو بەر لە هەموو شتێك ئازاد کردنی دەروونی مرۆڤ پاشان دەوری یاساو نیزامو دەستوور دێت. ئەمەش لە کاتێکدا مرۆڤ لە سایەی نیزامەکانی تردا سەرچاوەی ئازادیی خۆی نازانێت، ئەگەر بشیزانێت لێڵو تەمومژاوی دێتە بەرچاوی. مرۆڤی نیزامەکانی تر کۆیلەی ئارەزووو نەفسە، کۆیلەی بەها ماددییەکانە، کۆیلەی ئەو هێزانەیە کە لە پشتی پەردەوە حوکم دەکەن.

بەم شێوەیە ئیسلام سەرەتا دەروونی مرۆڤ ئازاد دەکات پاشان ڕێگە لەچەند دوژمنێکی ئەو ئازادییە دەگرێت وەکو دەسەڵاتدارانی خۆسەپێنەر یان دیاردەی تێکدەر. خەلیفە ڕاستەقینەکان سەرۆکی فراوانترین دەوڵەت بوون بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕەخنەو ڕاستکردنەوەی خەڵکەکەیان قبووڵ دەکرد تا گەیشتۆتە ئەو حاڵەتە عەرەبێکی کۆچەر (اعرابی) بە (عومەر کوڕی الخطاب) کە بەهێزترین سەرۆك دەوڵەتی ئەو سەردەمە بوو بڵێت: ئەگەر مل خوار بکەیت (= لابدەیت لە ڕێگە) بە شمشێر بۆت لێ دەکەینەوە... (عومەر)یش بڵێت: سوپاس بۆ خودا کە لەناو ئوممەتی محمد (ﷺ) کەسانێك هەن لاری (عومەر) ڕاست بکەنەوە.

نموونە لەسەر ئازادیی تاکەکان لەبەردەم فەرمانڕەوادا زۆرن‌و هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ خاڵێکی سەرەکی ئەویش: مەبەستی حوکم.. مەبەستی حوکم لە ئیسلامدا هیدایەت کردنی خەڵكو بەرقەرار کردنی داد پەروەرییە... کە مەبەستەکەش ئەمە بێت

خەلیفەکە بەسنگ فراوانییەوە رەخنەو راستکردنەوە قبووڵ دەکات بەڵکو تەنانەت وەك ئەو خەلیفە راستەقینانە دەبێت و خۆی داوای ئەم راستکردنەوەیە لە خەڵك دەکات[٧٧٢] ئەمەش بەپێچەوانەی مەبەستی حوکم لە هەموو نیزامەکانی تردا کە دەستکەوتنی دەسەڵات یان سامانە، لەبەر ئەوە ئەونیزامە چۆن بۆی بکرێت ئاوا رێگە لەو ئازادییە دەگرێت کە دژ بەو مەبەستە بوەستێت، نیزامەکانیش لەمەدا مامەڵەی جۆراو جۆر لەگەڵ خەڵکدا دەکەن لەسەرکوت کردنی ئاشکرای ئازادییەوە تا سەرکەوت کردنی ناڕاستەو خۆ یان نا ئاشکرا.

غەیری ئەم ئازادییەی مرۆڤ بەرامبەر حاکمە ئیسلامییەکە، دەستنیشان کردنی ئازادییەکان لە دوو تۆی لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتدا زەروورەتێکی پێویستە. خوێنەریش بەتەما نەبێت موسڵمان جۆرو کەمیەتی ئازادییەکان هاوجووت بکات لەگەڵ ئەوانەی رۆژئاوا چونکە ئیسلام لە خاڵێکی جیاوازەوە دەست پێ دەکات بۆیە ئەنجامەکانیش یان بەشێك لەو ئەنجامانە جیاواز دەبن. بۆ نموونە ئیسلام رێگە بەو(اباحیة)ە نادات کە پێی دەڵێن (ئازادیی جنسی) چونکە جگە لەوەی کە ئەم بەناو ئازادییە رێگە یەکە بۆ بە کۆیلە کردنی مرۆڤ بۆ ئارەزووی جنسی هەروەها کارێکی خراپی هەیە لەسەر هەموو لایەنەکانی کۆمەڵگە، وەکو تێکدانی پەیوەندی خێزانی، کەم کردنی ژمارەی دانیشتوان لەبەر کەم بوونی زاوزێ[٧٧٣]، بڵاوبوونەوەی نەخۆشی کە دوایەمینیان (ئایدز)ەو هی تریش کە بەڕێوەن... تاد. بەم شێوەیە ناونانی ئازادیی لەم بەرەڵاییە دزێیەکە ئیسلام راستەوخۆ بەرپەرچی دەداتەوە.

---

[٧٧٢] دیسان خوێندنەوەی ژیانی چوار خەلیفەی یەکەم (هەروەها خەلیفەی‌ئەمەوی عومەر کوڕی عبدالعزیز) بەسە بۆ ئەوەی دیموکراسیی و ئازادیی رۆژئاوایی ئارەقی شەرم بڕێژن.

[٧٧٣] ئەمەش کە مەترسییەکی گەورەیە لەو میللە بچووکانەی کە هەڕەشەی تواندنەوەیان لەسەرە وەکو میللەتی کورد... بەڵام ئەو تاقمە کەمە سەرلە شێواوەی بانگخوازانی ((ئازادیی جنسی))و لەبەر ئارەزووی خۆیان ئاگایان لەو تاوانە نییە کە دژی میللەتەکەیان دەیکەن.

بەکورتی دەڵێین: ئیسلام بۆچوونێکی جیاوازی هەیە بۆ ئازادیی، ئێمەش پاشکۆی کەس نین‌و خۆمان پابەندی پێوانەکانی کەس ناکەین.. سەپاندنی پێوانـە ڕۆژئاواییـەکانی ئازادیش بەسەرماندا هەنگاوی یەکەمی زەوت کردنی ئازادییەکەمانە.

# دەیەم _ دەوڵەتی ئیجابی:

دەوڵەتی ڕۆژئاوایی لـەژێر فشاری ململانـەی کۆمەڵایـەتی‌و چینایـەتی‌و لـە ترسـی هەڕەشەی کۆمۆنیزم لە دەوڵەتێکی سلبیەوە (کە کارەکەی تەنـهاباج کۆکردنـەوەو سـوپا دامەزراندنە...) گۆڕا بۆ دەوڵەتی ئیجابی کە بایەخ بە لایەنەکانی فێرکردن‌و تەندروستی‌و کاری خزمەت گوزاریی‌و زەمانەتی ژیان... دەدات.

دەوڵەتی ئیسلامی هەر لـە سـەرەتاوە دەوڵـەتێکی ئیجابی بـووەو قـەد دەوڵـەتی سلبیی بەخۆیەوە نەدیوە تەنانـەت لەسـەردەمەکانی لادانیش. ئەمـەش دەگەڕێتـەوە بۆ مەبەستی حوکمی ئیسلامی کە دەوڵەت دەوڵـەتی (هدایـة لا جبایـة) بێـت، واتـە دەوڵـەتی هیدایەت بێت نەك دەوڵەتی پارە کۆکردنەوە.... بەڵام دەوڵەتی ڕۆژئاوا هەر لەسەرەتاوە دەوڵـەتی (جبایـة) بـوو، تەنانـەت پەرلـەمانیش لەسـەر ئـەم ئەساسـە دامـەزرابوو. زۆر سەیریشە: ئەوانەی بەنیزامی هەندێك وڵاتی ئەوروپی سەرسام بوون نازانن بەر لـە (١٤٠٠) ساڵ دەوڵەتی ئیسلامی ئەو کارانـەی دەکـرد کـە ڕۆژئـاوا ئـەمڕۆ دەیکـات وەك زەمانـەتی کارکردن‌و زەمانەتە کۆمەڵایەتییەکان... پارەی زەکات‌و خەراج کە حکومەتی هەرێمەکـە خۆی کۆی دەکردەوە دەبوو هەر لەو هەرێمەدا سـەرف بکرایـە بۆیـە جـاری وابـووە پـارە دەمایەوەو ئەو پارەیە کۆیلەی پێ ئازاد دەکراو قەرزی خـەڵکی پـێ دەدرایـەوە تەنانـەت ئەگەر پارە بمایەتەوە ژنیش دەهێنرا بۆ ئەو کەسانەی ژنیان نەبوو.

***

زۆربـەی خـەڵك بێ ئاگـان لــە نـیزامی ئیسـلامیی ڕاسـتەقینەو لـە عەیبـەکانی دیموکراسیی... ئەم دوو نەزانینیەش کاتێك کۆدەبنەوە حاڵەتی خۆ بەکەم زانین بەئەنجام دەهێنن.. مرۆڤیش کـە خـۆی بەکـەم زانـی قـەد هـەنگاو بـەرەو پێش نابـات، نەئەوەیە دەوڵەتێکی دیموکراسیی بەهێز دابمەزرێنیت، نە ئەوەشە سـوود لـە نیزامـە ئیسـلامییەکە وەربگرێت... مرۆڤی خۆ بەکەم زان هەمیشە دوو دڵ‌و بێ هێزە.

ئێمە بڕوامان بەو نیزامە ئیسلامییە هەیە، دەشزانین کەوا لادان لای ئێمە لادانە لەو ئەساسە(نظري) یەکەلەکاتێکدا دیموکراسیی یان هەر ئاینێکی زەمینیی تر بەر لەوەی‌و بەپاڵ ئەوەی کە لادانەکە لە کاتی چەسپاندندا هەیە، هەروەها عەیبەکە لە ئەساسە فیکرییەکەدا هەیە... کێشەکەش ئەگەر تەنها کێشەی چەسپاندنی هەڵەو لادان بێت ئەمە عەیبێکەو کەمو کورتییەکە بەڵام ئەگەر کێشەکە هەروەها لە ئەساسە فیکرییەکەدا هەبێت ئەمە لەعەیب دەردەچێت‌و کارەساتێکە بۆ خۆی.

# دوا رۆژی دیموکراسیی

سەرجەم تەمەنی ئەم دیموکراسییە لەسێ سەدە تێپەڕ ناکات، بەڵام تەمەنی وەك نیزامێك کە لە رۆژئاوادا بڵاو بۆتەوە لەسەدەیەك کەمترەو لەوە ناچێت زۆری تر بژی. دیموکراسییەکەی یۆنان دیموکراسیی سەردەمێکی ساکاری تەکنەلۆجیای بوو بۆیە ئەوەندەی خایاند ئەگینا ئەگەر بۆمبی ئەتۆمی و مانگی دەستکردو تەکنەلۆجیای کۆمپیوتەرو بەپاڵ ئەمانەشدا ئاواتی دەستگرتن بەسەر هەموو جیهاندا... ئەگەر هەموو ئەمانە لەو کاتەدا هەبوونایە دیموکراسییە کۆنەکە زۆر لەوە کەمتر دەژی، بە تەئکیدی رووناکیشی نەدەبینی.

***

کابرایەکی ئەمەریکی و بەئەسڵ ژاپۆنی ناویانگێکی گەورەی دەرکرد(یان ناویانگی بۆی دەرکرا) چونکە چەند تورەهاتێکی نووسی و ئارەزووی دەسەڵاتدارانی ئەمەریکای ورووژاند، ئەمەش ئەگەر خۆیان هانیان نەدابێت. (فوکویاما) ی فەرمانبەر لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا لە وڕێنەیەکیدا بە ناونیشانی (کۆتایی مێژوو) نیزامی دیموکراسیی لیبرال[774]، هەروەها بازاڕی ئازادیی بە دوایەمین نیزام زانی... ئەوەیە نەزانی ! کام نیزامە تا سەر مایەوە؟ بەهەر حاڵ ئێمە (فوکومایا) وەك ئەو کێوییە دوا کەوتووە دەبینین کە دەچووە (رۆما) – یان هەر مەرکەزێکی تری شارستانیەت و سەری دەسوڕما لەو پێشکەوتن و مەزنێتی و رووالەتە بریسکە دارەکانی پایتەختی ئیمپراتۆریەتەکە. چونکە ئەو کێوییەش لە قەراغی شارستانییەتدا دەژی ئەم رووالەتانە لایەنە داڕووخاوەکانی

---

[774] پێشتر باسی پاشە کشێی لیبرالیەتمان کرد. ئەم بانگەشەیەی (فوکویاما)ش بۆ لیبرالیەت تا رادەیەك بە بانگەوازێکی کۆمپانیاکان و سەرمایەداران بۆ دورخستنی دەوڵەت لە کارو باری کۆمەڵگەو بۆ زیندوکردنەوەی (دەولەتی سلبی) ی دەزانین.

شارستانییەتەکەیان لێ شاردۆتەوە، ئەو تەنها بینای بەرزو شاری گەورەو نیزامو سوپاو شانۆو شاعیران... دەبینێت.

یان ئەو هاوڵاتییەی وڵاتێکی بچووکی ڕۆژهەڵات کە مەزنێتیی دەوڵەتی ئاشووری دەبینی لەسەردەمی (ئاشووربانیپال)داو دەیبینی چۆن میرانو پادشایانی وڵاتان کۆمەڵ کۆمەڵ دێنو دیاریو سەرانەی خۆیان دەهێنن بۆ پادشای ئاشور، پادشای جیهان، بێ ئەوەی بزانن کە هەمووی چارەکە سەدەیەکی تر ئەم دەوڵەتە لەناو دەچێتو قەد جارێکی تر سەرهەڵنادات‌ەوە.

(فوکویاما) هەرچەندە لە ئەمەریکادا دەژی بەڵام عەقڵو دڵی ئەو دولکەوتووە کێوییە سەرسامانەی هەڵگرتووە ... ئەگەر پارەو پایەشی وەرنەگرتبێت لەسەر ئەم سەرسامەیە. پێشبینییەکەی (فوکویاما) ش دەستپێکەرێك لە(فەلسەفەی مێژوو) نا خەڵە تێنێت کە دەزانێت کەوا (کۆتایی مێژوو) لەگەڵ (هێگل)و مارکسدا مردو نەژیایەوە. مەگەر خۆ بەکەم زانێك کە ئامادەیە چی فێر بووە بیخاتە ئەو لاوە بۆ ئەو تەفامەتە نوێیەی کە لە قەبیلەی ڕەنجبەرانەوە هاتووە.

***

وتراوە کە دیموکراسیی خەونی سەدەی (١٨) بوو دەستکەوتی سەدەی (١٩) بوو کێشەی سەدەی (٢٠)ە[775].

لیبراڵییەکانی سەدەی (١٩) وەکو (دوتوکڤیل)و (جۆن ستیوارت میل) لەوەدەترسان دیموکراسیی ببێتە ستەمکاری دژ بە ئازادیی مرۆڤ زیاتر لە نیزامەکانی تری حوکم... ترسی ئەوان لەوەبوو کە ڕەنگە دیموکراسیی ببێتە ستەمکاریی زۆرینە[776].

بەڵام دەرکەوت کە مەترسییە گەورەکە ئەمە نەبوو بەڵکو گەورەبوونی دەسەڵاتداران (ڕەسمیو ناڕەسمی) بوو. سامانی زۆرو تەکنەلۆجیای پێشکەوتوو لەلایەکو سلبیەتی خەڵكو هەوڵیان بۆ پارە پەیدا کردنو رابواردنو ((ژیانی خۆش)) لەلایەکی تر دەسەڵاتێکی گەورەی بەمان بەخشی.

---

[775] Charls Blitzer, Democracy, Encycl. International, Vol. 5, p. 526.
[776] Ibid. p. 525.

ئایا دیموکراسیی تا چەند بەرگەی تاقیکردنەوەی سەخت دەگرێت ؟ پاش جەنگی یەکەمی جیهانی دیموکراسیی کەوتە بەر تاقیکردنەوەیەکی گەورە لەلایەن فاشیەت و کۆمۆنیزمەوە. جەنگی دووەمی جیهانیش و بەزینی فاشیەت لە مەیدانی سەربازیدا تەمەنێکی تری بە دیموکراسیی بەخشی واتە لایەنە باشەکانی دیموکراسیی سەرنەکەوتن بەڵکو هاوپەیمانە سەربازییەکەی دژ بە فاشییەت سەرکەوت، بەلام یەکسەر دوای ئەوە مەترسییەکی نوێ سەری هەڵدا: مەترسی کۆمۆنیزم.

دیموکراسیی لەم تاقیکردنەوەیەشدا وبە هۆی هەرەسی کۆمۆنیزمەوە تەمەنێکی تری وەرگرت.. ئەم جارەش لایەنە باشەکانی دیموکراسیی سەرنەکەوتن بەڵکو بێ کەڵکی و ستەمی کۆمۆنیزم، دیموکراسییان سەرخست. ئەی ئەگەر مەترسییەکی نوێ سەرهەڵبدات ؟.

پێویستە دەسەڵاتدارانی رۆژئاوا ئەگەر دڵسۆزی دیموکراسیی کارتۆنییەکە بن رێگە بگرن لە سەرهەڵدانی مەترسی نوێ بەلام ئەم جارە ئەمان یاری بەئاگر دەکەن و مەترسییەکان ((دروست دەکەن)) بۆ ئەوەی عەقڵ و خەڵك ئامادەی جەنگ بێت و بەرەزامەندیی ئەوانەوە باجە زۆرەکان بدەنە حکومەت و حکومەت بەو باجانە هێزە سەربازییەکەی مەزنتر بکات، حکومەت نهێنی لە کارەکانیدا بپارێزێت و چاو و گوێی خەڵکی لێ دوور بخاتەوە ... خەڵکەکەش ناپرسن: ئەگەر کۆمۆنیزم هەرەسی هێنابێت و پەیمانی (وارشۆ) هەڵوەشا بێتەوە ئیتر بۆ چی پەیمانی (ناتۆ) هەڵناوەشێنن بەڵکو لە جیاتی ئەوە گەورەترو فراوانتری دەکەن ؟

دەبێت خەڵکی رۆژئاوا هەر لەترسدا بژین، ئەمە جگە لە ترسەکانی دیکەیان وەك ترس لە بێ کاری، لەدوا رۆژی نادیاری کەسەکان، لە تەنیایی، لە ئایدز و هاوجۆرەکانی، لە مردن...

(لاسکی) زوو وتبووی کە بەر لە سەدەیەك دەوترا کەوا دەتوانین باوەڕ بە پێشکەوتن بهێنین هەرچەندە هەڵەکەمان زۆر بن بەلام ئەمڕۆ (سەردەمی لاسکی) ئەم

دڵنیاکردنانەمان دەست ناکەوێت.... شارستانییەکەمان ترس رایگرتووە زیاتر لەوەی کە خواستی باش رایگرتبێت[٧٧٧].

مانەوەی ترس لەبەرژەوەندیی دەسەڵاتدارانە، هەر ئەو ترسەشە کە سبەینێ پاڵ بە گەلانی رۆژئاوا دەنێت بە شێوەیەکی رەسمی هەموو دەسەڵاتەکان بخەنە دەستی فەرمانڕەوایان.. ئەگەر ترسیش نەبێت ئەوا گەندەڵیی ژیانی سیاسیو کۆمەڵایەتی بەسە بۆ نەهێشتنی دیموکراسییە یەك کەوتووەکەی ئەمڕۆ، یەکێکیش لە رووەکانی گەندەڵییەکە ئەو سلبیەتەی جەماوەر کە رۆژ لە دوای رۆژدا زیاد دەکات چونکە جەماوەر رۆژ لەدوارۆژ زیاتر نوقمی ژیانی ماددیو رابواردنو کات بردنە سەرو تلیاکی کیمیاییو گیایو دەروونیو فیکری...تاد دەبێت.

پاش جەنگی دووەمی جیهانی فەیلەسووفو زانای بەریتانی (بێرتراند رەسڵ) دەیوت کەوا بەردەوام نامەی پێ دەگەشت کە نووسەرانیان دەیانوت: جیهان خراپە، یەك کەس دەتوانێت چی بکات؟ ژیان لەناو دەستی کەمێك خەڵکدایە، ئاشتیو جەنگ لە دەستی ئەواندایە، فەرمانڕەواکانو کۆمپانیا گەورەکان بریار لەسەر کاروبارە ئابوورییەکان دەدەن، تەنانەت کە بەناویش دیموکراسیی هەبێت بەشی هاوڵاتی لە ئاراستەکردنی سیاسەتدا شتێکی زۆر بچووکە.. کەواتە باشتر نییە کاروباری گشتی (واتە مەسەلەکانی سیاسەتو کۆمەڵایەتی..) لەبیر خۆمان بەرینەوەو زۆرترین لەزەتو خۆشی وەربگرین بەهەر شێوەیەك باروبۆخەکە رێگەی پێ بدات؟[٧٧٨]

وەڵامەکە دەمێکە دراوەتەوە، هەر لەکاتی ئەو نامانەدا؛ خەڵکەکە دەمێکە رووەو ئەمە چوون... ئەی چارەسەر چییە؟ چارەسەری عەیبەکانی دیموکراسیی بەخشینی دیموکراسییەکی زۆرتر وەك زۆر کەس بڕوایان وابوو؟ بەڵام ئەمە هەموو کێشەکانی چارەسەرنەکرد بۆیە زۆر کەس گەشتنە ئەو قەناعەتەی کە چارەسەرکردنی ناخۆشییەکانی دیموکراسیی بەوە دەبێت کە دیموکراسییەکی کەمتر ببەخشرێت[٧٧٩]

---

[٧٧٧] هـ. لاسکی، اصول السیاسة، ج١، ل٥٠.

[٧٧٨] ب. رەسڵ، السلطة والفرد، ل ٥٠.

[779] Ch. Blitzer, Democracy, Op. Cit, p. 525.

یەکێك لە نەخۆشییەی کوشندەکانی دیموکراسیی‌و هەموو نیزامێکی حوکم بریتیە لە (لاوازیی رەوشت)و کە لە لایەن هەندێك بیریاری رۆژئاواییەوە نەبێت لەبیرکراوە.

لاوازیی رەوشت خۆپەرستی‌و سلبیەت لای خەڵك دروست دەکات‌و ئەمانە رێگە بۆ حوکمی کەمایەتی خۆش دەکەن. خەڵکی رۆژئاوا ژیانێکی گەندەڵ دەبەنە سەر.. (مەکیاڤیللی)ش بەر لەپێنج سەدە ئەو یاسایەی زانیبوو کە ئەمڕۆ پشت گوێ خراوە: موستەحیلە نیزامێکی کۆماری لە وڵاتێکدا بپارێزرێت ئەگەر دەوڵەتەکە گەندەڵ بوویێت[780].

دەشڵێت کەوا بەئاسانی دەتوانرێت خەڵك گەندەڵ بکرێن هەرچەندە باش بن یان بەباشی پەروەردە کرابن[781]. لەبەر ئەوەش دەڵێت کەوا تەمەنی حکومەتە باشەکان تەمەنێکی کورتە[782]. نووسەرێکی رۆژئاوایی نوێش دەڵێت کە دیموکراسیی ناتوانێت بۆ ئەگەر رێك نەخات نێوان (مادده)و(گیان)[783]. بەلام لەلایەك پێمان دەوترێت کە دیموکراسیی نەمرەو لەلایەکی‌تر دیموکراسیی بە زمانی ژمارە (هەڵبژاردن، ژمارەی کورسییەکان... تاد) خۆی دەنوێنێت‌و مەسەلە هەرە گرنگەکە لە بیر کراوەتەوە: مرۆڤ.

مرۆڤ گرنگە لە هەر نیزامێکی حوکمدا.... دیموکراسیی‌و هەموو ئایینێکی زەمینی‌و هەموو نیزامی حوکمی تر رێگە بە گەندەڵ بوونی مرۆڤ دەدەن، ئەمەش گەندەڵیی سیاسەت دەگەیێنێت، هەموو بیناکەش لەوەبەدواوە تەنها قاوغەکەی دەمێنێتەوە.

---

[780] مطارحات مكيافلي، ل ٢٩١.

[781] مطارحات مكيافلي، ل ٣٦٢-٣٦٣.

[782] مطارحات مكيافلي، ل ٢٢١.

[783] ل. د. بۆڵدوین، الديمقراطية امل الانسانية الاكبر. ل ١٤٥.

# با خۆمان ماندوو نەکەین

ئەمڕۆ رۆژئاواو بە تایبەتی ئەمەریکا دەیانەوێت دیموکراسیی بە سەرماندا بسەپێنن، دەبێت کەسایەتیی خۆمان لە دەست بدەین‌و خۆمان لەگەڵ دیموکراسیدا بگونجێنین. بەڵام ئێستا بۆمان دەرکەوت دیموکراسیی چەند پڕ لە ناڕێکی‌و عەیبەو تەنانەت لە رۆژئاوا خۆشیدا تەنها قاوغەکەی ماوەتەوە. زانیشمان کەوا ئەو دیموکراسییەی کە رۆژئاوا دەیەوێت لە رۆژهەڵاتدا بچەسپێنرێت چاپی هەرە خراپی ئەو دیموکراسییە پڕ عەیبەیە، بەڵام هێشتا ئەو چاپە خراپەش بۆ هەندێك وڵاتەو هەندێك وڵاتی تر پێویستیان بە دیکتاتۆرییەتە. لەناو ئەم گێژاوەشدا لە خۆمان ناپرسین: ئەی بۆچی ئەوان بیروباوەڕەکانی ئێمە وەرناگرن، هیچ نەبێت بۆچی دیموکراسیی خۆیان لەگەڵ ئەو بیروباوەڕانەمان ناگونجێنن؟

دەڵێم با خۆمان ماندوو نەکەین: رەنگە تاکو ئێمە چارەکی چاپە خراپەکەی دیموکراسی بەدی دەهێنین رۆژئاوا خۆی بێزاری لە دیموکراسی دەربڕێت‌و فڕێی بداتە ئاوی گەورەترین ئۆقیانووس. ئەو کاتە پێویستە ئێمەش بینا شەق‌و شڕەکەمان تێك بدەین‌و بوەستین تا نەخشەیەکی تری خانوویەکی ترمان لە رۆژئاواوە بۆ دێت.

ئەگەر فاشییەت سەری هەڵدایەوەو زاڵ بوو، یان ئەگەر ئوسوڵیەتی نەصرانی سەرکەوت‌و ئاڵاکانی بەرز کرانەوە، ئەگەر...، ئەگەر...، دەبێت حاڵی ئەو کەسانە چی بێت کە ئەمڕۆ بانگەشەی دیموکراسیی دەکەن؟ با لەیادمان نەچێت: ئەوانەی کە بەڕاستی‌و قەناعەتەوە باوەڕیان بە دیموکراسیی هەیە نەك زۆربەی هەرە زۆری لایەنە سیاسییەکان کە ئەوەی ئامادە نین بیچەسپێنن دیموکراسییە.

با خۆمان ماندوو نەکەین، با شوێنی وەهم نەکەوین، با بەزینی دەروونی‌و ئیفلاسی فیکری خۆمان بە میکیاجی ساختەی دیموکراسیی دانەپۆشین، دیموکراسیی تەمەنی هەیە، با خۆمان بەو تەمەنەوە نەبەستینەوە، رۆژێك دێت خۆی مەرگی خۆی ئعلان دەکات، با رێگەی خۆمان بگرینە بەر، بینای خۆمان دروست بکەین.. ئەمەیە ئەو کارەی کە شایستەی ئەوەیە خۆمانی بۆ ماندوو بکەین.

# کۆتایی گەشتەکەمان

پاش خوێندنەوەی ئەم کتێبە مرۆڤی زۆر شتی تێدا بۆ ڕوون دەبێتەوە، ڕەخنەگرانیش هاوار دەکەن: چۆن شتی وا دەبێت؟ شتی وا کەی هەیە؟ ئێمەش دەڵێین: شتی وا هەیە، چونکە ئەمە یەکەم جار نییە ڕۆژئاوا بمانخەڵەتێنێت یان خۆمان بە ڕۆژئاوا بخەڵەتێنین.

هەندێك لەو ڕەخنەگرانە (کێویەکان)، واتە: ئەوانەی بە ڕێگاوبان و نیزام و خزمەتگوزاری...تادی ڕۆژئاوا سەرسام بوون.. ئەوانەی کە وەکو ئێمە ئەمڕۆ لە پەراوێزی مێژوودا ماونەتەوە بەڵام بە پێچەوانەی ئێمەوە نایانەوێت لەو پەراوێزە دەربچن.

هەندێك لەوانە ئەو ڕۆژهەڵاتییانەی کە لە ڕۆژئاوادا دەژین، (کێوییەت)ی خۆیان لەگەڵ خۆیاندا بردووەو زیاتر لە جاران هەست بە پەراوێزێتیی خۆیان دەکەن.

هەموو ئەم ڕەخنەگرانە شتە شاراوەکانی ڕۆژئاوا نابینن.. هەقیشیانە شتە شاراوەکان نەبینن، چونکە زۆربەی خەڵکی ڕۆژئاوا خۆی نایانبینن. تەنها بڕیاران دەزانن، بەڵام چەند کەس گوێی لەم بڕیارانە گرتووەو چەندی دیکە ئەمڕۆ گوێیان لێ دەگرێت؟

بڕیارە سەرسەختەکانی لێ دەرچێت، ئەوانەی دیکە کە عەیبەکانی دیموکراسی دەزانن بێ هیوا ببوون، بێ هیوا لە سلبیەتی خەڵك، لە چەواشەکاریی، لە هەبوونی بەدیلێك.

(بارتێلوس) بۆ نموونە ڕەخنەی خۆی هەیە لە دیموکراسی. بەڵام هەست بەو بێ هیوابییەی دەکەیت کاتێك دەڵێت (زەحمەتە بەرامبەر دیموکراسی بوەستیت)... کێشەکە کێشەی نەبوونی بەدیلە. بەڵام ئەمە چ پەیوەندییەکی هەیە بە ئێمەوە؟ ئێمە بەدیلمان هەیە ئیتر بۆچی کێشەکەی ئەوان هەڵبگرین؟ بەدیلەکەمان چارەسەری نەخۆشییەکانی ئەوان و هەموو جیهانیشی تێدایە ئیتر بۆچی بە ئەزموونی تاڵو ڕێگەی سەرلێشێواوی (تاقیکردنەوەو هەڵە)ی ئەواندا بڕۆین؟ بۆچی لە تەکنەلۆجیای پێشکەوتوو بێ بەشمان

دەکەن بەڵام دەبێت کێشەکانیان هەڵبگرین؟ پاشان ئەو رێگە چەوتانەمان لە لا بکەنە رێگەی چوون بەرەو بەهەشتی سەرزەویی؟

ئێمە خاوەن بەدیلێکی جیهانین... بەڵام تاوانەکە هی خۆمانە کە قەناعەتمان پێی نییە، قەناعەتمان بەو بەدیلە نییە... یان وەکو نەزانە خۆ بەشت زانەکان دەڵێن: ئەڵترناتیف!! ئەوانەی کە کاتێك گوێیان لێ دەگرێت وشەی رۆژئاوایی دەجوونەوە: ریفراندۆم، کاندیدا، ئۆپۆزسیون... وا دەزانێت هیچ نەماوە لە دیموکراسی‌و سیاسەت‌و فیکر نەیزانن... ئەمانە یەکێکن لە کارەساتەکان، بەشێکیش لەمانە ئەو کەسانەن کە لە سایەی دەسەڵاتی ئەواندا مەهزەلەکەی رۆژئاوا کە پێی دەوترێت (دیموکراسی) بۆتە مەهزەلەی مەهزەلە.

***

وتمان دیموکراسی نیشانەی کۆیلێتی گەلان‌و تاکە کەسانمانە، ئەوەش کە بانگەشەی بۆ دەکات بزانێت یان نەزانێت دیفاع لەو کۆیلێتییە دەکات... بەڵام ئایا هەموو خەڵکی رۆژهەڵات کۆیلەن؟ هەموو مرۆڤێکی ئامادەی ئەو کۆیلێتییەیە!.

ئەم کتێبە لە کوردستاندا دەرچووو خوێنەری ئەم وڵاتە یەکەم کەسە بیخوێنێت... ئێمەش روودەکەینە ئەو خوێنەرەو دەڵێین: بۆچی لێرەوە کۆت‌و زنجیری ئەو کۆیلێتییە تێك نەشکێنین؟ بۆچی قسەی (فوکویاما) بەدرۆ نەخەینەوە کە خەڵکی ئەم وڵاتەی لە پەراوێزی مێژوودا داناوە (کە ئەمە بۆ خۆی راستە)و پێشبینی کردووە کە هەر لەو پەراوێزەدا بمێنێتەوە؟ بۆ لێرەوە ئەعلانی شکاندنی بتەکان و پووچەڵ کردنی ئایینە زەمینییەکان نەکەین؟ وەك چۆنیش کەشتییەکەی (نوح) لەم وڵاتەدا نیشت‌و سەرەتایەکی نوێی دیکەی مرۆڤایەتیی ئەعلان کرد.. با هەر لەو وڵاتەوە سەرەتایەکی نوێی مرۆڤایەتیی تۆمار بکەین‌و بێ ترس راستیی دیموکراسی ئاشکرا بکەین‌و ملکەچی ئەو تۆقاندنە فیکرییەی رۆژئاوا نەبین کە دەیەوێت رەفزی دیموکراسی نەکەین‌و خۆمانی لەگەڵ بگونجێنین بەڵکو لەوەش زیاتر پەیامی خۆمانی پێشکەش بکەین کە پێویستە هەروەها پەیامی ئەویش‌و هەموو جیهانیش بێت.

ئەمە بانگەوازێکە بۆ ئازادیی؛ ئازادیی خۆمان، ئازادیی جیهان، بانگەوازێکە بۆ بینینی دەوری گەورە لە جیهاندا.. خودا پەیمانی سەرخستنی پەیامەکەی داوە، ئەگەر

خەڵکی ئەم وڵاتەش ئاڵای ئەو پەیامە بەرز ئەکەنەوە میللەتی موسڵمانی تر ئێرن کە خودا ئەو شەرەفەیان پێ ببەخشێت.

جیهان پەکی لەسەر ئێمە نەکەوتووە، ئێمە پەکمان لەسەر ئەو پەیامە کەوتووە، دواڕۆژیش چەند دوور بێت هەر دەبێ بێت.

﴿والله غالب على امره ولكن اكثر الناس لا يعلمون﴾

# سەرچاوەکان[784]

## یەکەم/ بە زمانی عەرەبی:


١- اوستن رني، سياسة الحكم، الجزء الأول، ت. الدكتور حسن على الذنون، مراجعة إيليا زغيب، بغداد، ١٩٦٤ (ئەسڵەکە: ١٩٥٨).

٢- اوستن رني، سياسة الحكم، الجزء الثاني، ت. الدكتور حسن على الذنون، مراجعة الدكتور حسين عبدالقادر، بغداد، ١٩٦٦ (ئەسڵەکە: ١٩٥٨).

٣- أوستن رني، قنوات السلطة أو تأثير التلفزيون في السياسة الأمريكية، ت. موسى جعفر، مراجعة رشيد ياسين، بغداد، ١٩٨٦ (ئەسڵەکە: ١٩٨٣).

٤- هارولد لاسكي، الديمقراطية الأمريكية في السياسة والإقتصاد، ت. الدكتور راشد البدوي، مكتبة الأنجلو المصرية، ١٩٦٠.

٥- هارولد لاسكي، الدولة في النظرية والتطبيق، ت. كامل زهيري و أحمد غنيم، بيروت، ط٢، ١٩٦٣ (ئەسڵەکە:١٩٣٥).

٦- هارولد لاسكي، مدخل الى علم السياسة، ت. عزالدين محمد حسين، مراجعة علي أدهم، ١٩٦٥.

٧- هارولد لاسكي، أصول السياسة، ج١-٤، ت. إبراهيم لطفي عمر و محمود فوزي عمر، مراجعة الدكتور بطرس بطرس غالي، القاهرة، سنة؟.


---

[784] بەپێی تولنا ساڵی دەرچوونی ئەسڵی کتێبە وەرگێردراوەکانمان نووسیوە، هەروەها لە ناوەڕۆکدا بە پێی تولنا ناوی غەیری عەرەبیمان بەو شێوەیە نووسیوە کە لە زمانی خاوەنەکەیدا دەوترێت، بەڵام لە لیستی سەرچاوەکاندا بەو شێوەیە نووسیومانن کە لە وەرگێڕانی عەرەبیدا هاتوون بۆ نموونە؛ لەوەرگێڕانی عەرەبیدا ناوی (ماکیفەر) هاتووەو بەم شێوەیە لە لیستی سەرچاوەکاندا نووسیومانە بەڵام لە ناوەڕۆکی کتێبەکەماندا نووسیومانە (مەکئایفەر). ئەو ناوەش کە نیشانەی پرسیار(؟)ی لەبەردەمدایە مانای ئەوەیە دڵنیا نە بووین لە لەفزە تەواوەکەی.

٨- هارولد لاسكي، حقوق الإنسان، ت. دمقراطي عربي، بغداد، ١٩٤٢.

٩- برترلند رسل، هل للإنسان مستقبل، ت. علي حيدر سليمان، بغداد، ١٩٨٥، (ئەسڵەکە: ١٩٦١).

١٠- برترلند رسل، السلطة والفرد، ت. شاهر الحمود، بيروت، ١٩٦١.

١١- برتراند رسل، الفلسفة والسياسة، ت. الدكتور عبدالرحمن القيسي، بغداد، ١٩٦٢ (ئەسڵەکە: ١٩٤٦).

١٢- الدكتور عبدالحميد متولي، الوجيز في النظريات والأنظمة السياسية ومبادئها الدستورية، ١٩٥٨-١٩٥٩.

١٣- موريس ديفرجيه، النظم السياسية، ت. أحمد حبيب عباس، مراجعة الدكتور ضياء الدين صالح، القاهرة، سنة؟.

١٤- دانيد كوشمان كويل، النظام السياسي في الولايات المتحدة، ت. توفيق حبيب، القاهرة، ١٩٥٥ (ئەسڵەکە ١٩٥٤).

١٥- أرنست س. گريفيث، نظام الحكم في الولايات المتحدة، ت. الدكتور عبدالمعز، القاهرة، سنة ؟ (ئەسڵەکە ١٩٥٤).

١٦- كلنتون روسيتر، النظام الرئاسي في الولايات المتحدة، ت. سمير سالم، بيروت، سنة ؟، (ئەسڵەکە ١٩٥٦).

١٧- هارولد زينك، هوارد پينيمان، جيسي هاثورن، نظام الحكم والسياسة في الولايات المتحدة، ت. محمد صبحي، سنة ؟، (ئەسڵەکە ١٩٥٨).

١٨- ليونارد ليڤي و جون روش، منهج السياسة الأمريكية الداخلية، كيفية عمل الحكومة والعلاقة بين شبح العقيدة وجوهر العمل، ت. الدكتور محمد ناعم سعيد، مراجعة الدكتور نصري الخوري، ١٩٦٦.

١٩- جون بيتي، الستار الحديدي حول أمريكا، ت. عبدالمنعم صادق، مراجعة عثمان نوية والدكتور محمد متولي، القاهرة، سنة ؟.

٢٠- البير كان، الخيانة العظمى، ت.أحمد غربية، ج١-٢، بيروت، سنة ؟.

٢١- هربرت أ. شيللر، المتلاعبون بالعقول، ت. عبدالسلام رضوان، سلسلة عالم المعرفة، الكويت، ١٩٨٦ (ئەسڵەکە ١٩٧٤).

٢٢- الدكتور محمد كامل ليلة، النظم السياسية، الدولة والحكومة، ١٩٦٧-١٩٦٨.

٢٣- الدكتور طعيمة الجرف، نظرية الدولة، نظرية الدولة والأسس العامة للتنظيم السياسي، القاهرة، ١٩٦٤.

٢٤- الدكتور ابراهيم درويش، الدولة، نظريتها وتنظيمها، دراسة فلسفية تحليلية، القاهرة،١٩٦٩.

٢٥- الدكتور سعد عصفور، القانون الدستوري، القسم الأول، مقدمة القانون الدستوري، الأسكندرية، ١٩٥٤.

٢٦- الدكتور علي غالب خضير العاني والدكتور نوري لطيف، القانون الدستوري، الجزء الأول (به رؤنيؤ راكيشراوه) جامعة بغداد، ١٩٨٦-١٩٨٧.

٢٧- رويرت م. ماكيفر، تكوين الدولة، ت. الدكتور حسن صعب، بيروت، ١٩٦٦، (ئەسلەكە ١٩٤٧).

٢٨- جاك دونديو دو فابر، الدولة، ت. الدكتور سموحي فوق العادة، بيروت، ١٩٧٠.

٢٩- روبير بيلو، المواطن والدولة، ت. نهاد رضا، بيروت، ١٩٦١.

٣٠- جورج بوردو، الديمقراطية؛ محاولة تركيبية، ت. سالم نصار، بيروت ١٩٦٣ (ئەسلەكە ١٩٥١).

٣١- صول ك. پادفر، معنى الديمقراطية، ت. جورج عزيز، القاهرة،١٩٦٧ (ئەسلەكە ١٩٦٣).

٣٢- أدوار بنيش، هذه هي الديمقراطية، ت. حسن صعب، ١٩٤٧، (ئەسلەكە ١٩٤٤).

٣٣- دليصل بيرنز، الديمقراطية، ت. محمد بدران، ١٩٣٨، (ئەسلەكە ١٩٣٤).

٣٤- مجموعة من المؤلفين، المثقفون والديمقراطية، ت. الدكتور خليل أحمد خليل، بيروت، ١٩٨٠.

٣٥- ليلان دوايت بولدوين، الديمقراطية أمل الإنسانية الأكبر، ت. يوسف الخال، بيروت، ١٩٥٦.

٣٦- نقولا حداد، الديمقراطية مسيرها ومصيرها، بغداد، ١٩٥٤.

٣٧– عطا بكري، الديمقراطية في التكوين، الديمقراطية الإشتراكية كنتيجة حتمية لتطور الفكر الديمقراطي، بيروت، ١٩٥٢.

٣٨– كريم مسعد، الديمقراطية البريطانية، دراسة ونقد، القاهرة، سنة ؟.

٣٩– وليام ليدرر، أمة من غنم، ت. علي جمال الدين عزت، مراجعة الدكتور عبدالغني خلف الله، القاهرة، ١٩٦٢ (ئەسڵەکە ١٩٦٠).

٤٠– الفرد سوني، الرأي العام، ت. الدكتور كامل عياد، مراجعة الدكتور جميل صليبا، دمشق، ١٩٦٢.

٤١– جان ستوتزل والان جيرار، استطلاع الرأي العام، ت. عيسى عصفور، بيروت، ١٩٧٥.

٤٢– ادوارد م. بيرنز، أفكار في صراع، النظريات السياسية في العالم المعاصر، ت. عبدالكريم، أحمد.

٤٣– جان مينو، الجماعات الضاغطة، ت.بهيج شعبان، ط٢، بيروت، ١٩٨٠.

٤٤– غاستون بوتول،سوسيولوجيا السياسة، ت. نسيم نصر، ط٢، ١٩٨٠.

٤٥– جان جاك روسو، في العقد الإجتماعي، ت. ذوقان قرقوط، بغداد، ١٩٨٣.

٤٦– غوستاف لوبون، روح الجماعات، ت. عادل زعيتر، مصر، ١٩٥٠.

٤٧– مستقبل الديمقراطية ومفاهيمها، أبحاث المؤتمر الأول لعلم السياسة (٥–٦–٧ تشرين الأول ١٩٥٦)، الجزء الأول، ١٩٦٠.

٤٨– جون ديوي، الفردية قديما وحديثا، ت. خيري حماد، مراجعة مروان الجابري، ١٩٦٠ (ئەسڵەکە ١٩٢٩،١٩٣٠).

٤٩– جون ديوي، الديمقراطية والتربية، ت. الدكتور متي عقراوي وزكريا ميخائيل، ط، القاهرة ١٩٥٤، (ئەسڵەکە ١٩١٥).

٥٠– سيريل جود، الحرية في القرن العشرين، ت. طه السباعي، القاهرة، سنة؟.

٥١– هيوبرت همفري، في سبيل البشرية، ت. أحمد شناوي، القاهرة، سنة ؟، (ئەسڵەکە ١٩٦٤).

٥٢– ويليام روبسن، النظام الحكومي في بريطانيا العظمى، ت. ؟، سنة ؟.

٥٣- الدكتور عصمت سيف الدولة، الطريق الى الديمقراطية أو سيادة القانون في الوطن العربي، بيروت، ١٩٧٠.

٥٤- نيقولو مكيافلي، مطارحات مكيافلي، ت. خيري حماد، ط٢، بيروت، ١٩٧٩.

٥٥- الجنرال ج.ف.س. فوللر، إدارة الحرب من ١٧٨٩ حتى أيامنا هذه، ت. أكرم ديري، بيروت، ١٩٧١، (ئەسڵەکە ١٩٠٨).

٥٦- جراهام والاس، الطبيعة البشرية في السياسة، ت. عبدالكريم أحمد، مراجعة علي أدهم، القاهرة، سنة ؟، (ئەسڵەکە ١٩٠٨).

٥٧- الدكتور حسان شفيق العاني، الأنظمة السياسية المقارنة، الجزء الأول، جامعة بغداد، ١٩٨٧-١٩٨٨.

٥٨- جان بول سارتر، دافيد روسيه، جيرار روزنتال، محاورات في السياسة، ت. جورج طرابيشي، بيروت، ١٩٦٣.

٥٩- غي دو بوشير، تشريح جثة الإستعمار، ت. ادوار الخراط، بيروت، ١٩٦٨.

٦٠- الجنرال ديغول، منكرات الأمل، التجديد ١٩٥٨-١٩٦٢، ت. الدكتور سموحي فوق العادة، بيروت، ١٩٧١.

٦١- الفريد ليلنتال، اسرائيل ذلك الدولار الزائف، ت. عمر الديراوي أبو حجلة، بيروت، ١٩٦٥.

٦٢- الفريد ليلنتال، ثمن اسرائيل، ت. حبيب نحولي وياسر هواري، بيروت، ط٢، ١٩٥٤.

٦٣- الفريد ليلنتال، هكذا يضيع الشرق الأوسط، ت.؟، بيروت، ١٩٥٧.

٦٤- برنارد شو، البيمارستان السياسي، ت. خليل أحمد الجلو، بغداد، ١٩٤٧.

٦٥- محمد قطب، مذاهب فكرية معاصرة، سنة ؟.

٦٦- ى. بن فورات، مراكز القوى في اسرائيل، ١٩٧٣.

٦٧- ژمارەیەك گۆڤارو رۆژنامەی جۆراوجۆر.

## دووەم- بە زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی:

1- Woodrow Wilson, Congressional Government, A Study in American Politice, new york, 1956 (1885).

2- Ann Van Wynen Thomas, The Semantics of International Law, Today's Clash of Ideals, New York, 1953.

3- Neal Reimer, The Democratic Experiment: American Politics Theory, Vol. 1, New Delhi, 1972 (1967).

4- Central Office of Information (U.K), The British Parliament, London, 1953.

5- Jean Meynaud and Others, *The Role of The Executive in the Modern State*, International Social Science, Bulletin, Vol. X, No. 2, 1958.

6- Jean Boulois, *Local Government as a Basis of and Training in Democracy*, International Social Science, Bulletin, Vol. V, No. 1, 1953, pp.14-50.

7- Clinton Rossiter, *The Presidents and The Presidency*, American Heritage, vol.III, No. 3, April, 1956,p. 28ff.

8- Roy F. Nichols, *It happens every Four Years*, Amrican Heritage, Vol. VII, No. 4, June, 1956, p.20ff.

9- *Democracy*, in; Encyclopaedia Britannica, vol. 7.

10- *Electoral Systems*, in; Encyclopaedia Britannica, vol. 8.

11- *Electoral Processes*, in; Encycl. Britannica, Micropaedia, Knowledge in Depth, Vol. 6.

12- *Plurality System*, in; Encycl. Britannica, Micropaedia, Ready Reference and Index, Vol. VIII.

13- Charles Blitzer, *Democracy*, in; Encyclopedia International.

14- Gaston Defferre, *De Gaulle and After*. Foreign Affairs, Vol. 44, No. 3, April, 1966, pp. 434-445.

15- Pierre Courtade, *The Referendum in France: Results and Prospects*, in; International Affairs, 11, Nov.1958, Moscow, pp. 31-37.

16- Public Adminstration Review, vol. 16, no. 1, Winter 1958.

17- The Economist, 4-10, 7/1987.

18- Time, 11/3/1996.

19- Encyclopaedia of the Social Sciences, New York, 1931, 13th Printing 1959.

a- Francis W. Coker and Carlton C. Rodee, *Representation* Vol. 13.

b- John Dickinson, *Checks and Balances*, Vol. 13.

c- Cart Joachim, Friedrich, *Seperation of Powers*, Vol. 13.

d- Harold F. Gosnell, *Proportional Representation*, Vol. 12.

e- Joseph P. Harris, *Elections*, Vol. 5.

f- Harold J. Laski, *Democracy*, Vol. 5.

g- Harold J. Laski, *Liberty*, Vol. 9.

h- William B. Munro, *Short Ballot Movement*, Vol. 14.

i- E. Pendleton Herring, *Lobbying*, Vol. 9.

j- William A. Robson, *Local Government*, Vol. 9.

k- W. J. Shepard, *Legislative Assemblies*, History and Theory, Vol. 9.

l- W. J. Shepard, *Suffrage*, Vol. 14.

20- Denis Jeambar, *Les vrais Pouvoirs du Président*, Le Point, No. 1179, 22/4/1995.

21- Denis Jeambar, *La France, des France... et un Président*, Le point, No. 1180, 29/4/1995.

22- Guy Corcassonne, *Ve = IIIe + de Gaulle*, Le Point, 1179, 22/4/1995.

23- Eric Dupin, *Electeurs = Imbéciles+Girouettes,* L'Evenement du Jeudi, 2-8/5/1996.

24- *Le Nouveaux Empereurs de la Télé.* Le Nouvel Observateur, 9-15/5/1995.

٢٥- چەند باسێكی تری گۆڤارەكانی سەرەوە.

# ناوەرۆك